# ڕوونکردنەوەی

# أصول الثلاثة

نوسین :

پێشەوا محمد ـی کوڕی عبدالوهاب رحمەالله

ڕوونکردنەوە :

عبدالله تەوحیدی

# ڕوونکردنەوەی

# أصول الثلاثة

نوسین :

پێشەوا محمد ـی کوڕی عبدالوهاب رحمه‌الله

ڕوونکردنەوە :

عبدالله تەوحیدی



## ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب : ڕوونکردنەوەی أصول الثلاثة ( سێ بنچینەکە )

نوسەری متن : الشیخ محمد بن عبدالوهاب (رحمەالله)

ڕوونکردنەوەی متن : عبدالله تەوحیدی

ژمارەی لاپەڕە : ٢٤٩

بەروار : ٩ ـی جماد الأول ـی ١٤٤٣

**بسم الله الرحمن الرحيم الحمد لله رب العالمين ، والصلاة والسلام على أشرف المرسلين سيدنا محمد وعلى آله وصحبه ومن تبعهم بإحسان إلى يوم الدين. أمابعد...**

سەرەتا سوپاس و سایشی بێ كۆتا و بەردەوام بۆ الله تعالى بۆ منەت كردنی بەسەر بەندەی لاوازی خۆی كە یارمەتی دام و بۆی ئاسان كردم وە ڕێی نیشان دام بۆ هاتنە خزمەت ئەم كتێبە بەسودەی شیخ محمد بن عبدالوهاب رحمه الله كە باس لەچەند شتێكی گرینگ و پێویست دەكات لەسەر موسڵمانان بە گشتی لە ئافرەتان و پیاوان و منداڵ و بەتەمەن ، وە شتە گرینگانەش بریتین لە ناسینی الله تعالى و پێغەمبەرەكەی ﷺ و دینەكەی ، كە ئەمانەش لەگرینگ ترینی ئەو شتانەن كە پێویستە كەسی موسڵمان بیزانێت ، وە ئەمە تایبەت نیە بە منداڵ و تەنها منداڵانی لێ فێر بكرێت بەڵكو لەسەر هەموو كەسێكە كەفێری ببێت و بیزانێت ، چونكە هەموو كەسێك لە ناو قەبرەكەی. پرسیاری لێدەكرێت لەبارەی ئەم سێ شتە گرینگەوە كە مەشهورە لە نێوان موسڵمانان كە كاتێك كەسێك دەمرێت مەلائیكەتەكان دێنە لای و پرسیاری لێدەكەن و دەڵێن پەروردگارت كێیە ؟ دین چیە ؟ پێغەمبەرت كێیە ؟ جا گەر نەیزانی بێت لە دونیا ئەوە لەوێش نازانێت ، وە گەر زانیبێنی لە دونیا و شوێنی كەوتبێت و ملكەچی فەرمانی الله تعالى و پێغەمبەرەكەی بوبێت ﷺ وە چەسپاو بێت لەسەری ئەوە وڵامی دەداتەوە وە ئەمەش مانای وتەكەی الله تعالى یە كەفەرموویەتی ﴿ يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ ۖ وَيُضِلُّ اللَّهُ الظَّالِمِينَ ۚ وَيَفْعَلُ اللَّهُ مَا يَشَاءُ ﴾[1]واتە : ئەوانەی كە بڕوایان هێناوە الله تعالى دامەزراویان دەكات بە وتەی بەڕێ و جێ (كە شایەتمانە) لە

[1] [ إبراهيم: ٢٧ ]

ژیانی دنیادا و لەڕۆژی دوایشدا وە الله تعالى ستەم کارانیش گومڕا دەکات وە الله تعالى هەرچی بیەوێ دەیکات.› جا ئەوانەی لەسەر ئیمان و تەوحید نەژیابێت و نەچەسپابێت ئەوە لەقیامەت هیچی بەدەستەوە نیە ، وە کەسیش نابێتە خاوەنی ئیمان و تەوحید بەبێ ناسینی ئەمانە کە الله تعالى پێوستی کردوە لەسەرمان کە فێری ببین و کاری پێبکەین تا دەگەڕینەوە لای خۆی . دەواکارین لە الله تعالى هیدایەتمان بدات بۆ باشترینی باشەکان وە ئەو بەتوانایە بەسەر ئەوەدا وە بیسەری نزای نزاکارانە ، داواکارین لە الله تعالى کەئەم نامیلەکەیە بکاتە مایەیی هیدایەت و خێر و سودێکی زۆر بۆ ئەوەی کە دەیخوێنێت ، وە بیکاتە میزانی چاکەی ئەوەی نوسیویەتی و قبوڵی بکات لێی لەوانەشی بەشدارن لێی ، آمین

عبدالله تەوحیدی

مـتـن

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ[1]..........................................................

[1]بەناوی الله ی بەخشندە و میهرەبان ،

## ❁ ڕوونکردنەوە ❁

شێخ سەرەتای کتابەکەی بە ناوە پیرۆزەکانی اللّٰه تعالی دەست پێکردوە ، کە ئەمەش ئیقتیدا کردنە بە کتابی اللّٰه تعالی و نوسراو نامەی پێغەمبەران ، وەک لە قورئانی پیرۆزدا هاوتوە کە هەموو سورەتێک بە بسم اللّٰه ... )دەستی پێکردوە تەنها تەوبە نەبێت، وە هەر بەو شێوەش هاتوە لە نامەی پێغەمبەران علیهم السلام ، وەک لە نامەکەی پێغەمبەر سلیمان علیه السلام کە تێدا بە بسم اللّٰه دەستی پێکردبوو ، اللّٰه تعالی فەرموویەتی ﴿ قالَت يا أَيُّهَا المَلَأُ إِنّي أُلقِيَ إِلَيَّ كِتابٌ كَريمٌ - إِنَّهُ مِن سُلَيمانَ وَإِنَّهُ بِسمِ اللَّهِ الرَّحمنِ الرَّحيمِ ﴾[2] واتە : بەڵقیس وتی ئەی پیاو ماقوڵ و سەرۆکەکان بەڕاستی من نامەیەکی گرنگم بۆ هاوێژراوە کە بێگومان لە سولەیمانەوە هاتووە. - بەڕاستی ئەو (نامە دەست پێ دەکات) : بەناوی اللّٰه ی بەخشندەی میهرەبان.›وە هەروها پێغەمبەری خۆمان ﷺ کاتێک نامەکەی بۆ مەلی ڕوم نارد تێدای نوسرابوو ﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ، مِنْ مُحَمَّدٍ عَبْدِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ إِلَى هِرَقْلَ عَظِيمِ الرُّومِ ﴾[3] بەناوی اللّٰه ی بەخشندەوە و میهرەبان ، لە محمد نێدراوی اللّٰه تعالی ەوە بۆ هێرقل گەورەی ڕۆم.›

[2] [النمل: ٢٩ – ٣٠ ]

[3] [ رواه البخاري برقم : ٩ ، ورواه مسلم برقم : ١٧٧٣ ]

مـتـن

اعْلَمْ رَحِمَكَ اللهُ أَنَّهُ يَجِبُ عَلَيْنَا تَعَلُّمُ أَرْبَع مَسَائِلَ:[2]
المسألة الأُولَى: الْعِلْمُ: وَهُوَ مَعْرِفَةُ اللهِ، وَمَعْرِفَةُ نَبِيِّهِ ـ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ـ، وَمَعْرِفَةُ دِينِ الإِسْلامِ بالأَدِلَّةِ.[3]

[٢]بزانە  اللّٰە ڕوحمت پێ بکات ، بەدڵنیاوە واجبە(پێویستە) لەسەرمان فێری چوار مەسەلە(باس – مەوزوع)ببین ،

﴿ ڕونکردنەوە ﴾

شێخ سەرەتا دوعای خێر بۆ قوتابی فێرخواز دەکات تا دڵی خۆشبکات و  اللّٰە تعالی ڕوحمی پێبکات ،وە تا دڵی فێر خواز ڕاکێشێت و هەستی و بەزەیی خۆی بۆ دەربڕێت لەکاتی فێرکردنی ،

وە دەڵێت بزانە ، ئەوەش ئەوە دەر دەخات کە ئەو شتەی شێخ دەیەوێت باسی بکات شتێکی گرنگ و موهیمە بۆیە فێرخواز ئاگادار دەکاتەوە لێی تا ئاگای لەوە بێت کە فێری دەبێت ،

پاشان شێخ دەڵێت واجبە لەسەرمان کە فێری چوار مەسەلە ببین ،

واجب بوون ئەوەیە گەر کەسەکە فێری نەبێت  ئەوا سزادەدرێت ، وە گەر فێری ببێت ئەوا پاداشت وەر دەگرێت لەسەر فێر بوونی ،

بەڵام سونەت گەر ئەنجامی بدەی ئەوا خێرت بۆ دەنوسرێت وەگەر ئەنجامی نەدەی سزا نادرێیت ،

جا ئەم چوار مەسەلەیە واجبە کە فێری ببین وەک شێخ فەرموویەتی واجبە ،

مـتـن

المسألة الثَّانِيَةُ: العَمَلُ بِهِ[4]
المسألة الثَّالِثَةُ: الدَّعْوَةُ إِلَيْهِ[5]
المسألة الرَّابِعَةُ: الـصَّبْرُ علَى الأَذَى فِيهِ.[6] وَالدَّلِيـلُ قَوْلُهُ تَعَالَى: بسم الله الرحمـن الرحيم: وَالْـعَصْرِ - إِنَّ الإِنسَانَ لَفِي خُـسْرٍ - إِلاَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ[سورة العصر كاملة][7]

[٣]یەکەم : بریتیە لە زانست ، وە ئەویش بریتیە لە ناسینی الله تعالى ، وە ناسینی پێغەمبەر ﷺ ، وە ناسینی دینی ئیسلام ، بەبەڵگەی شەرعی (دینی)

۞ ڕونکردنەوە ۞

زانست دژی (جەهل)نەزانینە ،

جا هەر شتێک کە مرۆڤ لە پێشودا نەیزانیوە و نەزانن بوە پێی کاتێک دەیزانێ ئەوە بریتیە لە زانست کە نەزانینەکەی لەسەر لادەبات و نای هێڵێت وە ئەویش بە ڕێگای هەستەوەرەکان مرۆڤ هەستی پێدەکات و دەرکی پێدەکات ،

جا ناسینی الله تعالى بریتیە لەوەی کە الله تعالى بناسیت بە کارەکان و سیفاتەکان و هەواڵەکان و جێگای بزانیت و داواکاریەکانی بزانیت ،

وە ناسینی پێغەمبەر بریتیە لەوەی کە بزانیت کێ یە و چ کارە بوە و ئێمە چۆن هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکەین ،

وە ناسینی دینی ئیسلام بریتیە لە زانینی مانای و داواکاریەکان و پێداویستیەکانی کە چێت لێداوا دەکات و چیت لێ قەدەغە دەکات ، وە چۆن ئیسلام وەر دەگریت و چۆن لەدەستی دەدەیت ، جا هەموو ئەمانە لە دواتر باسی دەکەین و ڕونی دەکەیەنەوە بەبەڵگەی شەرعی إِنْ شَاءَ اللهُ ،

[٤]دووەم : بریتیە لە کارکرن بەو زانستە ،

### ❁ ڕوونکردنەوە ❁

وە کارکردن بەو زانستە ئەوەیە ئەنجامی بدەیت ، وەک ئەوەی کە تۆ دەزانیت الله تعالى پەرستراوی حەقە و دەبێت پەرستنی بۆ بکەی ، ئەوە دەبێت تۆ بەکردار و دڵ و زمان عیبادەتی الله تعالى بکەیت ، نەک هەر تەنها بە زانینی ئەوەی الله دەبێت بپەرسترێت واز بێنیت و عیبادەتی بۆ ئەنجام نەدەی ، بەڵکو دەبێت کار بەو زانستە بکەیت و بیکەیت بە کردار ،

جا عیبادەتی دڵ بریتیە لە خۆشویستن و ترسان لێی و ئومێد پێبون و پشت پێ بەستن و غەیری ئەویش ،

وە عیبادەتی زمان بریتیە لە سوپاس کردنی و زکر و یاد کردنی وە بە پاک ڕاگرتنی و داوا لێکردنی ،و قورئان خوێندن و فەرمان کردن بەچاکە و ڕێگری کردن لە خراپە ،

وە عیبادەت کردنی لاشەیی بریتیە لە نوێژ کردن بۆی و زەکات دان و بەڕۆژو بوون و حەج کردن و جیهاد کردن لە پێناوی ،

کارکردن بەزانست بوون بە پێغەمبەر ﷺ بریتیە لە ئیمان هێنان پێی و شوێن کەوتنی و ئەنجامدانی فەرمانەکانی و سونەتەکانی ، وە خۆ دور گرتن لەو شتانەی کە قەدەغەی کردوە و ڕێگری کردوە لێی ،

وە کارکردن بە زانست بوون بە ئیسلام بریتیە لە قبوڵ کردنی و کار پێکردنی و مانەوە لەسەری و واز لێ نەهێنانی و ملکەچ بوون بۆ داوایەکانی و دور کەوتنەوە لە قەدەغەکراوەکانی ،

[٥] سێیەم : بریتیە لە بانگەوازکردن و بانگەشەکردنی خەڵکی بۆ ئەم سێ خاڵە کە ( ناسینی الله تعالى و دینەکەی و پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ )

## ۞ ڕوونکردنەوە ۞

بێگومان موسڵمان لەسەریەتی کە بانگەشەی خەڵکی بکات بۆ ناسینی ئەم سێ خاڵە ،

جا الله تعالی ڕووحی بەو کەسە کردوە کەم ئەم سێخاڵەی پێ بەخشیەوە ، بۆیە دەبێت ئەویش بانگەشەی خەڵکی بکات بۆ لای ئەم سێ خاڵە ،

الله تعالی فەرموویەتی ﴿ادعُ إلى سَبيلِ رَبِّكَ بِالحِكمَةِ وَالمَوعِظَةِ الحَسَنَةِ وَجادِلهُم بِالَّتي هِيَ أَحسَنُ﴾[4]واتە : خەڵکی بانگ بکە بۆ ڕێگەی پەروەردگارت بە لێزانی و دانایی و ئامۆژگاری چاك و شیرین وە لە گەڵیان بدوێ (موجادەلە بکە بدوێ بەچاکترین شێوە)

جا بۆیە پێویستە لەسەر موسڵمان کە بانگەشەی خەڵکی بکات بۆ ڕێگای الله تعالی بەجوانترین و چاکترین شێوە ، وە بەبەڵگەی ڕاست و دروست نەک خوڕافیات و قسەی بێمانا و قسەی ناشرین و نابەجێ ،

بۆیە کاتێک کە الله تعالی ئەو نیعماتەی بە تۆ داوە پێویستە تۆش بانگەشەی خەڵکی بۆ لا بکەیت ،

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ﴿لَأَنْ يُهْدَى بِكَ رَجُلٌ وَاحِدٌ خَيْرٌ لَكَ مِنْ حُمْرِ النَّعَمِ﴾[5]واتە : گەر الله تعالی بە هۆی تۆوە هیدایەتی پیاوێک بدات ئەوە بۆت باشترە لە حوشترێکی سور (حوشتری سور لەو سەردەم بەباشتریت شت و گران بەهاترین شت دادەنرا و نمونەی پێدەهێندرایەوە ، بۆیە پێغەمبەر ﷺ ئەوە بە نمونە دەهێنتەوە )

[4] النحل:١٢٥

[5] رواه البخاري ومسلم

جا ئەمە گەر تەنها یەک کەس بێت ئەی گەر سەدان و هەزاران کەس بێت بێگومان پاداشتێکی زۆر زۆری هەیە ،

وە بانگەشەکردنی خەڵکی بۆ لای الله تعالى کاری هەموو پێغەمبەرانە (علیهم السلام) ، بۆیە دەبێت موسڵمان بانگەشەی خەڵکی بکات بۆ لای الله تعالى تاوەکو خەڵکی موسڵمان بێت و کافر نەمێنێت لەسەر زەوی ،

[٦]چوارەم : بریتیە لە ئارامگرتن لەسەر ئەو ناڕەحەتیانەی لەو ڕێگایە دێتە پێشت،

❁ ڕوونکردنەوە ❁

کاتێک کەسێک بانگەشە بۆ دینی الله تعالى دەکات ئەوە بێگومان کەسانێک دژایەتی دەکەن و ئازاری دەدەن ،وە یان لێ قبوڵ ناکەن ،وە جاری وایە دەشی کوژن لەسەر ئەو بانگەوازیەی دەیکات ، چونکە کاتێک کە تۆ بانگەوازی خەڵکی دەکەیت بۆچی بانگەوزای دەکەی ،؟ بێگومان بۆ ئەوەی وازبێنن لەوەی خۆیان لەسەرین و بێنە سەر ڕێگاو ڕێبازی پێغەمبەران ، جا خەڵکیش بەهۆی ئەوەی بانگەوازیان دەکەیت و دژی کارەکانیان دەوەستیتەوە ئەوانیش قبوڵی ناکەن و ئازارت دەدەن و دەت ترسێنن و هەڕەشەت لێدەکەن ،

جا بزانە ئەمە تەنها بەرامبەر بە تۆ نیە ، بەڵکوو بەرامبەر بەهەموو ئەو کەسانەیە کە بانگەشەی خەڵکی دەکەن بۆ ڕێگای حەق و ڕاستی ، وە وا بەسەر پێغەمبەرانیش هاتوە و ئازاری ئەوانیشان دراوە ،

الله تعالى فەرموویەتی ﴿إِنَّ الَّذينَ يَكفُرونَ بِآياتِ اللَّهِ وَيَقتُلونَ النَّبِيّينَ بِغَيرِ حَقٍّ وَيَقتُلونَ الَّذينَ يَأمُرونَ بِالقِسطِ مِنَ النّاسِ فَبَشِّرهُم بِعَذابٍ أَليمٍ﴾[6]واتە :

---

[6] آل عمران:٢١

بەڕاستی ئەوانەی باوەڕ ناهێنن بەئایەت و فەرمانەکانی الله و پێغەمبەرانیش بەبێ هیچ حەقێک دەکوژن و ئەو خەڵکانەش دەکوژن کە فەرمان بە دادپەروەری دەدەن، کەواتە مژدەی سزایەکی پڕ ئێشیان پێ بدە!!»

وەفەرموویەتی ﴿كُلَّما جاءَهُم رَسولٌ بِما لا تَهوى أَنفُسُهُم فَريقًا كَذَّبوا وَفَريقًا يَقتُلونَ﴾[7] واتە : هەرکاتێک یەکێک لەو پێغەمبەرانەیان بەدڵ نەبوو بێت (بەهۆی لاساریی و دەروون ئاڵۆزیی خۆیانەوە یاخود بەئارەزووی ئەوانی نەکردبێت) دەستەیەکیان (بەرنامەی پێغەمبەرانیان) بەدرۆ زانیووە، دەستەیەکی تریشیان پەلاماریان داون و (شەهیدیان کردوون).»

وفەرموویەتی ﴿قَالَ رَبُّ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَمَا بَيْنَهُمَا إِنْ كُنْتُمْ تَعْقِلُونَ – قَالَ لَئِنِ اتَّخَذْتَ إِلَٰهًا غَيْرِي لَأَجْعَلَنَّكَ مِنَ الْمَسْجُونِينَ﴾[8]واتە : موسا وتی: پەروەردگاری خۆرهەڵات و خۆرئاواو هەموو ئەو شتانەشە کەوا لە نێوانیاندایە ئەگەر عەقڵ و بیروهۆشتان بخەنە کار!! – فیرعەون سوێندی خوارد و وتی: ئەگەر جگە لە من کەسێکی تر بکەیتە خوای خۆت و فەرمانبەرداری بیت، دەتخەمە ڕیزی بەندکراوەکانەوە و زیندانیت دەکەم...»

وە فەرمویەتی﴿وَإِذ يَمكُرُ بِكَ الَّذينَ كَفَروا لِيُثبِتوكَ أَو يَقتُلوكَ أَو يُخرِجوكَ وَيَمكُرونَ وَيَمكُرُ اللَّهُ وَاللَّهُ خَيرُ الماكِرينَ﴾[9]واتە : وە ئەی (محمد ﷺ ) (بیر بکەرەوە) کاتێك ئەوانەی بێ باوەڕ بوون پیلانیان لە دژت دەگێڕا تا بەند و کۆتت بکەن یان بتکوژن یان(لە مەککە) دەرت بکەن وە ئەوانە (بەردەوام) فروفێڵ

[7] المائدە:٧٠
[8] الشعراء:٢٩
[9] الأنفال:٣٠

دەکەن وە اللە یش لە بەرامبەر ئەواندا پیلان دەگێڕێت وە اللە چاکترینی پیلان گێڕانە.›

جابۆیە موسڵما دەبێت سەبری هەبێت لەسەر بانگەوازی کردنی بۆ دینی اللە تعالى ، ئەگەر چی پێیان وت شێت و ساحیر و هەرچی قسەی خراپیان دایە پاڵ ئەوە دەبێت سەبری هەبێت ، تا اللە تعالى توانا و هێزی پێدەبەخشێت و جیهادی و کوژتاری کافران و موشریکان دەکات ، وە بزانە بە پێغەمبەرانیش وتراوە شێت و ساحر ،

وەک اللە تعالى فەرموویەتی ﴿قالوا إن هذانِ لَساحِرانِ يُريدانِ أَن يُخرِجاكُم مِن أَرضِكُم بِسِحرِهِما وَيَذهَبا بِطَريقَتِكُمُ المُثلى﴾[10]واتە : (هەندێک لە دارو دەستەی فیرعەون) وتیان بە (جادووگەران) بەڕاستی ئەم دوانە،(موسى و هارون) دوو جادووگەرن و دەیانەوێت، لە وڵات و نیشتمانی خۆتان دەرتانبپەڕێنن بەهۆی جادووەکەیانەوە و ئەم ڕێگەو بەرنامە گرنگ و بەرزەی ئێوە لەناو بەرن...›

وەفەرموویەتی﴿وَيَقولون أَئِنّا لَتارِكو آلِهَتِنا لِشاعِرٍ مَجنونٍ﴾[11]واتە : دەیانوت: ئێمە چۆن واز لە خواکانمان دەهێنین بۆ شاعیرێکی شێت؟!›

موشریکان لە ناو خۆیان دەیان وت ئێمە چۆن واز لە خواکانمان(بتەکان) بێنین بۆ ساحیرێکی شێت کە مەبەستیان پێغەمبەر محمد بوو ﷺ ،

جا بۆیە بزانە موشریکان و کافران قەد ناوەستن لە دژایەتی کردنت لەسەر بانگەوازی ، تۆش نابێت قەد واز بێنیت لە بانگەوازی کردنی خەڵکی بۆ لای اللە تعالى و دینەکەی،

[10] طه:٦٣

[11] الصافات:٣٦

[٧]بەڵگەش وتەی الله تعالی یە کە فەرموویەتی : سوێند بەکات – بێگومان هەموو خەڵکی لە زیاندایە.- تەنها ئەوانەی کە بڕوایان هێنابێ و کردەوە چاکەکانیان کردبێ وە ئامۆژگاری یەکتریان کردبێ بە ئاینی ڕاست وە ئامۆژگاری یەکتریان کردبێ بە ئارام گرتن.›

۞ ڕوونکردنەوە ۞

شیخ ئەم سورەتەی کردۆتە بەڵگە بۆ چوار مەسلەکەی باسمان کرد لە پێشو دا ، جا تێیدا الله تعالی سوێند بە کات دەخوات ، ئەوەش بەڵگەیە کە کات گرنگە بۆ مرۆڤ چونکە کات دیاری کراوە بۆ ژیانی مرۆڤ جا هەر مرۆڤێک کاتی تەواو بێت و ئیمان دار بێت و کاری چاکەی تێدا کردبێت ئەوە سەر فراز بوە ، وە گەر کەسێک کاتی تەواو بوو بێت ئیماندار نەبوو بێت و کاری چاکەی نەکردبێت ئەوە زەرەر مەند و زیان لێکەوتو بوە ، جا الله تعالی کە سوێند بە کات دەخوات ئەوە کەس ناتوانێت بڵێت بۆ سوێند بەکات دەخوات ، بەڵام ئێمە بۆمان نیە سوێند بە هیچ شتێک بخۆین تەنها بە الله تعالی و سیفەتی الله تعالی نەبێت کە قورئانە ، چونکە ئێمە ڕێگریمان لێکراوە کە سوێند بە غەیری الله تعالی بخۆین وەک پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ﴿إِنَّ اللَّهَ يَنْهَاكُمْ أَنْ تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ مَنْ كَانَ حَالِفًا فَلْيَحْلِفْ بِاللَّهِ أَوْ لِيَصْمُتْ﴾[12] واتە : بێگومان الله تعالی ڕێگریتان لێدەکات کە سوێند بخۆن بە باوک و باپیرانتان ، جا گەر کەسێک لە ئێوە سوێندی خوارد ئەوا با سوێند بە الله تعالی بخوات یان با بێدەنگ بێت (و سوێند نەخوات) ›

[12] رواه البخاري

مـتـن

قَالَ الشَّافِعِيُّ ـ رَحِمَهُ اللهُ تَعَالَى - : لَوْ مَا أَنْزَلَ اللهُ حُجَّةً عَلَى خَلْقِهِ إِلا هَذِهِ السُّورَةَ لَكَفَتْهُمْ[8]

وَقَالَ الْبُخَارِيُّ ـ رَحِمَهُ اللهُ تَعَالَى ـ : بَابُ: الْعِلْمُ قَبْلَ الْقَوْلِ وَالْعَمَلِ؛ وَالدَّلِيلُ قَوْلُهُ تَعَالَى: (فَاعْلَمْ أَنَّهُ لاَ اله إِلاَ اللَّهُ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنبِكَ)[محمد: 19]، فَبَدَأَ بِالْعِلْمِ (قَبْلَ القَوْلِ وَالعَمَلِ)[9]اعْلَمْ رَحِمَكَ اللهُ أَنَّه يَجِبُ عَلَى

جا الله تعالى سوێند بەکات دەخوات پاشان دەفەرموێت بێگومان هەموو مرۆڤەکان لە زیان و تیاچون دان ، پاشان الله تعالى کۆمەڵێک جیا دەکاتەوە ، ئەوانیش بریتین لە کەسانێک کە ئیمانیان بە الله تعالى هێناوە و کارو کردوەی چاکیان ئەنجام داوە و ئامۆژگاری و وەسیەتی یەکتریان کردوە بە دینی الله تعالى و ئامۆژگاری یەکترتیان کردوە بە سەبر گرتن و ئارامگرتن ، جا بەڵگەش بۆ چوار مەسەلەکە بەم شێوەیەیە ﴿إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئیمان هێنانەکە بریتیە لە زانست بوون و ناسینی سێ خاڵەکە ، جا چۆن ئیمان بەشتێک دەهێندرێت کە نازاندرێت چیە ؟؟ بێگومان دەبێت شارەزایان هەبێت و ئاگاداری بێت ئەو کات دەتوانێت ئیمانی پێ بێنێت ، وە﴿وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ کار پێکردنەکەش برتییە لە کاری چاکەکردن ، ﴿وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ﴾ ئەمەش بریتیە لە بانگەشەکردنی خەڵکی بۆ حەق و ئامۆژگاری کردنیان بەوەی دەست بگرن بەدینەوە و الله تعالى بناسن و شوێن پێغەمبەر ﷺ بکەون ، ﴿وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ﴾ وە سەبرِ بگرن لەسەر ئەو نارەحەتیانەی لەو ڕێگایە دێتە پێشیان ، جا واجبە لەسەرمان کە ئەم چوار مەسلەیە جێ بەجێ بکەین و کاری پێ بکەین و بانگەشەی خەڵکی بۆ بکەین و سەبرِ بگرین لەسەر ئەوەی بەهۆی ئەم ئیمان هێنان و کار و کردەوەی چاکە بانگەوازی کردنی خەڵکی دێتە ڕێگامان ، جا ئەگەر ئێمە وامان کرد ئەوە لەو کەسانە دەبین کە زەرە مەند نین ، بەڵکو سەرکەوتو و وسەر فرازین ،

[٨]ئیمامی شافعی (رحمەاللە)فەرموویەتی : گەر اللە تعالی هیچ بەڵگە و نیشانەیکی دا نەبەزاندبایە بۆ سەر دروست کراوەکانی تەنها ئەم سورەتەی دابەزاندبوایە ، ئەوە تەنها ئەو سورەتەیان بەس بوو ،

۞ ڕوونکردنەوە ۞

ئیمام شافعی یەکێکە لە کەڵە پیاوانی سەلەفی ئومەت کە یەکێکە لە گەورە ترین شەرع زانەکان کە خاوەنی مذهبی تایبەتە بەناوی مذهب الشافعی ناوی خۆی محمدی کوڕی ادریس ە (رحمەاللە )،

ئیمام باس لە سورەتی العصر دەکات ، مەبەستی لەوەیە کە گەر اللە تعالی لە جیات ئەوەی هەموو قورئان دابەزانێت تەنها ئەو سورەتەی دەبەزاندبا ، ئەوە بەس بوو تا بیانوو بڕیان بکات ،

مەبەستی ئیمام لە گەورەیی و پڕ مانای ئەم وسورەتەیە نەک ئەوەی کە اللە تعالی قورئانی بە زیاد دابەزاندبێت پەنابە اللە ،

ئیمام ڕاستی وتوە چونکە ئەم سورەتە باسی چەندین شتی گرینگ دەکات ، لەوانە ژیان و کات کە بۆ مرۆڤ زۆر پێویستە وە پاشان ئاگارداری خەڵکی دەدات لەوەی خۆیان لە تیاچون بپارێزن ، وە پاشان ڕێگای ڕزگار بوون سەر کەوتن و سەر فرازی تێدایە بۆ مرۆڤێک کە بیەوێت سەر کەوتو و سەر فرازبێت ، وە ئەوانەش ئاوانەن کە لە پێشوو باسمان کردن کە چوار مەسەلەکە بوو ،

[٩]ئیمامی بخاری (رحمە اللە) فەرموویەتی : بابی زانست و فێربون ، پێش وتە و کردەوەیە ، بەڵگەش وتەی اللە تعالی یە کە فەرموویەتی : ئەی ئینسان !! دەی کەواتا چاک بزانەو دڵنیابە جگەلە اللە، هیچ خوایەکی ترنیە، داوای

لێخۆشبوونی گوناه بۆ خۆت بکە ،، جا الله تعالى زانستی پێش خستوە بەسەر وتە و کردەوە ،

۞ **ڕوونکردنەوە** ۞

ئیمانی البخاري یەکێکە لە گەورە زانایانی فەرموودە ، کە خاوەنی کتاب صحیح البخاري یە کە هەموو ئومەت کۆدەنگە کە ڕاسترین کتێبە لە دوای قورئانی پیرۆز ، ناوی خۆی محمد کوڕی اسماعیل ە (رحمەالله) ،

جا فەرمویەتی مەسلەی زانست لە پێش قسە و کردارە ، واتا مرۆڤ پێش ئەوەی قسە لە شتێک بکات یان کارێک بکات دەبێت لە پێشدا زانستی پێی هەبێت و بزانێت چی دەکات ، جا بەڵگەشی ئەم ئایەتەیە کە الله تعالى فەرموویەتی ﴿فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنْبِكَ﴾[13]واتە : ئەی ئینسان !! دەی کەواتا چاک بزانەو دڵنیابە جگەلە الله، هیچ خوایەکی ترنیە، داوای لێخۆشبوونی گوناه بۆ خۆت بکە ،،

جا لە پاشان دەفەرموێت ، الله تعالى زانینی پێش خستوە بەسەر وتە و کردار ، کە ئەویش بەڵگەیە دەبێت سەرەتا شارەزایت هەبێت لە شتێک دوای ئەوە قسەی لەقسەر بکەیت ، یان ئەنجامی بدەی جا ئەویش بەم شێوە کردۆتیە بەڵگە کە ﴿فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ﴾ سەرەتا بەزانە هیچ پەرستراوێک شایەنی پەرستن نیە بەحەق تەنها الله تعالى نەبێت ، انجا کە ئەوەت زانی پاشان ﴿وَاسْتَغْفِرْ لِذَنْبِكَ﴾ داوای لێخۆش بوون بکە بۆ کردەوەکانت ، جا زانینەکە بریتیە لە زانست ، وە داوای لێخۆش بونەکەش بریتیە لە کردەوە،

[13] محمد:١٩

مــتــن

كُلِّ مُسْلِمٍ وَمُسْلِمَةٍ، تَعَلُّمُ هَذِهِ المَسَائِل الثَّلاثِ ، والْعَمَلُ بِهِنَّ:[10] الأُولَى:أَنَّ اللهَ خَـلَقَنَـا، وَرَزَقَـنَا، وَلَمْ يَتْرُكْنَا هَـمَلًا، بَلْ أَرْسَـلَ إِلَيْنَا رَسُولًا، فَـمَنْ أَطَاعَهُ دَخَـلَ الـجَنَّةَ، وَمَنْ عَـصَاهُ دَخَـلَ النَّارَ، وَالدَّلِيلُ قَوْلُهُ تَعَالَى: ( إِنَّا أَرْسَـلْنَا إِلَـيْكُمْ رَسُولًا شَاهِدًا عَلَيْـكُمْ كَمَا أَرْسَـلْنَا إِلَـى فِرْعَوْنَ رَسُولًا - فَعَصَى فِرْعَوْنُ الرَّسُولَ فَأَخَذْنَاهُ أَخْذًا وَبِيلًا )[المزمل: 15، 16][11]...........

[١٠]بزانە الله ڕووحمت پێ بکات ، بەڵنیایەوە واجبە(پێویستە)لەسەر هەموو موسڵمانێکی پیاو و ئافرەت ، فێری ئەم سێ مەسەلەیە ببێت ، وە کاریان پێبکات،

## ۞ ڕوونکردنەوە ۞

وەک لە پێشوو باسمان کە شێخ باسی لە واجب بوون کردنی چوار مەسەلە کرد ، وە ئەم جارەیان باسی سێ مەسەلەی تر دەکات ، جا ئەم سێ مەلەسەیە پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێک لە پیاوان و ئافرەتان کە بیزانن ،نابێت هیچ یەکێک لە موسڵمانان خۆی لێ بێ ئاگا بکات ، نە پیاوان و نە ئافرەتان جا گەر منداڵ بێت یان گەورە بێت یان پیر بێت ، یان بازرگان بوو یان مامۆستا بوو یان هەر شتێکی بوو مادام تەکلیفی لەسەرە و داوای لێکراوە ئەوە دەبێت فێری ببێت ،

[١١]یەکەم : بەدڵنیایەوە الله تعالی ئێمەی دروست کردوە وە زرق و ڕۆزی داوین ، وە وازی لێنەهێناوین بەڵکو پێغەمبەرێکی بۆ ناردوین ، کە هەر کەسێک گوێڕایەڵی بکات دەچێتە بەهەشتەوە وە هەر کەسێک سەر پێچی بکات دەچێتە دۆزخەوە ،بەڵگەس الله تعالی فەرموویەتی : خۆ بەڕاستی ئێمە پێغەمبەرێکمان بۆ ڕەوانەکردوون کە بۆتە شایەت بەسەرتانەوە هەروەکو چۆن بۆ لای فیر عەونیش پێغەمبەرێکمان ڕەوانە کرد.- جا فیرعەون یاخی بوو

لەو پێغەمبەرە، ئێمەش بەتوندی پێچامانەوەو بەلایەکی گەورەمان بەسەر هێنا. ›

## ۞ ڕوونکردنەوە ۞

لێرە شێخ باسی دوو شت دەکات کە ئەویش دروست کردن و ڕزق دانی ئێمەیە لە لایان الله تعالی ـوە ،وە ئەوەش لە توحید الربوبية دایە ،

الله تعالی فەرموویەتی ﴿يا أَيُّهَا النّاسُ اعبُدوا رَبَّكُمُ الَّذي خَلَقَكُم وَالَّذينَ مِن قَبلِكُم لَعَلَّكُم تَتَّقونَ﴾[14]واتە : ئەی خەڵکینە پەروەردگاری خۆتان بپەرستن، ئەو زاتەی کە ئێوە و پێشینانی ئێوەشی دروست کردوە ، بۆ ئەوەی ڕێبازی الله ناسی و تەقوا و پارێزکاری بگرنە بەر.›

وەفەرموویەتی : ﴿يا أَيُّهَا الَّذينَ آمَنوا كُلوا مِن طَيِّباتِ ما رَزَقناكُم وَاشكُروا لِلَّهِ إِن كُنتُم إِيّاهُ تَعبُدونَ﴾[15]واتە :ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، بخۆن لەو ڕزق و ڕۆزیە چاك و باشانەی کە پێمان بەخشیوون و بەردەوام سوپاسگوزاری الله بکەن ئەگەر ئێوە تەنها ئەو دەپەرستن.›

وەفەرموویەتی ﴿وَلَقَد كَرَّمنا بَني آدَمَ وَحَمَلناهُم فِي البَرِّ وَالبَحرِ وَرَزَقناهُم مِنَ الطَّيِّباتِ وَفَضَّلناهُم عَلى كَثيرٍ مِمَّن خَلَقنا تَفضيلًا﴾[16]واتە : سوێند بە الله بێگومان ڕێزمان لە نەوەی ئادەم گرت و لە وشکانی و لە دەریادا هەڵمان گرتن (بەسواری و گەڕانمانن) و ڕۆزی پاك و خاوێنمان پێ داون وە باومان داون بەسەر زۆرێك لەو شتانەی کە دروستمان کردوون بە باودانێکی گەورە.›

[14] البقرة:٢١
[15] البقرة:١٧٢
[16] الإسراء:٧٠

جا اللە تعالی کە ئێمەی دروست کردوە و ڕزقی داوین بێگومان دەبێت بۆ شتێک دروستی کردبێتین و ڕزقی دابین ، بێگومان دەبێت مەبەستێک هەبێت لەم دروست کردن و ڕزق دانە ، وە ئەو مەبەستەش بریتیە لە عیبادەتکردن و پەرستنی اللە تعالی بەتاک و تەنها ،

اللە تعالی فەرموویەتی ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾[17]واتە :وە من جنۆکە و ئادەمیزادم تەنها بۆ ئەوە دروست کردووە کە بەندایەتی من بکەن.›

جا ئایە اللە تعالی کە ئێمەی دورست کردوە بۆ عیبادەت ئایە بۆ ئەوەی هەر لە خۆمانەوە بەدڵی خۆمان عیبادەت بکەین ؟؟ بێگومان نەخێر بەڵکو پێغەمبەری بۆ ناردوین ، اللە تعالی فەرموویەتی ﴿وَما أَرسَلنا مِن قَبلِكَ مِن رَسولٍ إِلّا نوحي إِلَيهِ أَنَّهُ لا إِلهَ إِلّا أَنا فَاعبُدونِ﴾[18]واتە : وە ئێمە نەمان ناردووە پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێك مەگەر نیگامان بۆ ناردووە (بەوەی کە) بێگومان جگە لە من هیچ پەرستراوێك نی یە کەواتە تەنها من بپەرستن.›

جا ئەو پێغەمبەرەی اللە تعالی ناردویەتی هەر کەسێک گوێڕایەڵی بکات ئەوە دەچێتە بەهەشتەوە وە هەر کەسێک سەر پێچی بکات و ئیمانی پێنەهێنی ئەوە دەچێتە دۆزەخەوە ، وەک پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ﴿ كُلُّ أُمَّتِي يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ إِلَّا مَنْ أَبَى . قَالُوا : يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَنْ يَأْبَى ؟ قَالَ : مَنْ أَطَاعَنِي دَخَلَ الْجَنَّةَ، وَمَنْ عَصَانِي فَقَدْ أَبَى ﴾[19]واتە : هەموو ئومەتەکەم دەچنە بەهشتەوە تەنها کەسێک کە نەیەوێت ، (هاوەڵان) فەرموویان جا کێ نایەوێت ؟ ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : هەر کەسێک گوێڕایەڵم بێت ئەوە دەچێتە

[17] الذاريات: ٥٦

[18] الأنبياء:٢٥

[19] رواه البخاري

بەهەشتەوە ، وە هەر کەسێک سەر پێچیم بکات ئەوە نایەوێت بچێتە بەهەشتەوە ،›

جا کەسێکیش نەیەوێت بچێتە بەهەشتەوە و سەر پێچی فەرمانی پێغەمبەر ﷺ بکات ئەوە بە دڵنیاییەوە دەچێتە دۆزخەوە ،

بێگومان اللّٰه تعالی بۆ هەموو گەل و نەتەوەیێک پێغەمبەرێکی ناردوە بۆیان ، وەک فەرموویەتی ﴿وَلَقَد بَعَثنا في كُلِّ أُمَّةٍ رَسولًا أَنِ اعبُدُوا اللَّهَ وَاجتَنِبُوا الطّاغوتَ فَمِنهُم مَن هَدَى اللَّهُ وَمِنهُم مَن حَقَّت عَلَيهِ الضَّلالَةُ فَسيروا فِي الأَرضِ فَانظُروا كَيفَ كانَ عاقِبَةُ المُكَذِّبينَ﴾[20]واتە : سوێند بە اللّٰه لەناو هەموو گەل و ئوممەتێکدا پێغەمبەرێکمان ناردووە بەمەی تەنها اللّٰه بپەرستن و دوورکەونەوە لە (پەرستنی) هەر پەرستراوێکی تر جا خوا هەندێکی لەو (ئوممەت) انە ڕێنموونی کرد و هەندێکیشیان (لەبەر خراپیان) گومڕایی یەخەی گرتن دەی بەزەوی دا بگەڕێن و تەماشا کەن سەر ئەنجامی بێ باوەڕان چۆن بوو.›

جا هەموو گەل و نەتەوەیێک پێغەمبەرێکی بۆ نێردراوە تا شاهید بێت بەسەر خەڵکییەوە ، تا ئەو خەڵکە لە قیامەت نەڵێن ئێمە پێغەمبەران بۆ نەنێردرابوو ، جا گەر بڵێن بۆمان نەنێردرابوو ، اللّٰه تعالی پێی دەڵێن ئەی پێغەمبەرم بۆتان نەنارد لە دونیا ؟؟، ئەوکات پێغەمبەرەکە دەبێت بەشایەت لەسەریان و دەمکوت دەبن ،

وە بۆ ئێمەش پێغەمبەر محمد نێرداوە ﷺ ، وەک چۆن بۆ لای فیرعەون پێغەمبەرێک نێردرا کە پێغەمبەر مـوسا بوو علیه السلام ، جا فیرعەون سەر

[20] النحل:٣٦

متن

الثَّانِيَةُ: أَنَّ الله لا يَـرْضَى أَنْ يُشْرَكَ مَعَهُ أَحَدُ في عِبَادَتِهِ، لا مَلَكُ مُقَرَّبُ، وَلا نَبِيٌّ مُـرْسَلُ؛ وَالدَّلِيلُ قَوْلُهُ تَـعَالَى: ( وَأَنَّ الْمَسَاجِدَ لِلَّهِ فَلاَ تَدْعُوا مَعَ اللَّهِ أَحَدًا )[الجن:18][12]الثَّالِثَةُ:أَنَّ مَنْ أَطَاعَ الرَّسُولَ،وَوَحَّدَ اللهَ لا يَجُوزُ لَهُ مُوَالاةُ مَنْ حَادَّ اللهَ وَرَسُولَهُ، وَلَوْ كَانَ أَقْرَبَ قَرِيبٍ؛وَالدَّلِيلُ قَوْلُهُ تَعَـالَى:( لاَ تَـجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُـونَ بِاللَّهِ وَالْيَـوْمِ الآخِـرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ

پێچی پێغەمبەر موسای کرد و ئیمانی پێ نەهێنا ، جا الله تعالی یش ، تۆڵەی لە فیرعەون کردەوە سزای دا لە پاداشتی ئەوەی سەرپێچی پێغەمبەر موسای کرد ، ئەوە بوو کە غەرقی کرد لە ئاودا و خنکاندی ،

جا بۆیە لەمەش ئەوە فێر دەبین کە هەر کەسێک سەرپێچی پێغەمبەران بکات و ئیمان و باوڕیان پێ نەهێنێت و شوێنیان نەکەوێت ئەوا سزا دەرێت لەلایان الله تعالی ەوە ، جا یان لە دونیا سزا دەرێت پاشان لە قیامەت ، یان لە قیامەت سزای قورستر دەدرێت .،

[١٢]دووەم : بێگومان الله تعالی ڕازی نابێت کە کەسێکی تر بکرێت بە شەریکی لە عیبادەتەکاندا ، نە مەلائێکەتێکی نزیکی خۆی ، وە نەپێغەمبەرێکی نێردار (لەلایان خۆیەوە) ، بەڵگەش الله تعالی فەرموویەتی : بێگومان مزگەوتان تایبەتی اللهن کەواتە لەگەڵ الله دا هاوار لە کەسی تر مەکەن.،

۞ ڕونکردنەوە ۞

بێگومان الله تعالی ڕازی نیە و قبوڵی نیە کە هیچ شتێک بکرێت بە شەریکی لە پەرستنەکانی دا ، وەک الله تعالی فەرموویەتی ﴿وَاعبُدُوا اللَّهَ وَلا تُشرِكوا بِهِ

شَيئًا﴾[21]واتە : (ئەی خەڵكینە) تەنها الله بپەرستن و هیچ جۆرە شەریك و هاوەڵێكی بۆ بڕیار مەدەن›

جا هیچ فەرق ناكات ئەو شەریكە چی بێت ، مەلائیكەت بێت وەك جوبرائیل و اسرافیل و ئەوانەی عەرشیان هەڵگرتوە ، یان پێغەمبرێكی نێدراو بێت وەك پێغەمبەر محمد و ابراهیم و نوح و موسى و عیسى علیهم السلام ، یان پیاوچاك بێت یان پیاو خراپ یان دار بێت یان بەرد یان هەرچی بێت ئەوە الله تعالى ڕازی نابێت بكرێت بە شەریكی بە هیچ شێوەیەێك ،

الله تعالى فەرموویەتی ﴿وَأَنَّ الْمَسَاجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُوا مَعَ اللَّهِ أَحَدًا﴾[22] واتە : بێگومان مزگەوتان تایبەتی اللەن كەواتە لەگەڵ الله دا هاوار لە كەسی تر مەكەن.› جا ئەم مسجد ە ، گەر بەتایبەت بێت ئەوا ئەو مزگەوتانە دەگرێتەوە كە موسڵمانان نوێژی تێدا دەكەن ، وە گەر مانا گشتیەكەی بێت ئـەوا هەموو سەر زەوی دەگرێتەوە چونكە هەموو سەر زەوی مسجد ە و شوێنی سـوجدە بردنە بۆ الله تعالى ،

وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ﴿جُعِلَتْ لِي الأرْضُ مَسْجِدًا وطَهُورًا﴾[رواه البخاري]واتە : سەر زەوی بۆم پاك كراوەتەوە و كراوە بە شوێنی سوجدە بردن ‹.

جا بۆیە بۆ هیچ كەسێك نیە داوا و تكا لە غەیری الله تعالى بكات تا سودی پێ بگەیێنێت یان زیانی لێ دور بخاتەوە،

---

[21] النساء:٣٦

[22] الجن:١٨

مـتـن

وَلَوْ كَانُـوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَـشِيرَتَهُمْ أُوْلَئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الإِيـمَانَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٍ مِّـنْـهُ وَيُدْخِـلُـهُمْ جَـنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ أُوْلَئِكَ حِزْبُ اللَّهِ أَلاَ إِنَّ حِـزْبَ اللَّهِ هُمُ الْمُفْلِحُـونَ )[المجادلة: 22][13]اِعْلَمْ أَرْشَدَكَ اللهُ لِطَاعَتِهِ، أَنَّ الْحَنِيفِيَّةَ مِلَّـةَ إِبْرَاهِيمَ: أَنْ تَعْبُدَ اللهَ وَحْدَهُ، مُخْلِصًا لَهُ الدِّينَ. وَبِذَلِكَ

[١٣]سێیەم : بەدڵنیایەوە هەر کەسێک گوێڕایەڵی پێغەمبەر بوبێت ﷺ ، وە اللّٰه تعالی ی بەتاک و تەنها ڕاگرتبێت ئەوە بۆی جائیز نیە دۆستایەتی کەسێک بکات کە دژایەتی اللّٰه تعالی و پێغەمبەرکەی دەکەن ﷺ ، ئەگەر چی ئەوکەسە نیزیکترین کەسی بێت ، بەڵگەش اللّٰه تعالی فەرموویەتی : کەسانێکت دەست ناکەوێ کە باوەڕیان هەبێت بە اللّٰه و بە ڕۆژی دوایی کە دۆستایەتی بکەن لەگەڵ ئەوانەی دژایەتی اللّٰه و پێغەمبەری اللّٰه دەکەن هەر چەندە ئەو دوژمنانەش باوکیان بن یا کوڕ و برا و خزمیان بن ئەوانە خوا باوەڕی لە دڵیاندا چەسپاندووە وە پشتیوانی کردوون بە گیانێك لە لایەن خۆیەوە وە دەیانخاتە بەهەشتانێکەوە کە جۆگە ئاوی زۆر دەڕوات بەژێر درەختەکانیاندا بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە اللّٰه لێ یان ڕازی بووە ئەوانیش لە اللّٰه ڕازی بوون ئەوانە حیزبی اللّٰه ن ئاگادار بن کە تەنها حیزبی اللّٰه ڕزگار و سەرفرازن.»

۞ **ڕوونکردنەوە** ۞

هەر کەسێک شوێن پێغەمبەر ﷺ کەوتبێت یان بانگەشەی ئەوە بکات کە شوێنکەوتوی پێغەمبەرە ﷺ ، وە اللّٰه تعالی ی بەتاک عو تەنها ڕاگرتبێت لە پەستنەکانی دا و کەسێکی موحید و یەک تاک پەرست بێت ،یانی کەسێکی موسڵمان بێت ئەوە بەهیچ جۆرێک بۆی جائیز و ڕێگە پێدراو نیە دۆستایەتی لەگەڵ کەسێک بکات کە دژایەتی اللّٰهتعالی و پێغەمبەرەکەی دەکات ﷺ ،

ئەگەر چی ئەو کەسە کەسێکی نزیکی خۆی بێت وەک دایکی و باوکی و خوشکی برای و خێزانی و کوڕی و کچی ، بەهیچ جوڕێک بۆی جائیز نیە ،

وە ئەمەش بریتیە لە ولاء و البراء کە پێویستە موسڵمان ولاء بۆ الله تعالی و پێغەمبەرەکەی ﷺ و دینەکەی و موسڵمانان هەبێت ، وە بەڕائەتی لە کافران بێت بیان بوغزێنێت و ڕقی لێیان ببێتەوە بەهەموو شێوەیێک ،

ئەگەر وای نەکرد و دۆستایەتی ئەو کەسانەی کرد کە دژایەتی الله تعالی و پێغەمبەرکەی دەکەن ﷺ ئەوە بێگومان کافر دەبێت و موسڵمان نیە ، ئەگەر چی بە خۆی بڵێت موسڵمان و ئیماندار ، وە نوێژ بکات و ڕۆژو بگرێ ،

الله تعالی فەرموویەتی ﴿لَا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ﴾واتە ئەی محمد ﷺ هیچ قەوم و کەسێک نا دۆزیتەوە لەسەر زەوی کە ئیمانیان بە الله تعالی و ڕۆژی هەبێت ، نای دۆزیتەوە واتە بونی نیە کەسی وا نەبوونی هەیە و دەش بێت شتی وا نابێت کەسێک باوڕی بە الله تعالی و ڕۆژی دوای هەبێت لەگەڵ ئەوشدا﴿يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ﴾ خۆشەویستی و دۆستایەتی هەبێت بۆ کەسێک کە دژایەتی الله تعالی و پێغەمبەرکەی دەکات ڕوبەڕویان وەستاوەتەوە لەسەنگەریان وەستاوە،

﴿وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ﴾ ئەگەر چی ئەوکەسەی دژایەتی دین دەکات باوکی کەسە موسڵمانەکە بێت یان کوڕی بێت یان برای بێت یان خزم و عەشیرەتی کەسەکە موسڵمانەکە بێت ئەوە بە هیچ جۆرێک جائیز نیە کەسە موسڵمانەکە دۆستایەتی بکات و خۆشی بوێت و سەری خات ، وە گەر دۆستایەتی کرد ، ئەوە بێگومان بەهۆیەوە کافر دەبێت

﴿أُولَئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ وَأَيَّدَهُمْ بِرُوحٍ مِنْهُ﴾وە بە پێچەوانەی ئەو کەسانەی لە پێشو باسمان کرد کە دۆستایەتی ئەو کەسانەیان دەکرد کە دژایەتی الله تعالی و پێغەمبەرەکەی دەکەن ﷺ ، ئەوا کەسانێکی تر کە دۆستایەتی الله تعالی پێغەمبەرەکەی و ئیمانداران دەکەن وە دژایەتی ئەو کەسانەش دەکەن کە دژایەتی الله تعالی و دینەکەی و پێغەمبەرەکەی دەکەن ﷺ ئەوا ئەو کەسانە الله تعالی ئیمانی لە دڵیان نوسیوە و دای مەزراندون لەسەر ئیسلام و ئیمان ، وە پشتیوانیان دەکات و سەریان دەخات بەسەر کافران بە هێز و توانایێک لە لایان خۆیەوە ،

﴿وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا﴾ وە لە قیامەتیش دەیان خاتە بەهەشتێکەوە کە لە ژێر دارەکانی ئاوی پاک و خاوێن دەڕوات بە ژێری دا ،وە بەهەتا هەتای تێیدا دەمێننەوە دەرناکارێن لەو بەهەشتە ،

﴿رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ﴾ الله تعالی لەو کەسانە ڕازی بوو کە بەو شێوە بوون و دۆسیتایەتی ئەهلی ئیمانیان دەکرد و دژایەتی دووژمنانی الله تعالی و پێغەمبەرەکەیان دەکرد ،

﴿وَرَضُوا عَنْهُ﴾ وە بەهەمان شێوە ئەو کەسانەش لە الله تعالی ڕازی بوون بە فەرمانەکان و داواکاریەکانی الله تعالی، وە بە داژیەتی کردنی قەومی کافران ڕازی بوون ، ئەگەرچی خزمی نزیکی خۆشیان بێت ، وە ئیماندارانیان خۆش بوێت ئەگەرچی کەسی دوریش بێت و نزیکیان نەبێت

﴿أُولَئِكَ حِزْبُ اللَّهِ﴾ جا ئەو کەسانەی کە بەو شێوە بون و الله تعالی لێیان ڕازی بوو لەسەر ولاء و البراء یان وە ئەوانیش بەفەرمان و داوای الله تعـــــالی ڕازی

مـتـن

أَمَرَ اللهُ جَمِيعَ النَّاسِ، وَخَلَقَهُمْ لَهَا؛ كَـمَا قَالَ تَعَالَى: ( وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالإِنْـسَ إِلاَّ لِيَعْبُـدُونِ )[ الـذاريات: 56] وَمَعْـنَى يَعْبُدُونِ : يُوَحِّدُونِ،[14] وَأَعْـظَمُ مَـا أَمَرَ اللهُ بِـهِ التَّـوْحِيدُ، وَهُـوَ: إِفْـرَادُ اللهِ بِالْـعِبَادَةِ. وَأَعْـظَمُ مَـا نَهَى عَنْـه الشِّـرك، وَهُـوَ: دَعْـوَةُ غَيْـرِهِ مَـعَهُ، وَالـدَّلِيلُ قَوْلُهُ تَعَالَى (وَاعْبُدُواْ اللّهَ وَلاَ تُشْرِكُواْ بِهِ شَيْئًا)[النساء: 35][15]..............................

بوون ، ئا ئەو کەسانە کۆمەڵ و تاقمی الله تعالی ن کە الله تعالی و پێغەمبەر و دینەکەی سەر دەخەن بەسەر هەموو دین و ڕێبازێکی تر ،

﴿أَلَا إِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ ئا بێگومان و دوو دڵی هەر کۆمەڵ و تاقمی الله تعالی هەمیشە سەرکەوتوون و سەرفرازان بەسەر غەیری خۆیان دا لە دونیا ، وە لە قیامەتیش دەخرێنە بەهەشتێکەوە کە لە ژێر دار و درەختەکانی ئاو و ڕوباری پاک و سازگار تێدەپەڕێت ،

[١٤]بزانە الله ڕێنمونیت بکات بۆ گوێڕایەڵی خۆی ، بەدڵنیایەوە نەتەوەی پێغەمبەر ابراهیم کە(خۆ دور گرتن بوو لە شیرک و ڕۆشتن بوو بەرەو تەوحید) ، بریتیە لەوەی کە اللهتعالی بەپەرستیت بە تاک و تەنها و ملکەچی بیت و دڵسۆز بیت لە عیبادەتەکان و دڵسۆز بیت بۆ دینەکەی ، وە الله تعالی یش فەرمانی بەهەموو خەڵکی کردوە کە بەو شێوەیە بێت و هەر بۆ ئەوەش دروستی کردوون ، وەک اللهتعالی فەرموویەتی : وە من جنۆکە و ئادەمیزادم تەنها بۆ ئەوە دروست کردووە کە بەندایەتی من بکەن.›وەمانای بۆ پەرستنی خۆم واتا بۆ بەتاک ڕاگرتنم لە عیبادەتەکانیان دا ،

۞ ڕوونکردنەوە ۞

بێگومان هەر الله تعالی بەندەکانی ڕێنمونی دەکات ،

وەک فەرموویەتی ﴿مَن يَهدِ اللَّهُ فَهُوَ المُهتَدِ وَمَن يُضلِل فَلَن تَجِدَ لَهُ وَلِيًّا مُرشِدًا﴾[23]واتە :ئەوەی الله هیدایەتی بدات هەر ئەو هیدایەت دراوەو ڕێنموویی وەرگرتووە، ئەوەش الله گومڕای بکات، ئەوە هەرگیز کەسێکت دەست ناکەوێت کە پشتیوانی بکات و ڕێنموویی بکات.›

وە مەبەست لە نەتەوەی ئیراهیم بریتیە لە ڕێگا و ڕێبازی ئیبراهیم کە بریتی بوو لە دور کەوتنە لە شیرک و ئەهلەکەی وە ڕۆشتن بەروە تەوحید و بانگەوازی کردنی تەوحید ،

وە ڕێگا و ڕێبازێکی پاک بوە و دوور بوە لە شەریک بڕیاردان بۆ الله تعالی ،

وەک الله تعالی فەرموویەتی ﴿قُل إِنَّني هَداني رَبّي إِلى صِراطٍ مُستَقيمٍ دينًا قِيَمًا مِلَّةَ إِبراهيمَ حَنيفًا وَما كانَ مِنَ المُشرِكينَ﴾[24]واتە :ئەی موحەممەد(صلی الله علیه وسلم) بڵێ بێگومان من پەروەردگارم ڕێنموونیی کردووم بۆ ڕێگای ڕاست ئاینێکی زۆر ڕاست و پاك(کە هیچ لاریەکی تیا نی یە) ئایینی ئەو ئیبراهیمەیە کە لە هەموو ئایینە ناڕاستەکان لایداوە بۆ پەرستنی الله بە تەنها وە بە هیچ جۆرێك لە هاوبەش پەیداکەران نەبووە.›

الله تعالی فەرمانی پێکردوین کە شوێن ئەو بەرنامەو ڕێبازەی پێغەمبەر ابراهیم بکەوین علیه السلام کە دورە لە گومڕایی و شیرک ،

وەک الله تعالی فەرموویەتی﴿فَاتَّبِعوا مِلَّةَ إِبراهيمَ حَنيفًا وَما كانَ مِنَ المُشرِكينَ﴾[25]واتە : شوێنی ئاین و بەرنامەی ئیبراهیم بکەون کە پاکو دروست و فەرمانبەردارە و ئەو هەرگیز لە موشریک و هاوەڵگەران نەبووە.›

---

[23] الكهف:١٧

[24] الأنعام:١٦١

[25] آل عمران:٩٥

وە ئەمەش پەرستنی الله تعالی یە بەتاک و تەنها دورکەوتنەوەیە لە شیرک ، بە دڵسۆزی و مەبەست لە کردەوەکان تەنها الله تعالی یە و ڕەزامەندی ئەوە ،

الله تعالی فەرموویەتی ﴿قُل إِنّي أُمِرتُ أَن أَعبُدَ اللَّهَ مُخلِصًا لَهُ الدّينَ﴾[26]واتە : ئەی موحەممەد ﷺ بڵێ بەڕاستی من فەرمانم پێ دراوە کە الله بپەرستم بە دڵسۆزی بۆی ملکەچ بم.›

وە الله تعالی فەرمانی بەهەموو خەڵکی کردوە کە الله تعالی بپەرستن بەتاک و تەنها،

وەک فەرموویەتی﴿وَاعبُدُوا اللَّهَ وَلا تُشرِكوا بِهِ شَيئًا﴾[27]واتە: (ئەی خەڵکینە تەنها الله بپەرستن و هیچ جۆرە شەریک و هاوەڵێکی بۆ بڕیار مەدەن.›

وە الله تعالی هەر بۆ ئەمە مرۆڤ و جنی دروست کردوە کەبەتاک و تەنها الله تعالی بەپرستن و شەریکی بۆ بڕیار نەدەن و ملەکەچ و دڵسۆزی بن بۆ الله تعالی و دینەکەی ،

وەک الله تعالی فەرموویەتی﴿وَما خَلَقتُ الجِنَّ وَالإِنسَ إِلّا لِيَعبُدونِ﴾[28]واتە : وە من جنۆکە و ئادەمیزادم تەنها بۆ ئەوە دروست کردووە کە بەندایەتی من بکەن›

وە ئەم پەرستنەش بریتیە لە بەتاک ڕاگرتنی الله تعالی لە عیبادەتەکان نەک هەر بڵێین مادام عیبادەتە چۆنی دەمانەوێت ئاوا دەکەین ، نەخێر بەڵکو دەبێت عیبادەتێک بێت کە پاک بێت لە شەریک و دڵسۆزانە بێت بۆ الله تعالی و لەسەر سونەت بێت ،

---

[26] الزمر:١١
[27] النساء:٣٦
[28] الذاريات:٥٦

وەک اللە تعالی فەرموویەتی﴿وَاعبُدُوا اللَّهَ وَلا تُشرِكوا بِهِ شَيئًا﴾[29]واتە: (ئەی خەڵکینە) تەنها اللە بپەرستن و هیچ جۆرە شەریک و هاوەڵێکی بۆ بڕیار مەدەن.›

[١٥]وە گەورەترین شت کە اللە تعالی فەرمانی پێی کردوە تەوحیدە کە بەتاک ڕاگرتنی اللە تعالی یە (لە عیبادەتەکاندا) وە گەورەترین شت کە اللە تعالی قەدەغەی کردوە شریکە کە داواکاردنە لە غەیری اللە تعالی لەگەڵ اللە تعالی دا ، بەڵگەش وتەی اللە تعالی یە کەفەرمویەتی: (ئەی خەڵکینە) تەنها اللە بپەرستن و هیچ جۆرە شەریک و هاوەڵێکی بۆ بڕیار مەدەن.›

۞ ڕوونکردنەوە ۞

پێناسەی ئەو تەوحیدەی کە گەورەترین شتە اللە تعالی فەرمانی بە بەندەکانی کردوە ئەنجامی بدەن بریتیە لە بەتاک ڕاگرتنی اللە تعالی لە هەموو ئەو عیبادەتانەی کەپەیوەستن بە توحيد الربوبية و توحيدالألوهية و توحيد الأسماء والصفات ،

وە گەورەترین شتیش کە اللە تعالی ڕێگری کردوە لێی بریتیە لە شیرک ئەویش ئەوەیە کە بەندە جۆرێک یان چەند جۆرێکی عیبادەت ئەنجامدات بۆ غەیری اللە تعالی وە یان یەکێک لە حەق و مافەکانی اللە تعالی بدات بە غەیری اللە تعالی لە الربوبية و توحيد والألوهية و توحيد والأسماء والصفات ،

وەک اللە تعالی فەرموویەتی﴿وَاعبُدُوا اللَّهَ وَلا تُشرِكوا بِهِ شَيئًا﴾[30]واتە: (ئەی خەڵکینە) تەنها اللە بپەرستن و هیچ جۆرە شەریک و هاوەڵێکی بۆ بڕیار مەدەن.›

---

[29] [ النساء:٣٦ ]

[30] [ النساء:٣٦ ]

مـتـن

فَإِذَا قِيلَ لَكَ: مَا الأُصُولُ الثَّلاثَةُ التِي يَجِبُ علَى الإِنْسَانِ مَعْرِفَتُهَا؟
فَقُلْ: مَعْرِفَةُ الْعَبْدِ رَبَّهُ، وَدِينَهُ، وَنَبِيَّهُ مُحَمَّدًا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.[16]
فَإِذَا قِيلَ لَكَ: مَنْ رَبُّكَ؟
فَقُلْ: رَبِّيَ اللهُ الَّذِي رَبَّانِي، وَرَبَّـى جَمِيعَ الْعَالَمِينَ بِنِعَمِهِ، وَهُوَ مَعْبُودِي لَيْسَ لِي مَعْـبُودٌ سِوَاهُ؛ وَالدَّلِيلُ قَوْلُهُ تَعالَى: ( الْحَمْدُ للَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ )

جا ئەم دوو شتە كە تەوحید و شیركن دژی یەكەن ، بەهیچ جۆرێك لە یەك كەس دا كۆنابنەوە ، تەوحید لە كەسێك نیە كە موشریك بێت ، وە بەكەسێكیش ناوترێت موشریك ئیلا تەوحیدی نیە و هەڵیوەشاندۆتەوە ،

[١٦] جا ئەگەر پێت وترا سێ بنچینەكە چیە كە ناسینیان لەسەر مرۆڤ واجبە ؟؟ ئەوا بڵێ بریتیە لەوەی بەندە پەروەردگاری خۆی بناسێت ، وە دینەكەی بناسێت ، وە پێغەمبەرەكەی بناسێت كە محمدە ﷺ ،

❁ ڕونكردنەوە ❁

ئەم جۆرە قسەكردن و شێوەی پرسیار و وڵامە ، شێوازی شیخە(رحمه‌الله)كە قسەی پێدەكات ، وە یەكێكە لەو شێوازانەی كە سودی دەبێت بۆ گوێگر كە هەست بە سۆزی مامۆستاكەی دەكات لە كاتی گفتوگۆكردنی لەگەڵی ،

وە ئەم شێوازەش لە باشترین هۆكارەكانە بۆ ئەوەی كەسی فێر خواز زانستەكەی لە مێشكی پارێزاو بێت چونكە پرسیار وڵام مێشك بەهێز دەكات و پارێزگاری كەرە لە لەبیر چونەوە ،

جا ئەم نوسراوەی شێخ (رحمه‌الله) باسی سێ بنچینەی گرنگ دەكات كە ئەویش ناسینی الله تعالی و دینەكەی و پێغەمبەرەكەیەتی ﷺ ، جا ڕەنگە كەسێك بڵێت جا ئەوە چیە كێ هەیە ئەوشتانە نەزانێت ، بەڵام لەڕاستی دا وانیە بەڵكوو

زۆربەی خەڵکی هەر هیچ شارەزایی نیە لەسەر ئەم سێ بنچینەیە بەبەڵگەکانیەوە ، بەڵکو هەر بە تەقلیدی کوێرانە لە باوک و باپیران وەریان گرتوە ، وە تەقلیدی کوێرانەش خاوەنەکەی بەرەو شەریک و گومڕایی دەبات وەک چۆن یەکەم جار کە شیرک لەسەر زەوی پەیدابوو بەهۆی تەقلیدی کوێرانەی خەڵکی یەوە بوو بەبێ بەرچاو ڕونی و بەڵگە ،

جا بۆیە پێویستە لەسەر موسڵمان کە پەروەردگاری خۆی بناسێت چونکە گەر پەروەردگاری نەناسێت بێگومان ناشزانێت کە داوای چی لێکردوە و ڕێگری چی لێکردوە ،

وە گەر دینەکەی نەناسێت بێگومان نازانێت بەچی دێتە ناو دینەوە و بەچی دەردەچێت لە دین ،

وە گەر پێغەمبەرەکەی ﷺ نەناسێت بێگومان نازانێت کە دەبێت چۆن بێت لەبەرامبەری و چۆن گوێڕایەڵی بکات ،

وە هیچ جێگای گومان نیە کە لەناو خەڵکی ئەم سەردەمە کە بە حساب سەردەمی پێشکەوتنە ، خەڵکی بەهۆی هەندێک لە پێشکەوتنەکانەوە لە دینەکەیان پاش بکەوتن و گومڕا بوون ، پەنابەاللە تعالی.



متن

[الفاتحة: 2]. وَكُلُّ مَنْ سِوَى اللهِ عَالَمٌ، وَأَنَا وَاحِدٌ مِنْ ذَلِكَ الْعَالَمِ.[17]
فَإِذَا قِيلَ لَكَ: بِمَ عَرَفْتَ رَبَّكَ؟
فَقُلْ: بِآيَاتِهِ وَمَخْلُوقَاتِهِ، وَمِنْ آيَاتِهِ: اللَّيْلُ، وَالنَّهَارُ، وَالشَّمْسُ، وَالْقَمَرُ، وَمِنْ مَخْلُوقَاتِهِ السَّمَاوَاتُ السَّبْعُ وَالأَرَضُونَ السَّبْعُ وَمَنْ فِيهِنَّ، وَمَا بَيْنَهُمَا؛وَالدَّلِيلُ قَوْلُهُ تَعَالَى:(وَمِنْ آيَاتِهِ اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ

# بنچینەی یەکەم

[١٧]جائەگەر پێت وترا پەروەردگارت کێیە ؟؟

ئەوە بڵی پەروەردگاری من ئەو الله یەیە کە پەروردگاری هەموو جیهانەکانە بە نیعمەتەکانی ، وە ئەو پەرستراوی منە و هیچ پەرستراوێکی ترم نیە لە غەیری ئەو ، بەڵگەش وتەی الله تعالی یەکە فەرموویەتی : هەموو سوپاس و ستایش بۆخوای پەروەردگاری جیهانیان.› وە هەموو شتێک لە غەیری اللهتعالی جیهانێکە ، وە منیش دانەیێکم لەو جیهانە ،

**ڕوونکردنەوە**

وشەی پەروەردگار (رب) واتە بەڕێوبەر یان بەخێرو کەر ،

وە ئەوەش مەبەست لەوەیە کە الله تعالی ئێمە بەڕێوە دەبات و بەخێوامان دەکات و بەڕێوبەری ئێمەیە ، وە جیهان مەبەست لە جیهان و حاڵی بونەوەرکانە ، جا مرۆڤ جیهانێکە ، جنۆکەکان جیهانێکی ترن ، وە ماسی و قرش جیهانێکی

ترە ، وە مەلائیکە جیهانێکی ترە ، وە مارو و مێرولە و حەشەڕات جیهانێکی ترە ، بەو شێوە ..هتد ،

مـتـن

لاَ تَسْجُـدُوا لِلـشَّمْسِ وَلاَ لِلْقَمَرِ وَاسْجُدُوا لِلَّهِ الَّذِي خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ)[فصلت: 37]. وَقَوْلُهُ تَعَالَى:(إِنَّ رَبَّكُمُ اللّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ فِـي سِـتَّةِ أَيَّـامٍ ثُـمَّ اسْتَـوَى علَى الْعَـرْشِ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ يَطْلُـبُهُ حَثِيثًـا وَالشَّمْـسَ وَالْقَـمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّرَاتٍ بِأَمْرِهِ أَلاَ لَهُ الْخَلْقُ وَالأَمْـرُ تَبَارَكَ اللّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ )[الأعراف: 54].[18]وَالـرَّبُ هُوَ الْمَـعْبُـودُ،

ئەم بەڕێوبردانە بەنیعمەتەکان و بەخششەکانی پەروەردگارمانە ، وەک ئەوەی ڕزقی داوین و جێگای بۆ داناوین و ئۆکسجینی پێداوین و زۆری تر ، جا ئەمە تەنها بۆ ئیمە ، وە بۆ دروستکراوەکانی تریش بەهەمان شێوە نیعمەتی خۆی پێداون ، بەنیعمەتەکانی خۆی بە ڕێوەمان دەبات و بەخێوامان دەکات ، وە هەر ئەویشت پەرستراوی ئێمەیە کە دەبێت هەر ئەو بپەرستین چونکە هەر ئەو شایەنی پەرستنە و ئەو پەرستراوی حەقە و هیچ پەرستراوێک نیە لەغەیری ئەو بپەرسترێت ،

[١٨]جا گەر پێت وترا بەچی پەروەردگارت ناسی ؟؟

ئەوا بڵێ بەنیشانەکانی و دروستکراوەکانی ، وە لە نیشانەکانی شەو و ڕۆژ و خۆر و مانگ ، وە لە دروستکراوەکانی حەوت تەبەقەی (چین) ئاسمان و حەوت تەپەقەی زەوی ، وە ئەوەی تێیاندایە و لە نێوانیان دایە ، بەڵگەش وتەی اللّٰه تعالی یەکە فەرموویەتی :لە نیشانە و بەڵگەکانی دەسەڵاتی پەروەردگار شەو و ڕۆژ و خۆر و مانگە، هەرگیز نەکەن سوژدە بۆ خۆر، یان مانگ ببەن، بەڵکو سوژدە تەنها بۆ ئەو اللّٰه یە ببەن کە دروستی کردوون، ئەگەر ئێوە خۆتان بە بەندەی ڕاستەقینەی ئەو دەزانن و هەر ئەو دەپەرستن.› وە فەرموویەتی : بەڕاستی پەروەردگارتان ئەو اللّٰه یەیە کە ئاسمانەکان و زەوی لە شەش ڕۆژدا دروست کردووە پاشان ( اللّٰه) چووە سەر عەرش (ئێمە ئیمانمان پێ یەتی بەڵام

شێوەکەی نازانین) بە( تاریکایی)  شەو( ڕۆشنایی) ڕۆژ دادەپۆشێ (بەپێچەوانەشەوە) (ڕۆژ بەشوێن شەووەیە بە خێرایی و) شەو بەشوێن ڕۆژەوەیە بە خێرایی خۆرو مانگ و ئەستێرەکانیش ژێر بار کراوون بەفەرمانی خۆی بێدار بن کە بەدی هێنان و فەرماندان هەر بۆ الله یە پاك و بێ گەردە(لەهەموو کەم و کوڕی یەك) خوای پەروەردگاری جیهانیان.›

۞ **ڕونکردنەوە** ۞

ئەم وتەی شێخ کە دەڵێت گەر پێت وترا پەروەردگارت بەچی ناسی ، دوو سودی هەیە ،

یەکەم گەر پرسیار لە موسڵمانێک کرا ، لەلایان کەسێکی کافرە کە بڕوای بە الله تعالی و دینەکەی نیە ، یان بڕوا بە الله تعالی هەیە بەڵام بڕوا بوونێکی دامەزراوی نیە ، ئەوا دەتوانێت بەم بەڵگە دیارانە وڵامی بداتەوە کە لە واقع دان وەک خۆر و مانگ و شەو و ڕۆژ ،

دووەم کەسی موسڵمان دەتوانێت بە هۆی ئەم نیشانانە و دروست کراوانەوە ، ئیمانی تازە بکاتەوە و گەورەیی و توانای  الله تعالی بکەوێتەوە بەر چاو و ترسی قیامەتی زیاتر بێت ،

وە بێگومان بەندە دەبێت وابێت کە هیچ شتێک بە پەرستراوی خۆی نەزانێت تەنها الله تعالی نەبێت ،

الله تعالی فەرموویەتی ﴿وَلَقَد أَرسَلنا نوحًا إِلى قَومِهِ فَقالَ يا قَومِ اعبُدُوا اللَّهَ ما لَكُم مِن إِلٰهٍ غَيرُهُ أَفَلا تَتَّقونَ﴾[31]واتە : سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە نووحمان نارد بۆ لای هۆزەکەی جا پێی وتن ئەی هۆزەکەم الله  بپەرستن ئێوە جگە لەو

[31] [ المؤمنون: ٢٣ ]

پەرستراوێکی ترتان نی یە دەی ئایا خۆتان ناپارێزن.› بۆیە موسڵمان دەبێت تەنها الله تعالى بە پەرستراوی خۆی بزانێت بەتاک و تەنها،

وە بێگومان الله تعالى ئەوەش قبوڵ ناکات کە الله تعالى بە پەرستراوی خۆت بزانێت لەگەڵ ئەوەش دا شێخ بپەرستی یان مەلائیکەت یان پیاوچاک یان دار و بەرد و بت و خۆر و مانگ و پارە و دونیا هتد ..،

بەڵکو دەبێت تەنها الله تعالى بە پەرستراوی خۆت بزانێت لە دڵ و بیرو باوڕت دا ، وە لەقسەکانت دا ، وە لەکردەوەکانت ،

وە پاشان مرۆڤ کاتێک دەبینێت شەو دێت و ڕۆژ دەڕوات و خۆر و مانگ دێت و دەڕوا دەبێت بیربکاتەوە کە ئایە دەبێت زاتێک نەبێت کە ئەم کارانەی بەوردی دارڕژابێت و بەرنامەی بۆ دانابێت ، بێگومان جێگای بیرکردنەوەیە ، وەیان بیر بکاتەوە کە ئایە ئاسمان چۆن دروست بوە وە زەوی چۆن دروست بوە ؟ بێگومان دەبێت زاتێک هەبێت کە ئەو شتانەی دروست کردبێت ،

جا مرۆڤ کاتێک بیر لەو نیشانە و دروست کراوانەوە دەکاتەوە ، ئەوا فەترەتیشی دەجوڵێت و هەستی تەواو دەکات بەو شتانە ،

الله تعالى فەرموویەتی ﴿فَأَقِم وَجهَكَ لِلدّينِ حَنيفًا فِطرَتَ اللَّهِ الَّتي فَطَرَ النّاسَ عَلَيها لا تَبديلَ لِخَلقِ اللَّهِ ذلِكَ الدّينُ القَيِّمُ وَلكِنَّ أَكثَرَ النّاسِ لا يَعلَمونَ﴾[32]واتە : ئەی ئینسان بەدڵێکی پاك و بێگەردەوە) ڕوو بکەرە بەرنامەو ئاینی الله و ئەملاولا مەکە، خەڵکینە ئێوەش پابەندی ئەو نەخشەیە بن کە الله ئێـــــوەی لەسەر دروست کردووە (واتە قورئان کەتەلۆك و نەخشەی ژیانی ئادەمیزادەکانە لێی لامەدەن)، هیچ جۆرە گۆڕانکاریەك لە هیچ نەخـــــــشەو

[32] [ الروم:٣٠ ]

مــتــن

وَالدَّلِيلُ قَوْلُهُ تَعَالَى:يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ – الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الأَرْضَ فِرَاشًا وَالسَّمَاء بِنَاءً وَأَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجَ بِهِ مِنَ الثَّمَرَاتِ رِزْقًا لَّكُمْ فَلاَ تَجْعَلُواْ لِلّهِ أَندَادًا وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ)[البقرة: 21، 22][19].قَالَ ابْنُ كَثِيرٍ ـ رَحِمَهُ اللهُ تَعَالَى: الخَالِقُ لِهَذِهِ الأَشْيَاءَ هُوَ الْمُسْتَحِقُّ لِلْعِبَادَةِ.[20]وَأَنْوَاعُ الْعِبَادَةِ الَّتِي أَمَرَ

دروستکراوێکی الله دا نی یە، ئا ئەوەیە دینی ڕاست و دروست، بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەم ڕاستیانە نازانن.›

بۆیە ناسینی الله تعالی و هەستکردن پێی لەفەترەتی مرۆڤ خۆی دایە ، وە﴿لِلدّينِ حَنيفًا﴾بریتیە لە ڕێگاو ڕێبازی پێغەمبەر ئیبراهیم علیه السلام ، کە دور کەوتنەوە بوو لەشیرک و ڕۆشتن بو بەرەو تەوحید ،

بەڵام هەندێک جار مرۆڤ کەخۆی لەبیر کرد و ئەوەی لەبیرکرد کە بۆی دروست کراوە ، ئەوکات ئەو فەترەتەش لەبیر دەکات و توشی کوفر و ئیلاحاد و زندەقە دەبێت ، پەنابەالله،

[١٩]وە پەروەردگار واتە ئەو زاتەی کە دەپەرسترێت و عیبادەتی بۆ دەکرێت ، بەڵگەش وتەی الله تعالی یە کە فەرموویەتی : ئەی خەڵکینە پەروەردگارتان بپەرستن کەئێوەو ئەوانەی پێش ئێوەشی دروست کردووە بەڵکو بەو پەرستشە خۆتان بپارێزن – ئەو( خوایەی) کەزەوی بۆ ڕاخستوون وە ئاسمانی بۆ کردوون بەکۆشک- ئاسمانی بۆگێڕاون بەگومەزی – وەئاوی(بارانی) لەئاسمانەوە هێناوەتە خوارەوە ئینجا دەری هێناوە بەو ئاوە هەموو جۆرە میوەو بەرێک بۆ ڕۆزیی ئێوە کەواتە هاوتا بۆ الله پەیدامەکەن کەئێوە خۆتان دەزانن بێ هاوتایە.›

## ❁ ڕوونکردنەوە ❁

المعبود ، (مفعول به) یە كە (فعل) ی پەرستنی بەسەرا ئەنجام دراوە ، لەلایان بەندەوە كە (فاعل) ە ، بۆیە پێی دەوترێت المعبود واتا پەرستراو ،

الله تعالى فەرموویەتی﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُوا رَبَّكُمُ﴾ ئەمە قسەكردنە لەگەڵ هەموو مرۆڤەكان بە گشتی ، كافر و موسڵمان و بچوك و گەورە كە الله تعالى فەرمانیان پێدەكات كە پەروەردگاری خۆیان بپەرستن كە (الله یە) جا پەروەردگار كێیە ؟؟﴿الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ﴾ پەروەردگار ئەو زاتەیە كە ئێوە و ئەوانەی پێش ئێوەشی دورست كردوە ،

لێرە كارێكی الله تعالى مان بۆ دردەكەوێت كە ئەویش دروست كردنە ، وە ئەمەش لە توحید الربوبیة یە ، وە سیفاتێكی الله تعالى شمان بۆ دردەكەوێت كە ئەویش الخالق ە كە ئەویش لە توحید الأسماء والصفات ە ،

وە بێگومان هەر ئەوە شایستەیە بی پەرستی كە دروستی كردویت و تۆی لە نەبوونەوە هێناوتە بوون ، نەک كەسێک كە هیچ چاكەیێكی بەسەرتەوە نیە و هاوشێوەی خۆت دروستكراوە ،

﴿لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ لێرەش حیكمەتی دروستكردنی ئێمە بەردەر دەكەوێت كە الله تعالى ئێمەی بۆ ئەوە دروست كردوە كە گوێڕایەڵی الله تعالى بین لە فەرمانەكانی و خۆمان درو بگرین لە قەدەغەكراوەكانی ، وەئەمەش بریتیە لە تەقوا ، وە ئەمەش حیكمەتی دروستكردنی مرۆڤە ،

پاشان الله تعالى هەندێک لە نیعمەت و كارەكانی خۆی باس دەكات و دەفەرموێت﴿الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ فِرَاشًا﴾ ئەو پەروەردگارەی كە زەوی بۆ ئێوە ڕاخستوە و پانی كردۆتەوە ، تا لەسەری ڕێبكەن بەئاسانی و بەبێ ئەزیەت ، وە ئەمەش كاری الله تعالى یە ،

پاشان دەفەرمویت﴿وَالسَّمَاءَ بِنَاءً﴾ وە ئەو پەروەردگارەی کە ئاسمانی بۆ ئێوە ڕاگرتوە بەسەرتانەوە

﴿وَأَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً﴾ وە ئاو و بارانی لە ئاسمانەوە بۆ ئێوە دابەزاندوە و باران دویەتی بەسەر تان دا و بەسەر زەوی دا ، جا حیکمەتی ئەم باران بارینە لە چی دایە ؟؟الله تعالی فەرمویەتی﴿فَأَخْرَجَ بِهِ مِنَ الثَّمَرَاتِ رِزْقًا لَكُمْ﴾حیکمەتەکەی ئەوەیە کە بەو باران باراندنە بەسەر زەوی دا لە زەوی بەرو بوم و کشتوکاڵ و سەوزایی و میوە دەردەچێت بۆ مرۆڤ تا پێی بژێیت و پێوەی بە ڕێوە بچێت ، لێ بخوات و سودی لێوەربگرێ ،

﴿فَلَا تَجْعَلُوا لِلَّهِ أَنْدَادًا﴾ جا ئەی مرۆڤ هیچ شتێک مەکە بە هاوشێوەی الله تعالی ، لێرە پرسیارێک دروست دەبێت کەئایە چۆن هیچ شتێک نەکەم بە هاوشێوەی الله تعالی ؟؟ لەوڵامدا ئەوەیە کە وا نەزانێت کەکەسێک هەیە لەغەیری الله تعالی ڕزقت دەدات یان دروستی کردوی یان بارانی بۆ باراندوی ، بەڵکو دەبێت الله تعالی بە دور بگری لەوەی کە هاوشێوەی بۆ دابێنێت لە کارەکانی دا ،

جا لەوەیە کەسێک بڵێت جاکێ کاری وا دەکات وهاوشێوەبۆ الله تعالی دادتنێت ؟؟،

لەوڵام دا بێگومان کەسانێک هەن کە ئەو کارە دەکەن ، نمونەی ئەو کەسانەی کە داوا لە مردوەکان و بتەکان دەکەن کە بارانیان بۆ ببارێنن یان وا دەزانن ڕزقی ئەوان لە دەست کەسێکی ترە کە گەر ئەو ڕزقی نەدات ئەوە دەمرێت لەبەرسا یان گەر کار و کاسبیەکەی نەمێنێت دەمرێت لەبرسا ، جا ئەمانە هەموو شیرکی (انداد ن) کە بەمانای هاوشێوە کردن دێت ،

مـتـن

اللهُ بِـهَا مِـثْلُ: الإِسْـلامِ، وَالإِيـمَانِ، وَالإِحْـسَانِ، وَمِـنْهُ: الدُّعَاءُ، وَالْخَوْفُ، وَالـرَّجَاءُ، وَالـتَّوَكُّلُ، وَالـرَّغْبَةُ، وَالـرَّهْبَةُ، وَالْخُشُـوعُ، وَالْخَـشْيَةُ، وَالإِنَابَةُ، وَالاسْتِـعَانَةُ، وَالاسْـتِعَاذَةُ، وَالاسْتِـغَاثَةُ، وَالـذَّبْحُ، وَالـنَّذْرُ، وَغَيْرُ ذَلَكَ مِنْ أَنْوَاعِ الْعِبَـادَةِ الَّتِي أَمَرَ اللهُ بِهَا. كُلُّهَا للهِ تَعَالَى.وَالدَّلِيلُ: قَوْلُهُ تَعَالَى: (وَأَنَّ الْمَسَاجِدَ لِلَّهِ فَلاَ تَدْعُوا مَعَ اللَّهِ أَحَدًا)[الجن: 18]. فَمَنْ صَرَفَ مِنْهَا

وە مەرج نیە كەسەكە بڵێت ئەوە ڕزقم دادەت ، بەڵكوو بەكردار وا دەڵێت ، وەك ئەوەی دەچێت داوا لە پیاوچاكان دەكات بارانی بۆ ببارێنن ، جا ئەمە شیركی انداد ە ، ئەگەر چی كەسەكە بڵێت ئەمە خوا نیە ، بەڵام مادام بەكردار وای كرد یان بەقسە وای وت ئەوە كردویەتی بە هاوشێوە ، گەرچی بیرو باوەڕی بەوە نەبێت كە پیاو چاكەكە خوابێت ، پاشان الله تعالى فەرموویەتی﴿وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ واتە كەس مەكەن بە هاوشێوەی الله لەكاتێك دا دەزانن كە هەر الله تعالى ئێوەی دروست كردوە و هەر ئەو بارانی بۆ دابەزاندون و ڕزقی داون و زەوی و جێگای پێ بەخشیون ،كەس مەكەن بە شەریك و هاوشێوەی ئەو ، وە ئەمەش قەدەغەكردنێكە لە شیرك و انداد ،

[٢٠]ابن كثير فەرموویەتی : دروستكەری ئەم شتانە شایستەی پەرستنە ،

۞ **ڕوونكردنەوە** ۞

ابن كثير پێشەوایكی گەورەی موفسیرین ە كە خاوەنی كتاب التفسير ابن كثير ە كە كتاب ەكەی وەك هەندێك لە زانایان دەڵێن باشترین تەفسیر تەفسیری ابن كثير ە،ناوی خۆی اسماعيل كوڕی عمر ە ،

ئیمام دەفەموێت دروستكەری ئەو شتانە كە ڕاخستی زەویە و ڕاگری ئاسمانە و ڕزق دەر و باران بارێنەرە ،هەر ئەو شایستەی ئەوەیە كە بپەرسترێت ، نـــەك

مـتـن

شَيْئًا لِـغَيْرِ اللهِ؛ فَهُوَ مُشْـرِكٌ كَـافِرٌ؛ وَالدَّلِيلُ: قَوْلُهُ تَعَالَى:( وَمَن يَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ لاَ بُرْهَانَ لَهُ بِهِ فَإِنَّمَا حِسَابُهُ عِندَ رَبِّهِ إِنَّهُ لاَ يُفْلِحُ الْكَافِرُونَ) [المؤمنون: 117].وَفِي الْحَدِيثِ: ( الدُّعَاءُ مخ الْعِبَادَةِ )[21]........................
..................................................................................................
..................................................................................................

کەسێک کە هیچ منەت و چاکەیکی بەسەر تۆوە نیە تۆ بچی بیپەرستی ، چونکە ئەوە بەکەم دانانی خۆتە ، وە شەریک بڕیاردانە بۆ الله تعالى،

[٢١]وە جۆری ئەو عیبادەتانەی کە الله تعالى فەرمانی پێکردوە ، نمونەی ئیسلام و ئیمان و ئیحسان ، وە الدعاء والخوف والرجاء والتوكل والرغبة والرهبة والخشوع والخشية والإبانة والأستعانة والأستعاذة والأستغاثة والذبخ والنذر ، وە جگە لەوانەش لەو عیبادەتانەی کە الله تعالى فەرمانی پێکردوە کە هەموویان بۆ الله تعالى ئەنجام بدەی ،

وەک الله تعالى فەرموویەتی : دڵنیابن کە: مزگەوتەکان تایبەتی الله تعالى ن، دەبێت هەر ئەوەی تێدا بپەرسترێت و ناوی کەسی تر نەکرێتە شەریك و هاوتای ناوی ئەو زاتە.›

هەر کەسێک یەکێک لەم جۆرە عیبادەتانە ئەنجام بدات بۆ غەیری الله تعالى ئەوە پێی دەبێت بە موشریک و کافر دەبێت ،

بەڵگەش الله تعالى فەرموویەتی:ئەو کەسەی خوایەکی تر بڕیار بدات و بیکاتە شەریکی الله ، لە کاتێکدا کە هیچ بەڵگەیەکی بە دەستەوە نیە، ئەوە بە ڕاستی حساب و لێپرسینەوەی لای پەروەردگاریتی، بێگومان الله تعالى کافران سەرفراز نابن.›

وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتیک:دوعا مۆخی عیبادەتە ،

**❁ ڕوونکردنەوە ❁**

جۆری عیبادەت زۆرە بەڵام شێخ چەند عیبادەتێکی باسکردوە ، وە ئێمە لێرە باسی ئیسلام و ئیمان و احسان ناکەین ، چونکە لە بنچینەی دووەم شێخ باسی کردوە ، بەڵام لێرە تەنها ئەوە دەزانین کە ئەوانیش عیبادەتن ،

جا بە هیچ شێوەیێک نابێت هیچکام لەو عیبادەتانە بۆ غەیری الله تعالی ئەنجام بدرێت ،

الله تعالی فەرموویەتی﴿وَأَنَّ الْمَسَاجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُوا مَعَ اللَّهِ أَحَدًا﴾[33] واتە :دڵنیابن کە: مزگەوتەکان تایبەتی الله تعالی ن، دەبێت هەر ئەوەی تێدا بپەرسترێت و ناوی کەسی تر نەکرێتە شەريك و هاوتای ناوی ئەو زاتە.›

بۆیە هەر چی عیبادەت هەیە دەبێت تەنها بۆ الله تعالی ئەنجام بدرێت بەتاک و تەنها ، جا هەر کەسێک یەکێک لەم عیبادەتانە بۆ غەیری الله تعالی ئەنجام بدات ئەوە موشریک دەبێت لە دین دەر دەچێت ،

وەک الله تعالی فەرمووویەتی﴿وَمَنْ يَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ لَا بُرْهَانَ لَهُ بِهِ فَإِنَّمَا حِسَابُهُ عِنْدَ رَبِّهِ ۚ إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الْكَافِرُونَ﴾[34]واتە :ئەو کەسەی خوایەکی تر بڕیار بدات و بیکاتە شەریکی الله ، لە کاتێکدا کە هیچ بەڵگەیەکی بە دەستەوە نیە، ئەوە بە ڕاستی حساب و لێپرسینەوەی لای پەروەردگارێتی، بێگومان بێ باوەڕو الله نەناسان سەرفراز نابن.›

[33] [ الجن:١٨]

[34] [ المؤمنون:١١٧ ]

جا دیقەت بدە ئەو کەسەی کە عیبادەتی بۆ غەیری الله تعالی کرد یان داوای لە غەیری الله تعالی کرد لە شتێک دا کە تەنها مافی الله تعالی یە ، ئەوە الله‌تعالی ئەو کەسەی بەکافر ناوبرد و بەکافری دانا وەک فەرمووی﴿إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الْكَافِرُونَ﴾جا بۆیە بە هۆی ئەوە کارەیانەوە کافر بوون ،

وە ئەو فەرموودەی شێخ هێناویەتی لاوازە بەڵام ئەمەیان صحیح ە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی﴿الدُّعاءُ هوَ العبادةُ﴾[35] واتە : دوعا بریتیە لە عیبادەت ›

جا دوعا دوو جۆرە ،

جۆری یەکەم بریتیە لە پێدا هەڵدان و سوپاس کردن کە بریتیە لە دوعای عیبادەت ، بۆ نمونە کەسێک نوێژ دەکات ئەوە ئەو نوێژە پێدا هەڵدان و گەوریی تێدایە بۆ الله تعالی لە نوێژەکە دا یان حەج دەکات ئەوە پێدا هەڵدان و سوپاس و ستایشی الله تعالی یە ، بۆیە پێی دەوترێت دوعای عیبادەت ، بەڵگەش پێغەمبەر ﷺ فەرمـــوویەتی ﴿أَفْضَلُ الذِّكْرِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ ، وَأَفْضَلُ الدُّعَاءِ الحَمْدُ لِلَّهِ﴾[36]واتە : گەورەترین زیکر وشەی لااله الاالله یە ، وە گەوەرەترین دوعاء الحمدلله یە.›

جا هەکەسێک کە عیبادەتێک ئەنجام دادەت بۆ الله تعالی ئەوە پێی دەوترێت دعاء العبادة ،

---

[35] [ أخرجه أبو داود،والترمذي،وابن ماجة ]

[36] [ راوه الترمذی وحسنه الألبانی ]

متن

وَالدَّلِيلُ: قَوْلُهُ تَعَالَى: ( وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ)[غافر: 60].[22]وَدَلِيلُ الْخَوْفِ: قَوْلُهُ تَعَالَى: ( فَلاَ تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ) [آل عمران: 175].[23]وَدَلِيلُ الرَّجَاءِ: قَوْلُهُ تَعَالَى: (فَمَن كَانَ يَرْجُو لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلاً صَالِحًا وَلاَ يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا )[الكهف: 110].[24]

جۆری دووەم : بریتیە لە دوعای پاڕانەوە و داواکردنی شت ، وەک داواکردنی ڕزق و ماڵ ، یان بەهەشت و دۆزەخ ، وەک پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی﴿اللَّهمَّ إنِّي أسألُكَ الجنَّةَ وما قرَّبَ إليها من قولٍ وعملٍ وأعوذُ بكَ منَ النَّارِ وما قرَّبَ إليها من قولٍ أو عملٍ﴾[37]واتە : یاالله من داوای بەهەشتت لێدەکەم وە داوای ئەوشت لێدەکەم کە نزیکم دەکاتەوە لەبەهەشت لە وتە و کردەوە ، وە پەنات پێدەگرم لە دۆزەخ وە پەنات پێدەگرم لەوەی لە دۆزەخ نزیکم دەکاتەوە لە وتە و کردەوە ›

ئەمەش هەر دوو جۆری دوعا یە ، کە الله تعالی قەدەغەی کردوە لە مروڤ و جنەکان کە لەبەرامبەر غەیری الله تعالی ئەنجامی بدەن ،

[٢٢]الدعاء : داوکردن (پاڕانەوە) ، بەڵگەش الله تعالی:ئەی خەڵکینە پەروەردگارتان فەرموویەتی: ئێوە هاناو هاوار بۆمن بهێنن؛ ئەوە من دوعاو نزاتان گیرا دەکەم، بەڕاستی ئەوانەی خۆیان بەگەورە دادەنێن ولووت بەرزی دەکەن لەئاستی پەرستنی مندا، لەئاییندەدا بەسەرشۆڕی و خەجاڵەتی یەوە دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە.›

۞ ڕوونکردنەوە ۞

[37] [ رواه المسلم ]

داواکردن عیبادەتە وە یەکێک لە گەورەترینی عیبادەتەکان لەبەر ئەوەی فەرموویەتی﴿إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي﴾ ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی داواکاردن عیبادتە، هەر بۆیەش جائیزنیە بە هیچ شێوەیێک داوا لە غەیری الله تعالی بکرێت بۆ شتێک کە تەنها الله تعالی دەتوانێت ئەنجامی بدات وەک بەرکەت کەوتنە ڕزق و شیفا دان و باران بارین و غەیری ئەوانەش لەوشتانەی کە تەتها الله تعالی دەتوانێت بیبەخشێت و مرۆڤ توانای بەسەر دا نیە ،

جا ئەگەر کەسێک داوای لە غەیری الله تعالی کرد تا سودێکی پێ بگەینێ وە یان زیانێکی لێ لا بدات کە کەس ناتوانێت ئەنجامی بدات لەغەیری الله تعالی ئەوە شیرکی گەورەیە و خاوەنەکەی پێی موشریک دەبێت ،

الله تعالى فەرموویەتی﴿إن تَدعوهُم لا يَسمَعوا دُعاءَكُم وَلَو سَمِعوا مَا استَجابوا لَكُم وَيومَ القِيامَةِ يَكفُرونَ بِشِركِكُم وَلا يُنَبِّئُكَ مِثلُ خَبيرٍ﴾[38]واتە: ئەگەر نزاو هاواریان لێ بکەن هاوارەکەتان نابیستن و ئەگەر بیشی بیستن وەڵامتان نادەنەوە و لەڕۆژی قیامەتیشدا بێ باوەڕ دەبن بەهاوبەش دانانەکەتان (و بە درۆتان دەخەنەوە) وە دڵنیابە کەس وەك ( الله ی) ئاگادار ئاگادارت ناکات لەسەرئەنجامتان.›

[٢٣]الخوف : ترسان بەڵگەش الله تعالی فەرموویەتی : ئێوە لێیان مەترسن وە لە من بترسن ئەگەر ئێوە بڕوادارن.›

## ❁ ڕوونکردنەوە ❁

ترسان دوو جۆرە

[38] [ فاطر:١٤ ]

یەکەم : ترسانی ئاسایی دووەم ترسانی عیبادەت ،

یەکەم : ترسی ئاسایی وەک ترسان لە ئاژەڵە دڕندەکات کە زیان بە مرۆڤ دەگەیێنن بإذن الله یان ترسان لە مردن یان ترسان لە خنکان یان ترسان لە کوژتن هەموو ئەوانە ترسێکن کە ئاسایین مرۆڤ لێی بترسێت ،

وەک پێغەمبەر موسا کە ترسا فیرعەون بیکوژێت چونکە یەکێک لە پیاوەکانی فیرعەونی کوژت ، الله تعالی فەرمووی﴿فَخَرَجَ مِنْهَا خَائِفًا يَتَرَقَّبُ ۖ قَالَ رَبِّ نَجِّنِي مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾[39]واتە:موسا لە شار دەرچوو بەترس و بیمەوە، هەر سەیری ئەملاو ئەولای خۆی دەکرد، لەبەر خۆیەوە دەیوت: پەروەردگارا لە دەست قەومی ستەمکار ڕزگارم بکە.›

جا ئەمە ترسێکی ئاسایی و شیرک نیە ، بەڵام جۆری دووەم شیرکە ، کە بریتیە لەوەی بترسیت لەوەی بتێک یان قەبرێک زیانت پێ بگەیێنی یان نەخۆشت بکات یان منداڵت بکوژێت یان توشی ڕوداو وحادیسەت بکات ، ئەم جۆرەیان شیرکە چونکە کەس ناتوانێت ئەوانە بکات تەنها الله تعالی نەبێت ،

وە ئەم جۆرە بیرو باوەڕە بیرو باوەڕی موشیکانە کاتێک بە پێغەمبەر هودیان وت ﴿إِنْ نَقُولُ إِلَّا اعْتَرَاكَ بَعْضُ آلِهَتِنَا بِسُوءٍ ۗ قَالَ إِنِّي أُشْهِدُ اللَّهَ وَاشْهَدُوا أَنِّي بَرِيءٌ مِمَّا تُشْرِكُونَ﴾[40] واتە:ئێمە هیچ ناڵێین ئەوە نەبێت: وا دیارە هەندێ لە خواکانمان بەخراپ دەستیان لێ وەشاندوویت!! هود وتی: دەی من بەڕاستی الله دەکەم بەشایەت و ئێوەش بەشایەت بن کە بێگومان من بەریم لەوەی ئێوە دەیکەنە شەریك و هاوەڵ بۆ الله .›

[39] القصص:٢١

[40] هود:٥٤

مــتــن

وَدَلِيلُ التَّوَكُلِ:قَوْلُهُ تَعَالَى: وَعلَى اللّهِ فَتَوَكَّلُواْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ)[المائدة:23].وقـوله:(وَمَن يَتَوَكَّلْ علَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ)[الـطلاق:3].[25]وَدَلِيلُ الـرَّغْبَةِ، وَالـرَّهْبَةِ، وَالْـخُشُوعِ: قَوْلُـهُ تَعَالَى:(إِنَّـهُمْ كَانُـوا يُسَارِعُونَ فِـي الْـخَيْرَاتِ وَيَـدْعُونَنَا رَغَـبًا وَرَهَـبًا وَكَانُـوا لَـنَا خَاشِعِينَ)[الأنبياء:90].[26] وَدَلِيلُ الْخَشْيَةِ: قَوْلُهُ تَعَالَى:(فَلاَ تَخْشَوْهُمْ وَاخْشَوْنِى)[البقرة:150].[27]

[٢٤]الرجاء : ئومێد ، بەڵگەش الله تعالى فەرموویەتی :جا هەر کەس ئومێدی هەیە کە بەخزمەت پەروەردگاری بگات (لە قیامەتدا) ئەوە با کردەوەی چاك بکات وەك لە پەرستنی پەروەردگاری دا کەس نەکات بەهاوبەشی.›

۞ ڕوونکردنەوە ۞

ئومێد کردن بەوەی الله تعالى بتخاتە بەهشتەوە ، ئەم ئومێدە دروست نابێت بەبێ کردار چونکە الله تعالى فەرموویەتی ﴿فَمَنْ كَانَ يَرْجُو لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا﴾یانی هەر کەسێک دەیەوێت بگات لیقای پەروەدگاری ئەوە باکردەوەی چاکە ئەنجام بدات ، ئەمەش بەڵگەیە کە ئومێد کردن بەبێ کردەووە نابێت بەڵکوو دەبێت کردەوەی چاکە بکات و ئومێدی هەبێت کە الله تعالى بیخاتە بەهەشتەوە چونکە الله فەرموویەتی﴿فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا﴾ واتە : ئەوە باکار و کردەوەی چاکە ئەنجام بدا .

[25]التوكل : پشت بەستن ،بەڵگەش اللهتعالى فەرموویەتیک : وەپشت هەر بە الله ببەستن ئەگەر ئێوە باوەڕدارن.›

۞ ڕوونکردنەوە ۞

دورست نیە پشت ببەستیت لە کارەکان بەغیری الله تعالى ، وە پشت بەستن سیفاتی ئیماندارانە ،

الله تعالى بەمەرجی ئیمانداری داناوە وەک فەرموویەتی﴿إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾ بۆیە نابێت پشت بەغەیری الله تعالى بەستیت ،

وە پشت بەستن لە دوای ئەنجامدانی هۆکارەکانە ، وەک ئەوەی کەسێک کشت و کاڵ دەچێنێت و ئاوی دەدات و خزمەتی دەکات ، پاشان پشت بە الله دەبەستێت تا شینی بکات و بیڕوێنێت ، وە پشت بەستن بەبێ گرتنی هۆکارەکان کارێکی هەڵەیە ، بەڵکو دەبێت هۆکارەکان ئەنجام بدەیت و پشت بە الله تعالى ببەستیت بۆ سەر ئەنجامەکەی ،

[٢٦]الرغبة : ئومێد وهیوا ، الرهبة : ترسان ، والخشوع : زلیل و ملکەچی ، بەڵگەش اللهتعالى فەرموویەتی :ئەوانە (ی باسکران لە پێغەمبەران) پێشبڕکێیان دەکرد لە (ئەنجامدانی) هەموو خێرو چاکەیەکدا و هاواریان لە ئێمە دەکرد بە ئومێدی (بەهەشت) و لە ترسی (دۆزەخ) وە ئەوان ملکەچ بوون بۆ ئێمە (دەترسن) لێمان.›

۞ ڕونکردنەوە ۞

ترسان و ئومێد بون لە قبوڵ کردنی کردەوەکانە ، موسڵماندەبێت هەموو کات لەو حاڵەتە دابێت کە کاتێک کارێک ئەنجام دەدات ئەوە ترسی هەبێت کە لێی قبوڵ نەکرێت ، وە لە هەمان کاتدا ئومێد و هیوای هەبێت کە الله تعالى لێی قبوڵ دەکات ،

واتا نە بێمەنەت بێت و گوێ نەدات بەوەی لێی قبوڵ ناکرێت ، نە هێندەش بترسێت کە عیبادەت نەکات چونکە لێی قبوڵ ناکرێت ،

ئەمە ڕێکخستنی تەوازنی بەندەیە لە ئەنجامدانی عیبادەتەکان ، وەک الله تعالى فەرموویەتی﴿تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ يَدعونَ رَبَّهُم خَوفًا وَطَمَعًا وَمِمّا

رَزَقناهُم يُنفِقونَ﴾[41] واتە:تەنشتیان دوور ئەكەوێتەوە لە جێگای خەوتنیان (لەخەو هەڵدەسن شەو نوێژ دەكەن) هاوارو نزا لە پەروەردگاریان دەكەن بەترس و هیواوە و لەو ڕۆزی و سامانەی پێمان داون دەبەخشن.›

وە زەلیل و ملكەچی بۆ فەرمانەكان و ڕێگریەكانی الله تعالی ، بەندە دەبێت هەموو كات ملكەچ و كزۆڵ بێت لەبەر دەم الله تعالی .

الله تعالی لەباسی ئیمانداران دەفەرموێت﴿الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ﴾[42] واتە:ئەوانەش ئەوانەن كە لە نوێژەكانیاندا ملكەچ و دڵ ئارام و دڵ دامەزراون و دڵیان لای الله یە.›

زلیل و ملكەچی جۆرێكە لە عیبادەتەكان كەدەبێت هەمیشە لە بەندە داهەبێت لەبەرامبەر الله تعالی ، نەک خۆی بە گەورە بزانێت و عیناد بێت .

[٢٧] الخشية : ترسان ، بەڵگەش الله تعالی فەرموویەتی : لێیان مەترسن و لە من بترسن›

۞ ڕوونكردنەوە ۞

ئەم جۆری ترسانە بنیات ناراوە لەسەر دڵنیایی و یەقین و گەورەیی ئەو شتەی كە لێ ترساوە و لێی دەترسێت ،

الله تعالی فەرموویەتی ﴿إِنَّما يَخشَى اللَّهَ مِن عِبادِهِ العُلَماءُ﴾[43] واتە: بەڕاستی لەناو بەندەكانی الله تەنیا زانایان (وەك پێویست) لە الله دەترسن بێگومان الله زاڵی لێبوردەیە.›

[41] [ السجدە:١٦ ]
[42] [ المؤمنون:٢ ]
[43] [ فاطر:٢٨ ]

متن

وَدَلِيلُ الإِنَـابَةِ: قَـوْلُهُ تَعَالَى:(وَأَنِيبُوا إِلَى رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا لَهُ) [الزمر: 54]. [28]وَدَلِـيلُ الاسْـتِـعَانَـةِ: قَـوْلُهُ تَعَـالَـى: ( إِيَّاكَ نَـعْبُدُ وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ) [الفاتحة: 5].وَفِـي الْـحَـدِيثِ: (وإِذَا اسْتَعَنْتَ فَاسْتَعِنْ بِاللهِ)[29]وَدَلِيلُ الاسْتِعَاذَةِ: قَوْلُهُ تَعَالَى: ( قُـلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ ) [الفلق: 1]. و(قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ)[الناس:1].[30]وَدَلِيلُ الاسْتِغَاثَةِ: قَوْلُهُ تَعَالَى(إِذْ تَسْتَغِيثُونَ

زانایان الله تعالی دەناسن و ئەوان بە زانستەوە لە الله تعالی دەترسن وە گەورەیی و یەقین بە هۆی هەبوونی زانستەوە دەست دەکەوێت بۆیەش زاناکان زیاتر لە الله تعالی ،

[٢٨]الإنابة : گەڕانەوە پەشیمان بونەوە ،بەڵگەش الله تعالی فەرموویەتی:هەوڵ بدەن هەمیشە و بەردەوام دڵتان لایٚ الله بێت و بگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگارتان و تەسلیمی ئەوبن،

۞ ڕوونکردنەوە ۞

گەڕانەوە بۆ لای الله تعالی بە دڵ و لاشەوە و ئەنجامدانی کردەوەی چاکە ،وە واز هێنا لە کاری خراپە و ڕۆشت بەرەو کاری باشە و چاکە ، وە تەسلیم بون بۆ الله تعالی و گەڕانەوە بە پەشیمان بونەوە بۆ لای الله تعالی ،کەئەمەش عیبادەتە

الله تعالی فەرموویەتی﴿وَالَّذينَ اجتَنَبُوا الطّاغوتَ أَن يَعبُدوها وَأَنابوا إِلَى اللَّهِ لَهُمُ البُشرى فَبَشِّر عِبادِ﴾[44]واتە : وە کەسانێ کە لە پەرستنی بت (و هەموو پەرستراوێکی تر) خۆیان پاراستووە وە گەڕاونەتەوە بۆ لای الله مژدەی گەورە تەنیا بۆ ئەوانە کەواتە مژدە بدە بە بەندەکانم.›

[44] الزمر:١٧

[٢٩]الإستعانة : داواکردنی یارمەتی ، بەڵگەش الله تعالى فەرموویەتی : یا الله تەنها تۆ دەپەرستین وە تەنها لە تۆ داوای یارمەتی دەکەین» وە لەفەرموودەش دا هاتوە پێغەمبەر فەرموویەتی : ئەگەر داوای یارمەیتت کرد ئەوە داوا لە الله تعالى بکە[45]،›

۞ ڕوونکردنەوە ۞

الله تـعـالـى فەرمـوویەتـی﴿قـالَ مـوسـى لِـقَـومِـهِ اسـتَـعـيـنـوا بِـاللَّهِ وَاصـبِروا﴾[46]واتە:مووسا بە گەلەکەی وت داوای یارمەتی لە الله بکەن و خۆ ڕاگر بن ›

جاداوای یارمەتی کردن چوار جۆرە دوانیان دروستە وە دونیان دروست نیە ،

یەکەم داواکردنی یارمەتی لە الله تعالى ، ئەمەش بریتیە لە عیبادەت ،

دووەم داواکردنی یارمەتی لە کەسی زیندوو بۆ شتێک کە لە توانای دا هەیە ئەنجامی بدات ، ئەمەش ئاساییە و دروستە ،

سێیەم داواکردی یارمەتی لە کەسی مردو ئەمەیان دروست نیە و شیرکی گەورەیە ،

چوارەم ، داواکردنی یارمەتی لە کەسی زیندوو بۆ شتێک کە لە توانای مرۆڤ دانیە ئەنجامی بدات ئەمەش شیرکی گەورەیە و دروست نیە.

[٣٠]الإستعاذة : پەناپێگرتن ،بەڵگەش الله تعالى فەرموویەتی : بڵێ: پەنا دەگرم بە پەروەردگاری خەڵکی.›

[45] [ راوه الترمذي،رقم/٢٥١٦]

[46] [ الأعراف:١٢٨]

## ۞ ڕوونكردنەوە ۞

جائیز نیە بە هیچ جۆرێک پەنا بەغەیری الله تعالى بگرترێت ،

وە پەناگرتن بریتیە لە خۆدانە پاڵ شتێک تا بت پارێزێت لە شەڕ و خراپەی شتێکی تر ، نمونەی ئەو کەس پەنا بە الله تعالى دەگرێت لە شەڕ و فێڵی شەیتان،

جا هەرکەسێک پەنابە شتێک بگرێت لە غەیری الله تعالى ئەوە شیركی گەورەی ئەنجام داوە و بەهۆیەوە دەبێت بە موشریک ،

الله تعالى فەرمانی بە بەندەكانی كردوە كە تەنها پەنا بەالله تعالى بگرن ، وەک فەرمویەتی﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ﴾[47]:واتە : بڵێ: پەنا دەگرم بە پەروەردگاری خەڵكی.›

وەفەرموویەتی﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ﴾[48]واتە: بڵێ: پەنا دەگرم بە دروست كەری بوونەوەر واتە بەرەبەیان.›

الله تعالى فەرمانی بەوە كردوە كە تەنها پەنا بەخۆی بگرترێت ، بۆیە دەبێت سیفاتی ئیمانداریش وابێت ، نەک وەک موشریكەكان بێت ، كە الله تعـــالى لە بارەیانەوە فەرموویەتی﴿وَأَنَّهُ كَانَ رِجَالٌ مِنَ الإِنسِ يَعوذونَ بِرِجالٍ مِنَ الجِنِّ فَزادوهُم رَهَقًا﴾[49] واتە:بەڕاستی پیاوانێك لە ئادەمیی پەنایان دەبردە بەر پیاوانێك لە جنۆكە (كە بیان پارێزن) كەچی زۆرتر ماندوویان دەكردن.›

[47] [الناس:١]
[48] [الفلق:١]
[49] [الجن:٦]

مـتـن

رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَـكُـمْ)الآية[الأنفال: 9].[31]وَدَلِـيلُ الـذَّبْـحِ: قَـوْلُهُ تَعَالَى: ( قُلْ إِنَّـنِي هَـدَانِي رَبِّـي إِلَـى صِـرَاطٍ مُّـسْتَقِيمٍ دِيـنًا قِيَمًا مِّلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ - قُلْ إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ - لاَ شَرِيكَ لَه وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ)[الأنعام: 161ـ163]. وَمِنَ السُّنَّةِ:(لعَنَ اللهُ مَنْ ذَبَحَ لِغَيْرِ اللهِ).[32]ودليل النذر: قوله

وە ئەمەش شیرکە بۆیە هەرکەسێک پەنا بەرێتە بەر شێخ و قەبر و دار و بردن و پەڕۆ و بت و غەیری ئەویش لە غەیری الله تعالی ئەوە شیرکی گەورەی ئەنجام داوە ، وە پێی لە ئیسلام دەردەچێت ،

[٣١] الإستغاثة : داوکردنی فریاکەوتن ، بەڵگەش الله تعالی فەرموویەتی : یادی ئەوکاتە بکەنەوە کەلە پەروەردگارتان دەپاڕانەوە و داوای یارمەتیتان لێ دەکرد، الله هات بە هاناتانەوە›

۞ ڕوونکردنەوە ۞

الإستغاثة بریتیە لە داوکردنی فریاکەوتن لەکاتێکی تەنگانە دا کە یەکێکە لە گەورەترین عیبادەتەکان ،

وە جیاوازی نیوان الإستعانة و الإستغاثة ئەوەیە.،

یەکەم بریتیە لە داواکردنی یارمەتی کە لە هەموو کاتێک دا دەکرێت ،

بەڵام دووەم تایبەتە بە کاتی تەنگانە و نارەحەتی ،

داواکردنی فریاکەوتن ، چوار جۆرە هاوشێوەی الإستعانة ،

یەکەم : داواکردنی فریا کەوتن لە الله تعالی ئەمەش عیبادەتە ،

دووەم : داواکرنی فریاکەوتن لەکەسێکی زیندوو کە بتوانێت ڕزگارت بکات لەو حاڵەی تێیدای بۆنمونە کەسێک لە ناو ڕوبارێک دا خەریکە دەخنکێت لەو کاتەیا ئەو کەسەی خەریکە دەخنکێت کەسێک دەبینێت لە دەروی ڕوبارەکە و دەوای لێدەکات فریایی بکەوێت ، وە ئەمەش دروستە  چونکە مرۆڤ دەتوانێت مرۆڤ لەخنکان ڕزگار بکات بإذن الله ، وە ئەمەش دروست و جائێزە وەک چۆن پێغەمبەر موسا (علیه السلام) کاتێک پیاوێک لە بەنوئیسرائیل شەڕی دەکرد لەگەڵ یەکێک لە پیاوانی فیرعەون ، لەوکاتەیا پیاوەکەی بەنو ئیسرائیل داوای فریاکەوتنی لە پێغەمبەر موساکرد و ئەویش بەدەمیەوە چو و فریایکەوت ،

الله تعالى فەرموویەتی﴿وَدَخَلَ الْمَدِينَةَ عَلَىٰ حِينِ غَفْلَةٍ مِنْ أَهْلِهَا فَوَجَدَ فِيهَا رَجُلَيْنِ يَقْتَتِلَانِ هَٰذَا مِنْ شِيعَتِهِ وَهَٰذَا مِنْ عَدُوِّهِۖ فَاسْتَغَاثَهُ الَّذِي مِنْ شِيعَتِهِ عَلَى الَّذِي مِنْ عَدُوِّهِ فَوَكَزَهُ مُوسَىٰ فَقَضَىٰ عَلَيْهِۖ قَالَ هَٰذَا مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِۖ إِنَّهُ عَدُوٌّ مُضِلٌّ مُبِينٌ﴾[50]واتە : موسا) لەکاتی غەفڵەتی خەڵکی شاردا خۆی کرد بە شەقام و بازاردا، بینی دوو پیاو شەڕ دەکەن، ئەمەیان لە تایفەی خۆیەتی و ئەمەشیان لە دەستەی دوژمنەکەیەتی (سەربازی فیرعەونە)، ئەوەی خزمی خۆی بوو موسای بینی هاواری لێکرد کە فریای بکەوێت و زاڵی بکات بە سەر دوژمنەکەیدا، موساش بەپەلە چوو بەدەمیەوە بۆکزەکی ماڵی بە کابرای (قبطی دا)و کوشتی، موسا پەشیمان بۆوە لەبەر خۆیەوە وتی: ئەم کارە شەیتان پێی کردم (من نەمدەویست بیکوژم) بە ڕاستی شەیتان دوژمنێکی گومڕاو ئاشکرایە ›.

[50] [القصص:١٥]

سێیەم : داواکردنی فریا کەوتن لە کەسێکی زیندوو لە شتێک دا کە ناتوانێت یارمەتیت بدات ، وەک کەوتنە خواردوە یان غەیری ئەویش لەو شتانەی کە لە توانای هیچ شتێک دانیە ڕزگارت بکات تەنها الله تعالی نەبێت،

چوارەم : داواکردنی فریاکەوتن لە مردوو بۆ ئەوەی فریات بکەوێت ئەمەش بەهیچ جۆرێک جائیز نیە و شیرکە ،

[٣٢]الذبح : قوربانی کردن ،بەڵگەش اللهتعالی فەرموویەتی:.ئەی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم) بڵێ بێگومان نوێژ و (بەندایەتی) و قوربانی و ژیان و مردنم هەر بۆ الله ی پەروەردگاری هەموو جیهانیانە.›وە لەفەرموودەش دا هاتوە پێغەمبەر فەرموویەتی : لە عنەتی الله تعالی لەوکەسەبێت کە ئاژەڵ بۆ غەیری اللهتعالی سەردەبڕێت[51] ›

❁ ڕونکردنەوە ❁

سەربڕین دوو جۆرە ،

یەکیان بریتیە لەگەورەترین عیبادەت ، وەیەکیان بریتیە لە گەورەتریت شریک،

جا هەر قوربانیێک لە پێناو غەیری الله تعالی بکرێت ئەوە شیرکە و خاوەنەکەی پێ موشریک دەبێت ، بۆیە نابێت لە پێناو شێخەکان وجنەکان و بتەکان و مەسئول و سەرۆکەکان سەر ببڕدرێت چونکە جائیز نیە و شیرکە قوربانیان بۆ سەر ببڕدرێت ، تەنانەت لە پێناو پێغەمبەران و پیاو چاکان یش نابێت قوربانی سەر ببڕدرێت ،

[51] رواه المسلم

متن

تعالى:(يُوْفُوْنَ بِالنَّذْرِ وَيَخَافُونَ يَوْمًا كَانَ شَرُّهُ مُسْتَطِيرًا)[الإنسان:7].[33]
مَعْرِفَةُ دِينِ الإِسْلامِ بِالأَدِلَّةِ
وَهُوَ:الاسْتِسْلامُ للهِ بِالتَّوْحِيدِ، وَالانْقِيَادُ لَهُ بِالطَّاعَةِ، وَالْبَرَاءَةُ مِنَ الشِّرْكِ وَأَهْلِهِ،[34]وَهُوَ ثَلاثُ مَرَاتِبَ: الإِسْلامُ، وَالإِيمَانُ، وَالإِحْسَانُ. وَكُلُّ مَرْتَبَةٍ لَهَا أَرْكَانُ.[35].....................................................................

وە مەبەست لەمەش ئەوەیە کە ئایە قوربانیەکە لە پێناو الله تعالى یە یان لە پێناو قەبر و جن و بتە ، جا ئەوەی لە پێناو غەیری الله تعالى سەر ببڕێت ئەوە بریتیە لە شریک ، نەک ئەوەی کوڕێک قوربانی بۆ دایکی دەکات تا پاداشتی قوربانیەکە بۆ دایکی بچێت ، یان کە سێک قوربانی دەکات تا گۆشتەکەی بکات بە خێر ،

ئەم دووانە دوو شتی لێک جیاوازن ،

ئەوەی شیرکە بریتیە لەوەی لە پێناو غەیری الله تعالى سەر دەبڕدرێت مەبەست غەیری الله تعالى بێت ، بەڵام ئەوەی یەکەم مەبەستی الله تعالى یە ، بەڵام هۆکاری قوربانیەکە غەیری الله تعالى یە ، وەک باسمان کرد کوڕێک دەیەوێت خێر بکات بۆ دایکی دەچێت قوربانی دەکات بۆ دایکی لە پێناو الله تعالى قوربانیەکە سەر دەبڕێت ، ئەمەش جائیزە ،

بەڵام ئەوەی قوربانی دەکات بۆ جنەکان و شێخەکان و بتەکان ئەمە شیرکی گەورەیە ،

وە پێغەمبەر ﷺ لە عنەتی لەو کەسە کردوە کە قوربانی لە پێناو غەیری الله تعالى دەکات ، نمونەی ئەوانەی لەسەر قەبرەکان قوربانی دەکەن ، یان ئەوانەی قوربانی بۆ جنەکان دەکەن تالە شەڕیان درو بن ، وە ئەمەش شەریک بڕیاردان بۆ الله تعالى وە لە گەورەترین شیرکەکانە ،

[٣٣]النذر : واته پێویست كردنی شت لەسەر خۆت بۆ الله تعالی ، بەڵگەش الله تعالی فەرموویەتی:وەفا بە نەزر دەکەن وە لە ڕۆژێکیش دەترسن کە بەدی و سەختی یەکەی هەمووان دەگرێتەوە،

۞ ڕوونكردنەوە ۞

نەزر بریتیە لەوەی مرۆڤ شتێک لەسەر خۆی پێویست بکات ، کە بۆ الله تعالی ی ئەنجام بدات ، لە یەکێک لە جۆرە عیبادەتەکان کە شەرعین وەک نوێژ و خێر و حەج و ڕۆژو نوێژ و هتد..

نەزر بۆ هیچ کەسێکی تر ناکرێت وەک بۆ قەبر و شێخ و بت و جن و هەر شتێکی تر غەیری الله تعالی ،

جا هەر کەسێک شتێک لەسەر خۆی پێویست بکات لە عیبادەتەکان کە بۆ غەیری اللهتعالی ئەنجامی بدات ئەوە شیرکە شیرکی گەورەیە ،

## بنچینەی دووەم

[٣٤]ناسینی دینی ئیسلام بەبەڵگە ،

ئیسلام بریتیە لە : تەسلیم بون و ملکەچ بوون بۆ الله تعالی بەوەی بەتاک و تەنها بیپەرستی ، وە پابەندە بوون پێوەی بەوەی گوێڕیەڵ و ملکەچی فەرمانەکانی بیت ، وە خۆ بەریکردن لە شیرکی و ئەوانەی شەریک بڕیار دەدەن (بۆاللهتعالی) ،

۞ ڕونكردنەوە ۞

ئیسلام لە زمانەوانی دا بریتیە لە ئارامی و ئاشیتی و ئەمنی ،

وە لە ڕوانگەی دینەوە چەندین تەفسیری بۆ کراوە ، جا شێخ یش تەفسیری بۆی کردوە وەک یەکێک لەوان ،

جا گەر کەسێک کە دەیەوێت موسڵمان بێت و دینی ئیسلام وەربگرێت ئەوا پێویستە یەکەم شت تەسلیم و ملکەچ و فەرمان بەرداری الله تعالی بێت کە بەتاک و تەنها بیپەرستی و شەریکی بۆ بڕیار نەدات ،

هەر بۆیەش بە لااله الا الله کە وشەی تەوحیدە دێتە ناو دینی ئیسلامەوە ،

الله تعالی فەرموویەتی﴿إِذ قالَ لَهُ رَبُّهُ أَسلِم قالَ أَسلَمتُ لِرَبِّ العالَمينَ﴾ [52] واتە:کاتێك پەروەردگاری پێی وت: ملکەچ و فەرمانبەردار بە، (ئەویش خێرا) وتی: تەسلیمی پەروەردگاری هەموو جیهان بووم (باوەڕی پتەوم پێی هەیە).،

تەسلیم بوون و ملکەچ و بوون سیفەتی پێغەمبەران و ئیماندرانە کە هەمووکات ملکەچ و تەسلیمن بۆ الله تعالی وە بەتاک و تەنها دەیپەرستن بەبێ شەریک و هاوبەشی ،

وە دەبێت موسڵمان پابەندبێت بە فەرمان و دینی الله تعالی ، جەگەر فەرمانی پێبکات بەوەی کارێک ئەنجام بدات یان بەوەی ڕێگری و قەدەغیی لێبکات لە کارێک ئەوا دەبێت پابەند بێت بەوەی الله تعالی داوای لێکردوە ،

الله تعالی فەرموویەتی﴿وَمَن أَحسَنُ دينًا مِمَّن أَسلَمَ وَجهَهُ لِلَّهِ وَهُوَ مُحسِنٌ وَاتَّبَعَ مِلَّةَ إِبراهيمَ حَنيفًا وَاتَّخَذَ اللَّهُ إِبراهيمَ خَليلًا﴾[53]واتە:کێ هەیە ئاینی چاکترە پەسەندترو جوانتر بێت لەو کەسەی ڕووی کردۆتە الله و خۆی تەسلیمی ئەوزاتە کردووەو لەکاتێکدا کارجوان و کار پەسەندەو شوێنی ئاینی ئیبراهیمی

[52] [البقرة:١٣١]

[53] [النساء:١٢٥]

ملکەچ و فەرمانبەردار کەوتبێت، کە الله ئیبراهیمی کردۆتە خۆشەویستی خۆی ڕێزداری کردووە.›

وە بەهەمان شێوە دەبێت لەگەڵ ئەوەی تەسلیمی الله تعالی بوە بەوەی بە تاک و تەنها بیپەرستێ ، وە تەسلیم و پابەندی فەرمانەکانی الله تعالی بوە ، دەبێت خۆشی بەری بکات لە کافران و موشیرکان ،

دەبێت خۆی لە موشریکەکە بەری بکات و خۆشی لەوەش بەری بکات کە موشریکەکە دەی پەرستێت لە غەیری الله تعالی بەڵام گەر کەسەکە بەوە ڕازی نەبوو کە بیپەرستن وەک پێغەمبەر عیسا و مەلائیکەت و پیاوچاکان ئەوا نابێت خۆی لەوان بەری بکات ، بەڵکو دەبێت خۆی لەوە بەریبکات کە پێغەمبەران و پیاوچاکان مەلائیکە بە خوابزانێت ،

وە خۆ بەریکردن لە شیرک و لە ئەهلی شیرک لەو طاغوتەی دەپەرسترێت سیفەتی پێغەمبەران بوە (علیهم السلام) وەک پێغەمبەر ئیبراهیم کاتێک بە قەومە موشریکەکەی خۆی فەرمووﵟإِنَّا بُرَآءُ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِﵞ[54]واتە:، ئێمە بەرین لە ئێوە و لەو شتانەش کە لەجیاتی الله دەیپەرستن،›

ئەمە بریتیەلە مەبەستی موسڵمان و مانای ئیسلام ، کە کاتێک کەسێک دەیەوێت ئیسلام وەربگرێت و موسڵمان بێت یان کەسێک کە خۆی بە موسڵمان دەزانێت ، ئەوا دەبێت بەم شێوەیە بێت و ئەم کارنە ئەنجام بدات ، گەرنا ئیسلامەتیەکەی لێ قبوڵ ناکرێت ئەگەر چی خۆی بانگەشی بکات و نوێژ و ڕۆژوش بگرێت ،

**[٣٥]** ئیسلام سێ پلەیە ئەوانیش ،

[54] [الممتحنة:٤]

مـتـن

فَأَرْكَانُ الإِسْـلامِ خَمْسَةُ: شَهَـادَةُ أَن لا اله إلا اللهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُـولُ اللهِ، وَإِقَامُ الصَّـلاةِ، وَإِيتَـاءُ الـزَّكَاةِ، وَصَوْمُ رَمَضَـانَ، وَحَـجُّ بَيْتِ اللهِ الْحَرَامِ.[36] فَـدَلِيلُ الشَّـهَـادَةِ: قَوْلُهُ تَـعَالَى: ( شَهِدَ اللّهُ أَنَّـهُ لاَ اله إِلاَّ هُوَ وَالْمَلاَئِكَةُ وَأُوْلُوا الْعِلْمِ قَآئِمًا بِالْقِسْطِ لاَاله إِلاَّهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ)[آلِ عمران،18].[37] وَمَعْـنَاهَا: لا مَعْـبُودَ بِحَقٍّ إلا اللهُ، و(لا إله) نَافِيًا جَمِيـعَ مَا يُعْبَدُ مِنْ دُونِ

یەکەم : ئیسلام

دووەم : ئیمان

سێیەم : ئیحسان

وهەر یەک لەم سیانە پایەی خۆی هەیە ،

❁ ڕونکردنەوە ❁

هەر یەک لەم سێ پلەیە چەندین پایەی هەیە ، کەدەبێت کەسی موسڵمان هەڵسێت بە ئەنجامدانیان ،

جا ئیسلام پێنج پایەی هەیە کە دەبێت ئەنجامی بدەیت ،

وە ئیمان شەش پایەی هەیە ،

وە ئیحسان یەک پایەی هەیە ، إِنْ شَاءَ الله لە دواتر باسی دەکەین ،

[٣٦]پایەکانی ئیسلام پێنج پایەن ،

یەکەم : شایەتی دان بەوەی لااله الا الله محمد رسول الله ، (واتە ، هیچ پەرستراوێک نیە کە شایەنی پەرستن بێت بەحەق تەنها الله تعالی نەبێت وە محمد نێردراوی الله تعالی یە)

دووەم : نوێژ

سێیەم : زەکات

چوارەم : ڕۆژو

پێنجەم : حەج

۞ **ڕونکردنەوە** ۞

ئیسلام لەسەر ئەم پێنج پایە بنیات نراوە و ڕاوەستاوە ، وە ئیسلام تەنها بریتی نیە لەم پێنج شتە ، بەڵکوو ئەمانە تەنها پایەکانی ئیسلامن ،

کاتێک کەسێک دەیەوێت موسڵمان بێت و ئیسلام وەربگرێت ئەوا دەبێت یەکەم جار دوو شایتیەکە بێنێت کە بەهۆیەوە دێتە ناو دینی ئیسلام ، وە گەر کەسێک شایەتی نەهێنابوو هەرچەند نوێژ بکات و ڕۆژو بگرێت ئەوا لێی قبوڵ ناکرێت ،

بەڵکو دەبێت سەرەتا شایەتومان بێنێت کە شایەتومانی هێنا ئەوکات دەبێت بەموسڵمان و ئەوانی تری لەسەر واجب دەبێت ،

وە ئیسلام چەندین شتی تر داوا دەکات لە خاوەنەکەی ، وەک جیهاد کردن لە پێناو الله تعالى و باش بوون لەگەڵ دایک و باوک و سیلەی ڕحم و غەیری ئەویش ، بەڵام ئەم پێنج دانەیە تەنها پایەکانە ، وە إِنْ شَاءَ الله لە کاتی خۆی باسیان دەکەین بەبەڵگەوە لە دواتر ،

**[٣٧]** بەڵگە لەسەر شایەتی دان ، الله تعالى فەرموویەتی : الله شایەتی ئەدات(واتە ڕای دەگەیەنێت و بەبەڵگە دەی چەسپێنێت) کە بەڕاستی هیچ پەرستراوێک نی یە ئەو نەبێ وە فریشتەکانیش شایەتی ئەدەن (واتە ئیقرار ئەکەن) وە خاوەن زانستەکانیش شایەتی ئەدەن(واتە باوەڕی چــــــەسپاویان

مـتـن

اللهِ، (إلا اللهُ) مُثْـبِتًا الْعِبَادَةَ للهِ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ في عِبَادَتِهِ، كَـمَا أَنَّهُ لَـيْسَ لَهُ شَـرِيكٌ في مُـلْكِهِ.[38]وَتَفْسِيرُهَا: الَّذِي يُوَضِّحُهَا قَوْلُهُ تَعَالَى: ( وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ لأَبِيهِ وَقَوْمِهِ إِنَّنِي بَرَآء مِّمَّا تَعْبُدُونَ – إِلاَ الَّذِي فَطَرَنِي فَإِنَّهُ سَيَـهْدِينِ – وَجَعَـلَهَا كَلِمَةً بَاقِـيَةً فِـي عَقِبِهِ لَعَلَّـهُمْ يَـرْجِعُـونَ ) [الزخرف: 26 ـ 28].[39]وقَـوْلُهُ تَعَالَـى: ( قُلْ يَـا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَـالَوْا إِلَى

هەیە)،(اللّٰه) هەمیشە دادپەروەری ڕاگرتووە هیچ پەرستراوێکی بەڕاستی نی یە تەنیا اللّٰە نەبێ کە باڵادەستی کاربەجێ یە.›

۞ ڕونکردنەوە ۞

اللّٰه تعالی شایەتی داوە ، بەو مانایەی  بەیانی کردوە و هەواڵی لەبەرەیەوە داوە کە هیچ پەرستروایێک نیە شایەنی پەرستن بێت بەحەق تەنها اللّٰەتعالی نەبێت ،

وە هەروها مەلا ئیکەتەکانیش هەموویان ئەو شایەتیە دەدەن کە شارەزاترین دورستکرون لە بارەی اللّٰە تعالی ـەوە و لێی نزیکن ،

وە دوای ئەوان خاوەن زانستەکان و زانایان جا ئەوانیش دوو جۆرن ،

یەکەم : ئەو زانایانەی کە خاوەن زانستی شەرعین

دووەم : ئەو زانایانەی کە خاوەن زانستی دونیاین وەک پزیشکی و کشت و کاڵ و کیمیا و ئەستێرە ناسی و جۆرەکانی تر  ،

جا لەم ئایەتە مەبەست لە زانایانی خاوەن زانستی شەرعییە ،

[٣٨]وە مانای (لااله الااللّٰه) بریتیە لەوەی کە هیچ پەرستراوێک شایەنی پەرستن نیە بەحەق تەنها  اللّٰه تعالی نەبێت ،(لااله) واتە ڕەتکردنەوەی هەموو ئەوانەی لە غەیری  اللّٰه تعالی دەپەرسترێن ،(الااللّٰه)واتە دان بنێی بەوەی کە تەنها  اللّٰه تعالی شایەنی پەرستنە و تاک و تەنهایە و شەریک و هاوبەشی بۆ نیە

لەعیبادەت بۆكردن ، وەک چۆن شەریک و هاوبەشی بۆ نیە لە موڵک و هێز و دەسڵاتی ،

❁ ڕونكردنەوە ❁

ئەم وشەیە زۆر گەورەیە ، وە قورسترین شتە كە موسڵمان دەبێت ڕای بگرێت و دەستی پێوە بگرێت و دەمەزراوبێت لەسەری وە لەچاوەكانی خۆی زیاتر بیپارێزێت ،

ئەم وشە بەڕێزە یەكەم وشەی هەموو پێغەمبەران بوە كە بانگەوازی خەڵكیان كردوە بۆ ئەوەی ئەنجامی بدەن و كاری پێ بكەن و ئیمانی پێ بهێنن ،وە هەڵی نەوەشێننەوە ،

الله تعالى فەرموویەتی﴿وما أرسَلنا مِن قَبلِكَ مِن رَسولٍ إلّا نوحي إلَيهِ أَنَّهُ لا إلهَ إلّا أنا فاعبُدونِ﴾[55]واتە : ئێمە پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێكمان ڕەوانە نەكردووە، كە وەحیمان بۆ نەناردبێت بەوەی كە: بێگومان هیچ پەرستروێک نیە جگە لە من و دەبێت هەر من بپەرستن.›

وە هەر ئەو وشە بەڕێزەیە كە بە هۆیەوە خەڵكی بۆتە دوو بەرەی جیاواز ئەویش بەرەی ئیمان و بەرەی كوفر ، جا ئەوەی ئەم وشە پاكە بەپاكی ڕابگرێت ئەوە بەرەی ئیمانە ، وە ئەوەی بەپاكی ڕای نەگرێت و گوێی پێنەدات ئەوا بەرەی كوفرە ،

الله تعالى فەرموویەتی﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ ۖ فَمِنْهُمْ مَنْ هَدَى اللَّهُ وَمِنْهُمْ مَنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ الضَّلَالَةُ ۚ فَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانْظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ﴾[56]واتە:سوێند بە الله بێگومان ئێمە لەناو

[55] [الأنبياء:٢٥]

[56] [النحل:٣٦]

هەر گەل و نەتەوەیەكدا پێغەمبەرێكمان ڕەوانەكردووەو پێمان ڕاگەیاندووە كە پێیان بڵێت: تەنها الله بپەرستن، خۆتان دووره پەرێز بگرن لە هەموو پەرستراوێكی تر، جا هەبوو لەو خەڵكە (كە بیرو هۆش و ژیری خۆی خستەكارو بەشوێن ڕاستیدا دەگەڕا) الله یش هیدایەتی دەدا، هەشیان بوو خۆی شایستەی گومڕایی دەكردو بەسەریدا دەچەسپا، كەوابوو بگەڕێن بەسەر زەویداو سەرنج بدەن، بزانن چۆن بوو سەرەنجامی ئەو كەسانەی بڕوایان بە بەرنامەی ئێمە نەبوو.›

وە بەهۆی ئەم وشەیەوە مرۆڤ جێگا و شوێنی بۆ دا دەنرێت لە قیامەت ، جا گەر ئیمانی بەو وشەیە هێنا و بە پاكی ڕایگرت و كاری پێكرد ئەوە دەچێتە بەهەشتەوە ، وە گەر كاری پێنەكردن و شەریكی بۆ الله تعالى بڕیار دا ئەوە دەچێتە دۆزەخەوە ،

وەک پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی﴿مَن لَقِيَ اللَّهَ لا يُشْرِكُ به شيئًا دَخَلَ الجَنَّةَ، ومَن لَقِيَهُ يُشْرِكُ به دَخَلَ النَّارَ﴾[57]واتە: هەر كەسێک (لە ڕۆژی قیامەت) بگات بە دیداری الله تعالى ، وە شەریک و هاوبەشی بۆ بڕیار نەدابوو ئەوە دەچێتە بەهەشتەوە ، وە هەر كەسێک بگات بە دیداری الله تعالى ،وە شەریكی بۆ بڕیار دابێت ئەوە دەچێتە دۆزەخەوە ،›

وە بەهەبوونی ئەم وشەیە خوێن و ماڵی خاوەنكەی پارێزراو دەبێت ، وە بەنەبوونی ئەم وشەیە خوێن و ماڵی خاوەنەكەی بۆ موسڵمانان حەڵاڵ دەبێت،

وەک پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی﴿أُمِرْتُ أَن أُقاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أَن لا إِلهَ إلاَّ اللَّه وأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، ويُقِيمُوا الصَّلاةَ، وَيُؤْتُوا الزَّكاةَ، فَإِذا فَعَلوا ذلكَ،

[57] [رواه المسلم/برقم٩٣]

عَصَمُوا مِنِّي دِمَاءَهُمْ وأَمْوَالَهم إلاَّ بحَقِّ الإسلامِ، وحِسابُهُمْ عَلى اللَّهِ﴾[58]واتە: فەرمان پێکراوە کە کوژتاری خەڵکی بکەم هەتا ئەوکاتەی شایەتی دەدەن کە هیچ پەرستراوێک نیە شایەنی پەرستن بێت تەنها الله تعالی نەبێت ، وە محمد پێغەمبەر و نێدراوی الله تعالی یە ، وە نوێژ بکەن و زەکات بدەن ، جا گەر ئەوکارانەیان کرد ، ئەوا خوێن ماڵیان پارێزراو دەبێت لێم (کە خوێنیان بڕێژم یان دەست بگرم بەسەر ماڵەکەیان دا)،تەنها بە حەق و مافی ئیسلام نەبێت ، وە حساب و لێپرسینەوەیان لەسەر الله تعالی یە.›

جا پێغەمبەر ﷺ لەسەرەتادا فەرمووی فەرمانم پێکراوە کوژتاریان بکەم هەتا ئەو چەند کارە دەکەن ، جا کە کردیان ئەوا ئەوکات ناتوانم بیان کوژم ، بۆیە ئەم وەشەیە خوێن و ماڵی ئەو کەسە پارێزراو دەکات کە موسڵمان بووە و لااله الا الله کەی تەواوە ،وە چەندین ڕیز و گەورەیی و مافی هەیە وە چەندین شتی تری پێوە بەستراوەتەوە،

جا لااله الاالله دوو ڕوکنی هەیە ئەوانیش (النفي) واتە ڕەتکردنەوە ، وە (الإثبات) واتە دان پێدانان ، جا ئەویش بەم شێوەیەیە

یەکەم : (النفي) بریتیە لەم بەشەی (لااله) کە هەرچی پەرستراوێک هەیە لە غەیری الله تعالی ئەوا ئەم بەشە ڕەتی دەکاتەوە کە بە پەرستراوی بزانیت و عیبادەتی بۆ بکات ،

دووەم : (الإثبات) بریتیە لەم بەشەی (الا الله)کە ئەوە دەچەسپێنی کە تەنها الله تعالی شایەنی پەرستنە و هەر ئەو شایستەیە عیبادەتی بۆ بکرێت بە تاک و تەنها ،

[58] [رواه البخاري والمسلم]

جا گەر کەسێک ئەم وشەیەی وت پاشان ئەم وەشەیەی لە قسە و دڵ و کردرای پاک ڕانەگرت و ئەنجامی نەدا ئەوا لێی قبوڵ نەکارێت ،

بۆنمونە کەسێک دەڵێت لااله الاالله لەگەڵ ئەوشدا کەسێکی خۆش دەوێت بە ئەندازەی الله تعالی یان لەو زیاتر خۆشی دەوێت ، جا ئەو کەسە لااله الا الله یەکەی لێ قبوڵ ناکرێت ، چونکە نەفی پەرستراوەکانی تری نەکردوە ، چونکە هەر کەسێک بەو شێوە کەسێکی خۆش بوێت لە الله زیاتر بێت ، ئەوا کردویەتی بە شەریکی الله ، بۆیە بەشی ڕەتکردنەوەکەی ئەنجام نەداوە چونکە لە خۆش ویستن شەریکی بۆ الله تعالی ئەنجام داوە و کەسێکی تری لەو زیاتر خۆش ویستوە ، بەڵکوو دەبێت الله تعالی لە هەموو شتێک زیاتر خۆش بوێت ، وە کەسی خۆش نەوێت بەو ئەندازەیە ،

یان کەسێک بە زمان دەڵیت لااله الاالله پاشان هاوار لە قەبر دەکات و داوای سود پێگەیاندن و زیان لێ لابردنی لێ دەکات ، ئەوە ئەوکەسە بەشی النفی و الإثبات کەی تەواو نیە چونکە پێچەوانەی لااله الاالله دەکات کە دەبێت بەو شێوە بێت کە هیچ پەرسراوێک بەحەق نەزانێت بۆ پەرستن تەنها الله تعالی نەبێت ، جا گەر غەیری الله تعالی ی پەرست ئەوە النفي و الإثبات ـەکەی هەڵدەوشێتەوە ،

بەڵگەش بۆ ئەم النفي والإثبات ـە وەتەی الله تعالی یە کە فەرموویەتی﴿ذلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ هُوَ الحَقُّ وَأَنَّ ما يَدعونَ مِن دونِهِ هُوَ الباطِلُ وَأَنَّ اللَّهَ هُوَ العَلِيُّ الكَبيرُ﴾[59]واتە: ئەو بیستن و بینینەش بە هۆی ئەوەیە چونکە بەڕاستی الله خۆی حەق و ڕاستە، ئەوانەش کە ئەوان هاناو هاواری بۆ دەبەن لە جیاتی ئەو

[59] [الحج:٦٢]

هەر ئەوە خۆی باتاڵ و ناحەقیە. بێگومان ئەو  الله یە بڵندو بەرزو مەزن و گەورەیە.›

وە الله تعالى لە باسی پێغەمبەر نوح کە بەقەومەکەی خۆی فەرموو ﴿يا قَومِ اعبُدُوا اللَّهَ ما لَكُم مِن إِلٰهٍ غَيرُهُ إِنّي أَخافُ عَلَيكُم عَذابَ يَومٍ عَظيمٍ﴾[60]واتە: ئەی گەل و هۆزم ئێوە هەر  الله بپەرستن، چونکە جگە لەو زاتە خوایەکی ترتان نیە، بەڕاستی من دەترسم لەرۆژێکی گەورەدا تووشی بەڵاو سزایەکی زۆر سەخت ببن.›

جا ئەم دوو بەشە ﴿ما يَدعونَ مِن دونِهِ هُوَ الباطِلُ﴾ لەگەڵ ﴿ما لَكُم مِن إِلٰهٍ غَيرُهُ﴾ ئەوە بریتیە لە ڕەتکردنەوەی هەموو پەرستراوێک لە غەیری  الله تعالى ،

وە ئەو دووبەشەی ﴿بِأَنَّ اللَّهَ هُوَ الحَقُّ﴾ لەگەڵ ﴿اعبُدُوا اللَّهَ﴾ئەمەش بریتیە لە دان نان و چەسپادنی شایستەیەتی  الله تعالى بۆ ئەوەی بپەرسترێت بە تاک و تەنها ،

جا ئەم لااله الاالله چەند مەرجێکی هەیە ئەوانیش هەندێک  لە زانایان دەڵێن حەوتە و هندێکی دەڵێن هەشتە ، وە ئەو مەرجانەش بریتین لە

یەکەم : هەبوونی زانست بە مانا و ڕوکن و مەرجەکانی لااله الا الله

دووەم : بەڕاست زانینی ئەم وشەیە کە هیچ پەرستراوێک نیە شایەنی پەرستن بێت تەنها الله تعالى نەبێت ،

سێیەم : دڵنیابوون لەسەر ئەوەی کە هیچ پەرستراوێک نیە شایەنی پەرستن بێت تەنها الله تعالى نەبێت ،

[60] [الأعراف:٥٩]

چوارەم : ئەو وشەیەت خۆش بوێت و دڵت پێی خۆش بێت ،

پێنجەم : تەسلیم بیت بۆ ئەوە وشەیە و ملکەچ بیت بۆی ،(واتا ئەنجامی بدەیت وەک خۆی بە پاکی ڕای بگریت و ئەنجامی بدەی)

شەشەم : قبوڵت بێت کە لەسەر ئەو وشەیە بڕۆیت و پێی ڕازیبیت ،

حەوتەم : بەردەوام بێت لەسەری و دەستی لێ بەرنەدەیت و پشت گوێی نەخەیت و وازی لێنەهێنیت ،

هەشتەم : بێباوڕ بیت بەهەموو ئەوەی لە غەیری الله تعالى دەپەرسترێت ،

ئەم مەرجەی هەشتەم خۆی لە مانای لااله الا الله دا هەیە بەڵام چونکە لەفەرموودەی صحیح پێغەمبەر ﷺ باسی کردوە بە جیا ، بۆیە وەک مەرج باسدەکرێت،

وەک پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی﴿مَن قالَ: لا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَكَفَرَ بما يُعْبَدُ مَن دُونِ اللَّهِ﴾[61]واتە: هەر کەسێک بڵێت لااله الا الله وە بێباوڕ بێت بەوەی لەغیری الله تعالى دەپەرسترێت.،

جا بۆیە لێرە وەک مەرج دەردەکەوێت ، جا ئەوکەسەی کە دەیەوێت لااله الا الله یکەی لێ قبوڵ بکرێت دەبێت هەموو ئەم مەرجانەی لە خۆی بهێنێتە دی و ڕەچاویان بکات ، وە هەر یەکێک لەم مەرجانە بەڵگە هەیە لەسەری لە قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ ،

**[39]**وە ئەو تەفسیرەی کە(النفي و الإثبات ی لااله الا الله) ڕون دەکاتەوە بریتیە لەو وتەیەی الله تعالى کە فەرموویەتی :وە کاتێ ئیبراهیم بە باوکی و گەلەکەی وت بێگومان من بەریم لەوەی ئێوە دەیپەرستن – جگە لەو زاتەی کە

[61] [راوه المسلم]

متن

كَلَمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلاَ نَعْبُدَ إِلاَ اللّهَ وَلاَ نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُولُواْ اشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ) [ آل عمران: 64 ][40] وَدلِيلُ شَهَادَةِ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ: قَوْلُهُ تَعَالَى: ( لَقَدْ جَآءكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِالْمُؤْمِنِينَ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ )[التوبة: 128].[41]...........................................

دروستی کردووم چونکە هەر ئەویش ڕێنموونیم دەکات.-ئەو (یەکتا پەرستی یە ی لەناو نەوەکانیدا بەجێ هێشت تا بگەڕێنەوە سەری.›

۞ ڕونکردنەوە ۞

جاکاتێک پێغەمبەر ابراهیم (علیه السلام) بە باوکی و قەومەکەی خۆی فەرموو﴿إِنَّنِي بَرَاءٌ مِمَّا تَعْبُدُونَ﴾ ئەوە بێباوەڕ بوون و ڕەتکردنەوەی هەموو پەرستراوێکە، وە ئەوەش نەفی کردنە ،

وە فەرمووی﴿إِلَّا الَّذِي فَطَرَنِي فَإِنَّهُ سَيَهْدِينِ﴾دوای ئەوەی خۆی بە ریکرد لە هەموو ئەوشتانەی کە قەومەکەیی و باوکی دەیان پەرستن ، دوای ئەوە فەرمووی تەنها ئەو زاتە نەبێت کە درووستی کردوم ، کە مەبەستی الله تعالی یە ، جا سەرەتا هەموو پەرستراوێکی نەفی کرد پاشان دانی نا بەوەی کە تەنها الله تعالی شایستەی پەرستنە ، وە ئەمەش بریتیە لە النفي و الإثبات ،

وە پاشان الله تعالی فەرموویەتی﴿وَجَعَلَهَا كَلِمَةً بَاقِيَةً فِي عَقِبِهِ﴾ جا پێغەمبەر ابراهیم (علیه السلام) بانگەشەی بۆ ئەو وشەیە دەکرد کە لااله الاالله و لەناو کوڕەکانی و نەوەکانی و خەڵکی بڵاوی کردەوە ،

﴿لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾بەڵکو تا خەڵکی موشریک قبوڵی بکات و بگەڕێتەوە سەری و دەستی پێوە بگرێ و لەسەری بژی،

[٤٠]وە بەهەمان شێوە ئەو وتەیەی الله تعالی کە فەرمویەتی : ئەی موحەممەد(صلی الله علیه وسلم) بڵێ: ئەی خاوەن نامەکان وەرن بۆ لای وتەیەکی ڕاست(یەکسان) لە نێوان ئێمە و ئێوەدا، کە جگە لە الله نەپەرستین وە هیچ شتێک نەکەین بە هاوبەشی وە هێندێکمان بە پەروەردگار دانەنێین ئینجا ئەگەر پشتیان هەڵکرد ئێوەش بڵێن: ئێوە شاهید بن کە ئێمە فەرمانبەرانی الله ین.›

﴾ ڕونکردنەوە ﴿

﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْا إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ﴾الله تعالی فەرمان بە پێغەمبەر ﷺ دەکات کە بە ئەهلی کتاب بڵێت ئەی خاوەن کتێبەکان وەرن بۆ وشەیێک کە لە نێوان ئێمە و ئێوە دا یەکسانە ئەویش ئەوەیە کە ﴿أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا اللَّهَ﴾ هیچ شتێک نەپەرستین نەدار نە بەرد نە قەبر نە مانگ نە خۆر نە ئەستێرە نەشەیتان نە مانگا و مشک و طاغوت نە پیاوچاکان نە پێغەمبەران نە مەلائیکەت، تەنها الله تعالی نەبێت ،

جا ئەو بەشەی کە دەفەرموێت﴿أَلَّا نَعْبُدَ﴾ هاوشێوەی لااله ە ڕەتکردنەوەی هەموو پەرستراوەکانی تێدایە ،

وە ئەم بەشەی ﴿إِلَّا اللَّهَ﴾ هاوشێوەی الا الله دان پێدانینی تێدایە بۆ الله تعالی بەوەی کە تەنها ئەو بپەرستین ،

وە لەم بەشە ﴿وَلَا نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا﴾ دووبارە ڕەتکردنەوەی شیرکی تێدایە کە نابێت شەریک بۆ الله بڕیار بدرێت چونکە جولەکە دەیان وت عوزەیر کوڕی الله یە ، وە گاورەکان دەیات وت عیسا کوڕی الله یە جالێرە داویان لێدەکرێت کە نەفی ئەو شیرکانەش بکەن و وازی لێبهێنن و ئەنجامی نەدەن ،

﴿وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾وه نابێت کەس بکەن بە ارباب ، ارباب جمع ی رب ە ، واته بەڕێوبەر و بەخێوکەر ، جا جولەکەو گاور کەسانێکیان بە بەڕێوبەری خۆیان دادەنا و حەڵال و حەڕامیان لە ارباب ەکانیان وەر دەگرت لە غەیری الله تعالى ، وەک الله تعالى باسی دەکات و دەفەرموێت﴿وَقالَتِ اليَهودُ عُزَيرٌ ابنُ اللَّهِ وَقالَتِ النَّصارَى المَسيحُ ابنُ اللَّهِ ذٰلِكَ قَولُهُم بِأَفواهِهِم يُضاهِئونَ قَولَ الَّذينَ كَفَروا مِن قَبلُ قاتَلَهُمُ اللَّهُ أَنّى يُؤفَكونَ – اتَّخَذوا أَحبارَهُم وَرُهبانَهُم أَربابًا مِن دونِ اللَّهِ وَالمَسيحَ ابنَ مَريَمَ وَما أُمِروا إِلّا لِيَعبُدوا إِلٰهًا واحِدًا لا إِلٰهَ إِلّا هُوَ سُبحانَهُ عَمّا يُشرِكونَ﴾[62]واته:جوولەکەکان وتیان عوزێر کوڕی الله یە و گاوورەکانیش وتیان مەسیح کوڕی الله یە ئەوە وتەی ئەوانە بەدەمی خۆیان دەیڵێن وەك وتەی ئەوانە دەڵێنەوە کە پێشتر بێ بڕوا بوون الله لە ناویان بەرێ چۆن درۆ دەکەن و لەهەق و ڕاستی لادەدەن.- زاناو عابیدەکانیان کردووە بە پەروەردگار لە جیاتی الله هەروەها مەسیحی کوڕی مەریەمیش(یان کردووە بە الله ) لە کاتێکدا فەرمانیان پێ نەدراوە بێجگە لەوەی کە یەك الله بپەرستن کە هیچ پەرستراوێك نی یە بێجگە لەئەو پاك و بێگەردی بۆ ئەو( الله ) لەوەی دەیکەنە هاوبەشی.›

بۆیە الله تعالى بە پێغەمبەرەکەی ﷺ دەفەرموێت کە بەجولەکە و گاور بڵێت کە کەس نەکەن بە رب ی خۆیان لە غەیری الله تعالى ،

جا لەکۆتایی ئایەتەکە الله تعالى دەفەرموێت﴿فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُولُوا اشْهَدُوا بِأَنَّا مُسْلِمُونَ﴾ جا گەر جولەکە و گاور پشتیان کرد لە داواکاریەکەت و بانگ کردنەکەت و بە دەم بانگکردنەکەت نەهاتن و قبوڵیان نەکرد ، ئەوە پێیان بڵێ ئێوە شاهید بن کە من موسڵمانم بەوەی کە هیچ شتێک ناپەرستم تەنها الله

[62] [التوبه:٣٠-٣١]

نەبێت وە هیچ شتێک ناکەم بەشەریکی و کەس ناکەم بە حەڵاڵ کەر و حەرام کەری خۆم تەنها الله تعالى نەبێت ،

[٤١]بەڵگەش لەسەر شایەتی دان بە محمد ﷺ ، وتەی الله تعالى یە وەک فەرموویەتی : بەڕاستی بۆتان هاتووە پێغەمبەرێك لە خۆتان قورس و گرانە بەلایەوە نارەحەتی و ناخۆشی ئێوە زۆر سوورە لەسەر (باوەڕ هێنان) تان بۆ بڕواداران دڵسۆز و میهرەبانە.›

❁ ڕونکردنەوە ❁

شایەتی دان بە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ شایەتی دان بە تاک و تەنهایی الله تعالى بەیەکەون و جیانابنەوە ، هەرکەسێک شایەتی بدات بە الله تعالى بەڵام شایەتی نەدات بە پێغەمبەر ﷺ ئەوە شایەتیەکەی قبوڵ ناکرێت و ڕەتدەکرێتەوە ،

وە هەروها هەرکەسێک شایەتی بەپێغەمبەر ﷺ بدات بەڵام شایەتی بەتاک و تەنهایی الله تعالى نەدات ئەوەش بەهەمان شێوە ڕەت دەکرێتەوە قبوڵ ناکرێت ، چونکە هەر دوو شایەتیەکە بەیکەوەن و جیانەکراونەتەوە ،

جا شایەتی دان بە تاک و تەنهایی الله تعالى ئەوەیە بەتاک و تەنها بیپەرستیت و شەریکی بۆ بڕیار نەدەیت ، وە شایەتی دا بە پێغەمبەر ﷺ ئەوەیە کە شوێنی بکەویت و چاوی لێبکەی ،

وە ئەم ئایەتەی شێخ کە (رحمه‌الله) هێناویەتی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە محمد ﷺ نێردراو و پێغەمبەری الله تعالى یە و لەلایان ئەوەوە نێردراوە بۆ خەڵکی بەگشتی وەک الله تعالى فەرموویەتی ﴿وَما أَرسَلناكَ إِلّا كافَّةً لِلنّاسِ بَشيرًا وَنَذيرًا وَلكِنَّ أَكثَرَ النّاسِ لا يَعلَمونَ ﴾[63] واتە : ئێمە تۆمان ڕەوانە

[63] [سبأ:٢٨]

نەكردووە، مەگەر بۆ ئەوە نەبێ كە بۆ هەموو خەڵكی ببیتە مژدەدەرو ترسێنەر.›وەفەرموویەتی ﴿وَما أَرسَلناكَ إِلّا رَحمَةً لِلعالَمينَ﴾[64]واتە : وە (ئەی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم)) تۆمان تەنها بۆ ئەوە ناردووە كە ڕەحمەت بیت بۆ جیهانیان.›

وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی محمد ﷺ نێردراوی الله تعالى يە ، وتەی الله تعالى وەک فەرموویەتی﴿إِذَا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ قَالُوا نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ اللَّهِۗ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَكَاذِبُونَ﴾[65]واتە :ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) كاتێك ناپاك و دووڕووەكان دێن بۆ لات و دەڵێن: ئێمە شایەتی دەدەین كە تۆ پێغەمبەری الله یت!! لەحاڵێكدا كە الله خۆی چاك دەزانێت كە تۆ پێغەمبەر و فرستادەی ئەویت، لە هەمان كاتدا الله شایەتی دەدا كە ئەو ناپاك و دووڕووانە درۆزنن.›

وەفەرموویەتی ﴿ما كانَ مُحَمَّدٌ أَبا أَحَدٍ مِن رِجالِكُم وَلكِن رَسولَ اللَّهِ وَخاتَمَ النَّبِيّينَ وَكانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيءٍ عَليمًا﴾[66]واتە : محمد وەنەبی باوكی هیچ كەس لە پیاوانتان بێت بەڵكو پێغەمبەری خوایەو دواهەمینی پێغەمبەرانە، هەمیشەو بەردەوامیش خوا بە هەموو شتێک زانایە›

وەفەرموویەتی﴿وَما مُحَمَّدٌ إِلّا رَسولٌ قَد خَلَت مِن قَبلِهِ الرُّسُلُ﴾[67]واتە : (محمد (صلى الله عليه وسلم) تەنها پێغەمبەرێک نەبووە وەفات بكات، بێگومان پێغەمبەرانی پێش ئەمیش (وەفاتیان كردووە)،›

[64] [الأنبياء:١٠٧]
[65] [المنافقون:١]
[66] [الأحزاب:٤٠]
[67] [آل عمران:١٤٤]

هەموو ئەمانە بەڵگەی ئاشکران کە محمد ﷺ پێغەمبەر و نێردراوی الله تعالی یە ، وە ئەو بەڵگەی کە شێخ ڕحمه الله هێناویەتی کە الله تعالی دەفەرموێت ﴿لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِنْ أَنْفُسِكُمْ﴾ بەدڵینیاوە پێغەمبەرێکمان بۆتان ناردوە لە خۆتان ،

جا ئەو بەشەی ﴿مِنْ أَنْفُسِكُمْ﴾ دوو مانا لە خۆی دەگرێت،

یەکەم : مانای ئەوەی کە ئەو پێغەمبەرەی ناردومانە بۆتان لە ڕەگەزی خۆتانە و مرۆڤە نەک مەلائیکەت یان جن بێت بەڵکو مرۆڤە ،

دووەم : مانای ئەوەی کە ئەو پێغەمبەرەی ناردومانە لە خزم و کەسی خۆتانە و مام و خاڵ و خزمی خۆتانە ، نەک بێگانە بێت و نەناسراو بێت ،

﴿عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ﴾ ئەو پێغەمبەرە زۆر بێتاقەت و نارەحەت دەبێت لەوەی دێتە سەر ڕێگای ئێوە و بە هۆی کارە خراپەکانی ئێوە زۆر نارەحەت و بێتاقەت دەبێت ،

﴿حَرِيصٌ عَلَيْكُمْ﴾ وە هەروها زۆر سور و پێداگری دەکات و بەردەوام لە هەوڵدانە تاوەک و ئیمان بهێنن و ئیسلام قبوڵ بکەن ،

﴿بِالْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ﴾وە بۆ ئیماندارن و موسڵمانان زۆر بەڕوحم و بەسۆزە وە زۆر دڵنەرم و باشە لەگەڵیان و هاوکاریان دەکات ،

بەڵام لەسەر کافران و توند و تیژ بووە ، نەک وەک کەسانێک کە بەناوەی باشی و دڵنەرمی پێغەمبەر ﷺ دەسیتان خستۆتە ناو دەستی کافران پشتوانیان دەکەن ، بەڵکو پێغەمبەر ﷺ تەنها لەگەڵ ئیمانداران بەڕوحم بوە بەڵام توند بوە لەسەر کافران و تەنازولی لەدین نەکردوە بۆ کافران ،وەک الله تعالی فەرمـــــــــوویەتی ﴿مُحَمَّدٌ رَسولُ اللَّهِ وَالَّذينَ مَعَهُ أَشِدّاءُ عَلَى الكُفّارِ رُحَماءُ

مـتـن

وَمَعْنَى شَهَادَةِ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ:[42]
طَاعَـتُهُ فِيمَا أَمَرَ، [43]وَتَصْدِيقُـهُ فِيـمَا أَخْبَرَ،[44] واجْتِنَابُ مَا نَهَى عَنْهُ وَزَجَرَ،[45] وأَلا يُعْبَدَ اللهُ إِلا بِمَا شَرَعَ.[46]........................................

بَيْنَهُمْ﴾[68]واتە : محمد (صلى الله عليه وسلم) ڕەوانەکراوی الله یە، ئەوانەش کەلەخزمەتیدان و شوێنی کەوتوون توند و تیژن بەرامبەر بێ باوەڕان و بەبەزەیی و میهرەبانن لەنێوان خۆیاندا،،

ئەمە سیفەتی پێغەمبەرە ﷺ کە لەسەر کافران توندە بوە ، بەڵام بێتاقەت دەبوو بەشیرک و سەرپێچیەکانیان ، وە زۆر هەوڵی دەدا تاوەکو ئیمان بـێنن ،بەڵام ئەم بێتاقەت بوون و سور بونە لەسەر ئیمان هێنان هەرگیز نەبۆتە هۆی تەنازولکردن لە دین بۆ موشیرکان و کافران ،

وەک کاتێک کە موشریکان داویان لێکرد ڕێکەوتنیان لەگەڵ بکات کە ساڵێک پێغەمبەر ﷺ بتەکان بپەرستێ و ساڵێک موشریکان الله بپەرستن ، ئەوە الله تعالی قبوڵی نەکرد و ڕەتی کردەوە ، الله تعالی فەرمانی بەپێغەمبەر ﷺ کرد کە بڵیت ﴿قُل يا أَيُّهَا الكافِرونَ – لا أَعبُدُ ما تَعبُدونَ – وَلا أَنتُم عابِدونَ ما أَعبُدُ – وَلا أَنا عابِدٌ ما عَبَدتُم – وَلا أَنتُم عابِدونَ ما أَعبُدُ – لَكُم دينُكُم وَلِيَ دينِ﴾[69]واتە : بڵێ: ئەی بێ بڕواییینە. – من ئەو(بتان) هـ ناپەرستم کە ئێوە دەی پەرستن. – وە ئێوەش ئەو( الله یە) ناپەرستن کە من دەی پەرستم. – وەمن ئەو الله

[68] [الفتح:٢٩]
[69] [الكافرون:١-٦]

پەرستی یە ناکەم کە ئێوە دەیکەن. – وە ئێوەش ئەو الله پەرستی یە ناکەن کە من دەیکەم. – ئایینی خۆتان بۆ خۆتان و ئایینی خۆم بۆ خۆم.›

**[42]** مانای شایەتی بەوەی محمد پێغەمبەری ﷺ تعالی یە ،

❁ **ڕونکردنەوە** ❁

مانای شایەتی (اشهد ان محمد رسول الله)واتە شایەتی دەدەم کە بەدڵنیایەوە محمد نێردراوی الله تعالی و کراوە بە پێغەمبەر لەلایان الله تعالی وە ،

شایەتی دان دەبێت بە سێ شت بێت ، ئەویش بە

یەکەم : بەدڵ و بیرو باوەڕ ،

دووەم : بەزمان و دەربڕینی بە زمان ،

سێیەم : بەکردار ،

دەبێت بە هەرسێ لەم شێوەیە دانی پێدابنێیت و بەڕاستی بزانیت ، وە گەر هاتوو یەکێکان بەبێ ئەوەی تر بێت ئەوا قبوڵ کراو نابێت و بەشایەتی دانێکی نوقستان حساب دەکرێتەوە و ڕەت دەکرێتەوە ،

جاگەر بەدڵ باوڕی پێ بێت بەڵام بەزمان دەری نەبڕێت ئەوا هاوشێوەی موشریکەکانی قورەیش ە کە لە دڵەوە دەیان زانی ئەوە نێردراوی الله تعالی یە بەڵام تەعسوب و دەمارگری و قەومایەتی ببوە هۆی ئەوەی ئیمان نەهێنن و کوفر بکەن دژایەتی پێغەمبەر ﷺ بکەن ، وەک الله تعالی فەرموویەتی﴿قَدْ نَعْلَمُ إِنَّهُ لَيَحْزُنُكَ الَّذِي يَقُولُونَ فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَٰكِنَّ الظَّالِمِينَ بِآيَاتِ اللَّهِ يَجْحَدُونَ﴾[70]واتە : بەڕاستی چاک دەزانین کە گوفتاری نادروستی الله نەناسان

[70] [الأنعام:٣٣]

غەم و پەژارەت بۆ پێش دەهێنێت، چونکە بەڕاستی ئەوانە وەنەبێت تۆ بەدرۆزن بزانن، بەڵکو ستەمکاران هەر داننانێن و ئینکاری ئایەت و فەرمانەکانی اللە دەکەن.»

دیقەت بدە موشریکان  لە دڵەوە باوڕیان پێغەمبەر ﷺ هەیە بەڵام لەبەر عینادی و بتەکانیان باوەڕی تەواوی پێناهێنن ،

وە گەر بە دڵ باوڕی پێنەبوو بەڵام بە زمان واخۆی نیشان دەدا کە ئیمانی پێهناوە ، ئەوە وەک موناففقیەکانە کە بەزمان دەڵێن ئیمانمان هێناوە و شایەتی دەدەین کە تۆ پێغەمبەریت ، بەڵام لە ڕاستی دا درۆ دەکەن لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ و موسڵمانان و باوەڕیان بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر ﷺ نیە ، وەک اللە تعالی فەرموویەتی﴿إِذَا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ قَالُوا نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ اللَّهِ ۗ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَكَاذِبُونَ﴾[71]واتە : ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کاتێك ناپاك و دووڕووەکان دێن بۆ لات و دەڵێن: ئێمە شایەتی دەدەین کە تۆ پێغەمبەری اللە یت!! لەحاڵێکدا کە اللە  خۆی چاك دەزانێت کە تۆ پێغەمبەر و فرستادەی ئەویت، لە هەمان کاتدا، اللە  شایەتی دەدا کە ئەو ناپاك و دووڕووانە درۆزنن.»

ئەمە درۆی موناففقەکانە کە دەکەین ، وە یەکێکە لە کوفری نیفاق کە موناففقیەکان بەهۆیەوە کافر بوون و لەکافران حساب دەکران ،

جا ئەم درۆی مونافیقانە بۆ ئەوە بوو تا سەلامەت بن لە دەستی موسڵمانان خۆیان بپارێزن لەوەی بکوژرێن و شەڕیان لە دژبکرێت ، وە تاوەکو دەست کەوت و غەنیمەت بەدەست بێنن لە جیهاد و شەڕەکان ،وەک اللە تعالی فەرموویەتی﴿اتَّخَذُوا أَيْمَانَهُمْ جُنَّةً فَصَدُّوا عَن سَبِيلِ اللَّهِ ۚ إِنَّهُمْ سَاءَ مَا كَانُوا

[71] [المنافقون:١]

يَعْمَلُونَ﴾[72]واتە :ئەوانە سوێندی درۆیان کردووە بە قەڵغانی خۆیان و بەو هۆیەوە بەربەستی خەڵکیان کردووە لە ڕێبازی الله ، بەڕاستی ئەوەی ئەوان دەیانکرد، کارێکی زۆر ناپەسەندو نابەجێ بوو.›

بۆیە دەبێت بە دڵ و بەزمان پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر ﷺ بەڕاست بزانیت و دانی پێدابنێیت ،وە دەبێت بەلاشە شوێنی بکەویت و سەری بخەیت و پارێزگاری لێبکەی ، نەک وەک موشریکان کە تەنها بە دڵ بوو ، وە نەک وەک و مونافقەکان بە زمان شایەتی بدەیت و لەدڵەوە بڕوات پێی نەبێت ،

[43]مەرجی یەکەم : گوێڕایەڵکردنی لەوەی فەرمانی پێدەکات ،

۞ ڕونکردنەوە ۞

وە گوێڕایەڵی کردنی پێغەمبەر ﷺ مەرجی قبوڵ بوونی شایەتی دانە بە(محمد رسول الله)

الله تعالى فەرموویەتی ﴿ وَأَقِيمُوا الصَّلاةَ وَآتُوا الزَّكاةَ وَأَطِيعُوا الرَّسولَ لَعَلَّكُم تُرحَمونَ ﴾[73]واتە : وە نوێژ بەجێ بێنن و زەکات بدەن و گوێڕایەڵی پێغەمبەر بکەن تا الله تعالى ڕەحمتان پێ بکات.›

الله تعالى گوێڕایەڵی پێغەمبەرەکەی ﷺ هێناوتە ئاستی گوێڕایەڵی خۆی ، وە ئەمەش گەورەیی گرنیگی گوێڕایەڵ بوونی پێغەمبەر ﷺ دەردەخات ، وەک الله تعالى فەرموویەتی ﴿ وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ فَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَإِنَّمَا عَلَى رَسُولِنَا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ ﴾[74]واتە : گوێڕایەڵی الله تعالى و گوێڕایەڵی پێغەمبەر بکەن

[72] [المنافقون:٢]
[73] [ النور: ٥٦ ]
[74] [ التغابن: ١٢ ]

ئەوسا ئەگەر پشتان تێ کرد جا ئەوەی لەسەر پێغەمبەری ئێمەیە هەر گەیاندنی ڕوون و ئاشکرای ئایینە›

وەفەرموویەتی ﴿ وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَاحْذَرُوا فَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَاعْلَمُوا أَنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ ﴾[75]واتە : (ئەی ئیمانداران) گوێڕایەڵی الله تعالی بن، گوێڕایەڵی پێغەمبەریش بن و وریابن و ئاگادار بن (نەکەن سەرپێچی لە فەرمان و ڕێنموویەکانیان بکەن) جا ئەگەر پشت هەڵکەن و یاخی ببن ئەوە بزانن بەڕاستی کاری پێغەمبەری ئێمە تەنها ڕاگەیاندنی ئاشکراو ڕوونی پەیامەکەیە.›

وە الله تعالی گوێڕەیەڵی پێغەمبەرەکەی ﷺ کردۆتە مەرجی ئیمان ،وەک فەرموویەتی ﴿ يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْأَنفَالِ قُلِ الْأَنفَالُ لِلَّهِ وَالرَّسُولِ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَصْلِحُوا ذَاتَ بَيْنِكُمْ وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴾[76]واتە : ئەی موحەممەد( ﷺ ) پرسیارت لێ دەکەن سەبارەت بە دەستکەوتەکان(ی جەنگی بەدر) تۆش بڵێ: ئەو دەستکەوتانە هەر بۆ الله تعالی و پێغەمبەرن( ﷺ ) کەواتە خۆتان بپارێزن و لە الله بترسن وە پەیوەندی نێوان خۆتان چاك بکەنەوە و گوێڕایەڵی الله تعالی و پێغەمبەرەکەی بن ئەگەر ئێوە بڕوادارن.›

وە الله تعالی گوێڕایەڵی پێغەمبەرکەی ﷺ کردۆتە مەرج بۆ ئەوەی ڕوحم بە موسڵمانان و ئیماندارن بکات ، وەک فەرموویەتی ﴿ وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾[77]واتە : گوێڕایەڵی الله تعالی و پێغەمبەرەکەی بن بۆ ئەوەی ڕەحمتان پێ بکرێت.›

---

[75] [ المائدة: ٩٢ ]

[76] [ الأنفال: ١ ]

[77] [ آل عمران: ١٣٢ ]

وە فەرموویەتی ﴿ وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَيُطِيعُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ أُولَئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾[78] واتە : پیاوان و ئافرەتانی باوەڕدار هەندێكیان یارمەتی دەر و خۆشەویستی هەندێكی تریانن فەرمان دەدەن بە چاكە و جڵەو گیری دەكەن لە خراپە و بەرێك و پێكی نوێژ جێ بەجێ دەكەن و زەكات(ی سامانیان) دەدەن وە گوێڕایەڵی الله و پێغەمبەرەكەی دەكەن ئەوانە لە داهاتوودا الله ڕەحمیان پێ دەكات بەڕاستی الله بە دەسەڵاتی كاردروستە.›

وە هەر كەسێک گوێڕایەڵی الله تعالى پێغەمبەرەكەی نەكات پشت هەڵبكات لە گوێڕایەڵی كردنیان یان تەنها گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ نەكات ، ئەوە كافرە دەبێت وەک الله تعالى فەرموویەتی ﴿ قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَإِن تَوَلَّوْا فَإِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْكَافِرِينَ ﴾[79]واتە : بڵێ: گوێڕایەڵی الله تعالى و پێغەمبەر بكەن ئینجا ئەگەر پشت هەڵكەن ئەوە بێگومان الله تعالى بێ بڕوایانی خۆش ناوێت.›

ئەمە بەڵگەی ڕونە كە هەر كەسێک گوێڕایەڵی الله تعالى و پێغەمبەرەكەی نەكات ، ئەوە كافرە .

وە هەركەسێک گوێڕایەڵی الله تعالى و پێغەمبەرەكەی نەكات ﷺ ، ئەوە الله تعالى كردەوەكانی پوچ دەكاتەوە و لێی قبوڵ ناكات ،

وەک فەرموویەتی ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَلَا تُبْطِلُوا أَعْمَالَكُمْ ﴾[80]واتە : ئەی ئەو كەسانەی باوەڕتان هێناوە گوێڕایەڵی الله و پێغەمبەر بن وە كردەوە (چاكە) كانتان هەڵمەوەشێننەوە.›

---

[78] [ التوبة: ٧١ ]

[79] [ آل عمران: ٣٢ ]

[80] [ محمد: ٣٣ ]

وە هەر كەسێک گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ بكات ئەوە دەچێتە بەهەشتەوە ، وەک پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ﴿ كُلُّ أُمَّتِي يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ إِلَّا مَنْ أَبَى . قَالُوا : يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَنْ يَأْبَى ؟ قَالَ : مَنْ أَطَاعَنِي دَخَلَ الْجَنَّةَ، وَمَنْ عَصَانِي فَقَدْ أَبَى ﴾ [81] واتە : هەموو ئومەتەكەم دەچێتە بەهەشتەوە تەنها ئەو كەسە نەبێت كە خۆی نایەوێت ، هاوەڵان فەرموویان ئەی پێغەمبەری الله جا كێ نایەوێت ؟؟ ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : هەر كەسێک گوێڕایەڵیم بكات دەچێتە بەهەشتەوە ، وە هەركەسێک سەرپێچیم بكات ئەوە نایەوێت (بچێتە بەهەشتەوە).،جا هەموو ئەمانە لە گەورەیی و گرنیگی گوێڕایەڵی كردنی پێغەمبەرە ﷺ ، كە هەر كەسێک گوێڕایەڵی بكات ئەوە نیشانەی ئەوەیە ئیماندرە وە الله تعالى ڕوحمی پێدەكات لە دونیا و ڕۆژی قیامەت و دەچێتە بەهەشتەوە ،

وە هەر كەسێک گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺنەكات ئەوا كافرە و كردەوەكانی پوچ دەبێتەوە و ناچێتە بەهەشتەوە،

**[44]** مەرجی دووەم : بەڕاست زانینی ئەو هەواڵانەی كە دەی دات ،

﴿ **ڕونكردنەوە** ﴾

وە بەڕاست زانینی ئەو هەواڵانەی كە پێغەمبەر ﷺ بە ئومەتەكەی ڕادەگەیێنێت مەرجی قبوڵ بوونی شایەتی دانە بە پێغەمبەر ﷺ ،

چونكە پێغەمبەر ﷺ هیچ قسەیێک لەخۆیەوە ناكات بەڵكوو هەموو ئەوەی دەیڵێت وەحی یە (سروشت یان پایەم) و لەلایان پەروەردگاریەوەیە ، وەک الله تعالى دەفەرموێت ﴿ مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَى – وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى – إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى ﴾ [82] واتە : هاوەڵ وهاوڕێی ئێوە محمد ( ﷺ ) گومڕاو

[81] [ رواه البخاري : برقم/ ٧٢٠٠ ]

[82] [النجم: ٢-٣-٤ ]

سەرلێشێواو نەبووە، لەڕێگەی ڕاست و ڕەوان نەترازاوە – قسەو گوفتاریشی (ئەوەی کەقورئانە) لەئارەزوو بازی و هەواو هەوەسەوەنیە - ئەمەی کەرای دەگەیەنێت تەنها نیگاو وەحی الله تعالی یە›

وە هەروها ئەوەی پێغەمبەر ﷺ دەیلێت هەمووی حەق و ڕاستیە ، بۆیە دەبێت بەڕاست بزاندرێت و باوڕی پێبکرێت چونکە هیچ ناڵێت تەنها حەق و ڕاستی نەبێت ،

وەک عبدالله ی کوڕی عمر فەرموویەتی ﴿ كنتُ أكْتبُ كلَّ شيءٍ أسمعُهُ مِن رسولِ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ أريدُ حفظَهُ فنَهَتني قُرَيْشٌ عن ذلِكَ وقالوا : تَكْتُبُ ورسولُ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ يقولُ في الغضَبِ والرِّضا فأمسَكْتُ حتَّى ذَكَرتُ ذلِكَ لرَسولِ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ فقالَ : اكتُب فوالَّذي نَفسي بيدِهِ ما خرجَ منهُ إلَّا حقٌّ ﴾[83]واتە : من هەموو شتێکم دەنوسی کە لە پێغەمبەر ﷺ دەم بیست ، دەمویست لەبەری بکەم ، (بەڵام) قورەیش ڕێگریان لێکردم لەوە و وتیان تۆ (چۆن) شت دەنوسیت (لەکاتێک دا) پێغەمبەر ﷺ جاری وایە لە توڕەییا یان لە دڵخۆشیا قسەدەکات ، (عبدالله ی کوڕی عمر دەفەرمویٚ) منیش دەستم هەڵگرت (لە نوسین) تا باسەکەم بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بینوسە(واتا دەست هەڵمەگرە لە نوسین چونکە)سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە هیچ شتێک (لە نێوان لێوەکانم)دەرناچێت تەنها حەق نەبێت.›

جا ئەو کەسەی کە هەواڵەکانی پێغەمبەر ﷺ بەڕاست نازانێت یان هەندێکی بەڕاست نازانێت ئەوا شایەتی دانی بە ( محمد رسول الله ) تەواو نیە و نوقستانە

[83] [ رواه احمد في مسنده برقم/٦٨٠٢، و ابو داود ]

، وە الله تعالى لێی قبوڵ ناکات هەتاوەکو هەموو هەواڵەکانی پێغەمبەر ﷺ بەڕاست نەزانێت ،

جا بۆیە هەر کەسێک وتەیێکی پێغەمبەر ﷺ بە درۆ بزانێت ئەوا کافر دەبێت ،

وە لەم سەردەمە دا پێغەمبەر ﷺ لە ژیان نەماوە تا بە درۆ بخرێتەوە پەنا بەالله ، بەڵام فەرموودەکانی ماونەتەوە لە ناو موسڵمانان ،

جا هەر فەرموودەیێک کە صحيح(ڕاست و چەسپاو) بوو بگات بە هەر کەسێک و ئەو کەسە بەڕاستی نەزانێت ئەوا کافر دەبێت و شایەتی دانی بە (محمد رسول الله) هەڵدەوشێتەوە ئەگەر چی هەندێک وتەی تری بەڕاست بزانێت ،

لەبەر ئەوەی ئیمان بریتیە لە بەڕاست زانین و دان پێدانان جا هەر کەسێک کە هەواڵەکانی پێغەمبەر ﷺ بەڕاست نەزانێت و دانی پێدانەنێت ئەوا ئیمانی هەڵدەوشێتەوە کافر دەبێت ،

وە بە درۆ زانینی هەواڵەکانی پێغەمبەر ﷺ سیفاتی مونافقەکانە(دوو ڕووەکان) کە پێغەمبەر ﷺ یان بە درۆ دەزانی باوڕیان پێنەدەکرد ،

بۆیە پێویستە لەسەر هەموو کەسێک کە کاتێک موسڵمان دەبێت یان کەسێکی موسڵمانە ئەوا هەر کاتێک وتەیێکی پێغەمبەر ﷺ ی پێگەیشت ئەوە دەبێت بەڕاستی بزانێت و باوڕی تەواوی پێبێنێت و دڵنیابێت لە ڕاستی ئەو هەواڵە ،

وە باسکرا کە پێغەمبەر ﷺ قسە لەخۆیەوە ناکات بەڵکوو ئەوەی دەیڵێت پەیامی الله تعالى یە ، جا گەر پەیامەکە قورئان بێت یان سونەت ئەوا

هەردووکی هەر پەیامی الله تعالی یە و بەویست و ئیرادەی ئەوە و فەرمان و داواکاری الله تعالی یە نەک هەوەس و قسەی خودی پێغەمبەر ﷺ ،

وەک الله تعالی لە بارەیەوە دەفەرموێت ﴿ وَلَو تَقَوَّلَ عَلَينا بَعضَ الأَقاويلِ – لَأَخَذنا مِنهُ بِاليَمينِ – ثُمَّ لَقَطَعنا مِنهُ الوَتينَ ﴾[84]واتە : ئەگەر (محمد( ﷺ )) بەدەم ئێمەوە هێندێ (ووتەی)هەڵببەستایە. – بێگومان ئێمە بەدەستی خۆمان تۆڵەمان لێ دەسەند. – لە پاشان ڕەگی دڵیمان دەبڕیی.›

وە ئەمەش سێ ئاماژەی تێدایە

یەکەم : ئەوەیە کە ئەوکەسانەی پێغەمبەر ﷺ یان بۆ نێرداروە بە پێغەمبەر دڵ ئارام بن کە ئەوەی پێغەمبەر ﷺ دەیڵێت و فەرمانیان پێدەکات و داوایان لێدەکات بۆیان باس دەکات ئەوا هەمووی وەحی و پەیام الله تعالی یە جا ئەو پەیامە لە قورئان بیت یان لە وتەکانی پێغەمبەر ﷺ ،

دووەم : ئاگاداری دان بە پێغەمبەر ﷺ لە کاتێک دا ئەو (معصوم ە) پارێزراوە لە هەڵە ،

سێیەم : ئاگاداری تێدایە بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە قسە لە دین دەکەن و بانگەشەی خەڵکی دەکەن ، ئاگاداریە بۆیان بەوەی کە گەر قسەیێک هەڵبەستن و بیدەنە پاڵ الله تعالی ئەوە الله تعالی تۆڵەیان لێدەستێنێتەوە و سزایان دەدات ،

**[45]** مەرجی سێیەم : خۆ دوورگرتن لەوەی کە ڕێگری لێکردوە ،

❁ **ڕونکردنەوە** ❁

---

[84] [ الحاقة: ٤٤-٤٥-٤٦ ]

وە هەر شتێک کە پێغەمبەر ﷺ نەهی لێکرد (ڕێگری لێکرد لەوەی ئەنجام بدەی (قەدەغەی کرد)) ئەوە پێویستە لەسەر موسڵمان کە خۆی لێ بەدور بگرێت و خۆی لێ بپارێزی و ئەنجامی نەدات ،

اللہ تعالی فەرمانی پێمان کردوە کە هەر شتێک پێغەمبەر ﷺ ڕێگری لێکردین لەوەی ئەنجامی بدەین ئەوا خۆمانی لێ دور بگرین و ئەنجامی نەدەین ،

وەک اللہ تعالی فەرموویەتی ﴿ وَما آتاكُمُ الرَّسولُ فَخُذوهُ وَما نَهاكُم عَنهُ فَانتَهوا وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَديدُ العِقابِ ﴾[85]واتە : ئەوەی پێغەمبەر( ﷺ ) پێ ی دان وەریبگرن وە ئەوەی لێتانی قەدەغە کرد وازی لێ بێنن وە لە اللہ بترسن بێگومان اللہ تعالی سزای سەختە،

وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ﴿ دَعُونِي ما تَرَكْتُكُمْ، إنَّما هَلَكَ مَن كانَ قَبْلَكُمْ بِسُؤَالِهِمْ وَاخْتِلَافِهِمْ علَى أَنْبِيَائِهِمْ، فَإِذَا نَهَيْتُكُمْ عن شيءٍ فَاجْتَنِبُوهُ، وإذَا أَمَرْتُكُمْ بِأَمْرٍ فَأْتُوا منه ما اسْتَطَعْتُمْ ﴾[86]واتە : وازم لێبێنن لەوەی وازم لێتان هێناوە ، بەڵنیایەوە ئەوەی ئوممەتانی پێش ئێوەی بە هیلاک برد (زۆری) پرسیارەکانیان و ڕاجیاوازیان لەسەر پێغەمبەرەکانیان بوو ، جاگەر هەر ڕێگریم لێکردن لە هەر شتێک ئەوە خۆتانی لێ بەدوور بگرن ، وە گەر فەرمانم پێتان کرد بۆ ئەنجامدانی شتێک ئەوا ئەنجامی بدەن بە پێی تواناتان ،

بۆیە دەبێت موسڵمان گوێڕایەڵی اللہ تعالی و پێغەمبەرەکەی بێت ﷺ ، جا ئەگەر فەرمانیان پێکرد بۆ شتێک یان ڕێگریان لێکرد لە شتێک ئەوا دەبێت گوێڕایەڵ بێت ،

[85] [ الحشر: ٧ ]

[86] [ رواه البخاري: برقم / ٧٢٨٨ ]

**[٤٦]** مەرجی چوارەم : الله تعالى نە پەرستیت تەنها بە گوێرەی شەریعەتی ئەو نەبێت ،

**۞ ڕونكردنەوە ۞**

ئەم مەرجە شوێنكەوتنی تێدایە بۆ پێغەمبەر ﷺ كە دەبێت شوێنی بكەویت چاوی لێ بكەی ،

وەئەم مەرجەش وڵامە بۆ دوو جۆر كەس و گروپ

یەكەم : وڵامە بۆ هەموو ئەوانەی كە عیبادەت و پەرستن بە تەقلیدی كوێرانەی باب و باپیرانیان دەكەن و ناگەڕێنەوە بۆ سەر سەرچاوە شەڕعیەكان كە بزانن ئایە كارەكەی ئەوان شەرعیە یان شەرعی نیە ،

لەگەڵ ئەوەش دا خۆیان بە موسڵمان دەزانن و نوێژ دەكەن بەڵام گوێ بەوە نادەن كە ئایە نوێژەكەیان لەسەر سونەتە یان نا ، وە قوربانی و عیبادەتی تریان كە دەیكەن كە ئایە لەسەر سونەتە یان نا ، گوێ بەوە نادەن كە ئەو شێوە عیبادەت كردنە بەو شێوەیەیە كە پێغەمبەر ﷺ كردویەتی یان نا ئەوە گوێی پێنادەن ،

وە گەر پێشیان بڵێی سونەت بەو جۆرەیە و دەبێت شوێن سونەت بكەویت و واز لەو تەقلیدە كوێرانەیە بێنێت ، ئەوە دەڵێن لە كۆنەوە هەروابوە یان دەڵێن ئێمە هەر ئاوا هاتوین و هەر ئاوا كردومە ، یان دەڵێن ئەوەی ئێوە دینی تازەیە یان دەڵێت ئەوەی ئێمە لە فكرمان بێت هەر ئاوا ڕۆشتوە ، یان دەڵێن ئەی بۆ هەتا ئێستا كەس شتی وای نەوتوە وەك ئێوە ،

جا ئەم تەقلیدە کوێرانەیە سیفەتی موشریکەکانە کە کاتێک پێغەمبەرانیان بۆ دەنێردرا ئەوا شوێن باب و باپیرانی خۆیان دەکەوتن نەک شوێن پێغەمبەران بکەون (علیهم السلام) ،

وەک الله تعالی فەرموویەتی ﴿ وَكَذلِكَ ما أَرسَلنا مِن قَبلِكَ في قَريَةٍ مِن نَذيرٍ إِلّا قالَ مُترَفوها إِنّا وَجَدنا آباءَنا عَلى أُمَّةٍ وَإِنّا عَلى آثارِهِم مُقتَدونَ ﴾[87] واتە : هەر بەو شێوەیە هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردووە بۆ هیچ شارێك، کە خۆشگوزەرانەکان نەیانوتبێت: ئێمە باوو باپیرانی خۆمان بینیووە پابەندی بیروباوەڕێك بوون، بێگومان ئێمەش چاو لەوان دەکەین و پەیڕەوی ئەوان دەکەین.

وە فەرموویەتی ﴿ قالوا بَل وَجَدنا آباءَنا كَذلِكَ يَفعَلونَ ﴾[88] واتە : وتیان بەڵکو باو باپیرانمان بینیوە ئاوایان کردووە (ئێمەش وا دەکەین) .›

دووەم : ولامە بۆ هەموو ئەوکەسانەی کە الله تعالی دەپەرستن بە شێوەیێک کە نە لە سونەتی پێغەمبەر ﷺ دا هاتوە بەو شێوەیە ، وە نە بەڵگەیێکی دینیان پێیە بۆ ئەو عیبادەتەی کە دەیکەن ،

ئەوانیش وەک سۆفیەکان کە عیبادەت دا دەهێنن لەدین بە گوێرەی فکر و بۆچونی خۆیان یان بە هۆی خەو و خوڕافیات و شتی تری بێمانەوە چەندەها جۆری عیبادەت زیاد دەکەن بۆ دین و ناوی عیبادەتی لێدەنێن ،

---

[87] [ الزخرف: ٢٣ ]

[88] [ الشعراء: ٧٤ ]

مـتـن

وَدَلِـيلُ الصَّـلاةِ، وَالـزَّكَاةِ، وَتَـفْسِيـرُ التَّوْحِيدِ: قَوْلُهُ تَعَالَى: ( وَمَا أُمِرُوا إِلاَّ لِـيَعْبُدُوا اللَّهَ مُـخْلِصِينَ لَـهُ الدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُوا الصَّلاةَ وَيُـؤْتُوا الزَّكَاةَ وَذَلِكَ دِينُ الْقَيِّمَةِ )[البينة: 5].[47]
وَدَلِـيلُ الصِّيَامِ: قَـوْلُهُ تَعَـالَى: ( يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ علَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ )[البقرة: 183][48]..........

جا هەموو ئەوانە بیدعەیە و گومڕاییە ، وە هەر کەسێک بیدعەیێک دا بهێنێت لە دین ئەوا ئەوە ڕەت دەکرێتەوە و قبوڵ ناکرێت چونکە بەڵگەی شەرعی لەسەر نیە و سونەتی پێغەمبەر ﷺ نیە ،

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ﴿ مَن عَمِلَ عَمَلًا ليسَ عليه أمْرُنا فَهو رَدٌّ ﴾[89]واتە : هەر کەسێک کردەوەییێک بکات کە فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت ئەوە ڕەت دەکرێتەوە و قبوڵ ناکرێت .،

وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ﴿ مَن أَحْدَثَ في أَمْرِنَا هذا ما ليسَ فِيهِ، فَهو رَدٌّ ﴾ [90] واتە : هەر کەسێک شتیک لەم دینەی ئێمە دا بهێنێت کە پێشتر تێیدا نەبوە ئەوە ڕەتدەکرێتەوە و قبوڵ ناکرێت .،

بۆیە دەبێت شوێن پێغەمبەر ﷺ بکەوین و چاوی لێبکەین لە وتە و لە کردار و بیرباوەڕ تاوەک و کردەوەکانمان ڕەت نەکرێتەوە ،

وە یەکێک لە مەرجەکانی قبوڵ بونی عیبادەت ئەوەیە کە بە گوێرەی سونەتی پێغەمبەر ﷺ بێت ، جا هەر کەسێک بە پێچەوانەی ئەو عیبادەتێک بکات ئەوە ڕەتدەکرێتەوە قبوڵ ناکرێت ،

---

[89] [ رواه مسلم: برقم / ١٧١٨ ]

[90] [ رواه البخاري: برقم / ٢٦٩٧ ]

[47]بەڵگەی نویژ و زەکات و مانای تەوحید ، ئەو وتەیەی الله تعالى یە فەرموویەتی : فەرمانیشیان پێنەدرابوو جگە بەوەی کە اللهپەرستی بکەن و بەپاکی و دڵسۆزی و ملکەچی فەرمانبەرداری ئاین و بەرنامەکە بن و لابدەن لە هەموو ئایینێك و تەنها پابەندی ئایینی ئیسلام بن، نوێژیش بەڕێك و پێکی ئەنجام بدەن، زەکاتیش لە ماڵ و سامانیان دەربکەن، ئەوەیە ئاینی نامە ڕاست و بەنرخەکانی الله،›

❁ ڕوونکردنەوە ❁

پێناسەی نوێژ لە زمانەوانی دا بریتیە لە : دوعا .

وە پێناسەی نوێژ لە شەرع دا بریتیە لە : پەرستنی الله تعالى بە وتە و کردەوە ، کە بە الله اکبر دەست پێدەکات و بە سەلام دانەوە(السلام علیکم ورحمةالله) کۆتایی پێدێت ، بەنیەت و مەرجە تایبەتیەکانی .

نوێژ گەورەترین عیبادەتی لاشەی یە کە اللهتعالى فەرمانی پێکردوە و فەرزی کردوە لەسەر هەموو موسڵمانێک کە لە شەو و ڕۆژێک دا پێنج جار ئەنجامی بدات ،

پێناسەی زەکات لە زمانەوانی دا بریتیە لە : زیادەی ماڵ(سامان) ، وە پاکرەوەی ماڵ (سامان) ،

پێناسەی زەکات لە شەرعدا بریتیە لە : بەشێکی دیاری کاراو لە سامانێکی دیاری کراو لە کاتێکی دیاری کراو و لە چەند شتێکی (واتا لە چەند شتێک کە داندراون بۆ دەرکردنی زەکات لێی دا ، وەک پارە و ئاڵتون ...هتد) دیاری کراو ،

زەکات گەورەترین عیبادەیەتی ماڵییە (سامانەیە) کە الله تعالى فەرزی کردوە لەسەر موسڵمان خاوەن ماڵ و داوالێکراو (مکلف)

اللە تعالی لە زۆر شوێن نوێژ و زەکاتی بەیەکەوە باسکردوە دوا بە دوای یەک ، وەک فەرموویەتی ﴿ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ ﴾[91]واتە :نوێژ بکەن وزەکات بدەن.›

وە دووەم و سێیەم پایەی ئیسلامن وەک پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ﴿ وإقَامِ الصَّلَاةِ، وإيتَاءِ الزَّكَاةِ، ﴾ [92] واتە : وە نوێژ بکات و زەکات بدات ،

جا ئەو کەسەی کە شایەتی دەدات ئەوە دەبێت نوێژ بکات و زەکات بدات گەر لەسەری بوو ، وە هەر کەسێک نوێژ نەکات و ئینکاری زەکات بکات ئەوە موسڵمانیەتەکەی هەڵدەوەشێتەوە ،

وە مانا و تەفسیری تەوحید لەو ئایەتەی شێخ رحمه اللە هێناویەتی ، بریتیە لەمەی کە اللە تعالی فەرموویەتی ﴿ وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ ﴾ واتا فەرمانیان پێنەکراوە تەنها پەرستنی اللە تعالی نەبێت ، وە ئەمەش دوو شت لەخۆی دەگرێت ،

یەکەم : دان نان بەوەی اللە تعالی بوونی هەیە ،

دووەم : عیبادەت دەکردن بۆ اللە تعالی ، چونکە کەسانێک هەیە کە باوڕیان بە اللە تعالی هەیە بەڵام نای پەرستن ،

بەڵام لێرە جگە لەوەی باوڕیان پێی هەیە ، ئەوە دەشی پەرستن و عیبادەتی بۆ دەکەن ،

وە ئەمەش دوو شت دەر دەخات ، کە باوڕ بوون بە اللە تعالی و پەرستنی اللە تعالی یە ،

[91] [ البقرة: ١١٠ ]

[92] [ رواه البخاري: برقم/٨ ]

پاشان الله تعالى فەرموویەتی ﴿ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ حُنَفَاءَ ﴾ دڵسۆزن و پاک ڕاگری الله تعالى ن لە شیرک ، وە دورن لە شیرک و ئەهلی شیرک ،

وە ئەمەش دوو سێ شت دەر دەخات ،

یەکەم : دڵسۆزبون لە عیبادەتەکان بۆ الله تعالى و بەتاک بەپرستنی لە عیبادەتەکان ،

دووەم : دوور بوون لە شیرک بڕیاردان بۆ الله تعالى ،

سێیەم : دوور بوون لە ئەهلی شیرک و ئەوانەی کراون بە شەریکی الله تعالى ،

وەئەمەش بریتیە لە تەوحید کە بەتاک ڕاگرتنی الله تعالى یە و دور کەوتنەوەیە لە شیرک ،

پاشان الله تعالى فەرموویەتی ﴿ وَذَٰلِكَ دِينُ الْقَيِّمَةِ ﴾ ئا ئەمە بەو شێوەی باسکرا کە ئەو پێنج خاڵە و نوێژ و زەکات بریتیە لە دینی توند و کامڵ و تەواو ،

جا هەر کەسێک باوڕی بە الله تعالى هەبێت و بیپەرستێت بەتاک و تەنها بەدڵسۆزیەوە و دور کەوتبێتەوە لە شیرک و ئەهلەکەی و باوڕی پێیان نەبێت ، ئەوە موحیدە و ئەسڵی دینی لێ هاتۆتە جێ ، وە ئەوەش دینی توند و بەهێز و کامڵ و تەواوە ،

[٤٨] بەڵگە لەسەر ڕۆژو گرتن وتەی الله تعالى یە کە فەرموویەتی : ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ڕۆژووی ڕەمەزان لەسەرتان پێویست کراوە هەر وەکو لەسەر گەلانی پێش ئێوە پێویست کرابوو، بۆ ئەوەی خواناسی و پارێزکاری بکەن.›

❁ **ڕوونکردنەوە** ❁

پێناسەی ڕۆژو لە زمانەوانی دا بریتیە لە : خۆ گرتن لە شتێک ،

پێناسەی ڕۆژو لە شەرعدا بریتیە لە : پەرستنی الله تعالى بە خۆ دور گرتن لە هەموو ئەوشتانەی کە ڕۆژو دەشکێنن لە ماوەی خۆر هەڵاتنەوە هەتا خۆر ئاوا بوون ،

مەبەست لەم ڕۆژوە بریتیە لە ڕۆژی مانگی ڕەمەزان کە یەکێکە لە پایەکانی ئیسلام (پایەیی چوارەمە) ، مەبەست لێی ڕۆژوی سونەت و ڕۆژوەکانی تر نیە ، بەڵکو تەنها ڕۆژوی مانگی ڕەمەزان واجبە لەسەر کەسی موسڵمان کە بە ڕۆژو بێت لە پێناو الله تعالى ، وە خۆی دور بگرێت لەوشتانەی کە ڕۆژوی پێ بەتاڵ دەبێتەوە و دەشکێت ،

الله تعالى فەرموویەتی ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ﴾ الله تعالى بە ئیمانداران دەفەرموێت ، وە ئەمەش بەڵگەیە کە کافران و موشریکان ڕۆژو گرتنیان لەسەر نیە ، وە گەر ڕۆژوش بگرن ئەوە لێیان قبوڵ ناکرێت و سودی بۆیان نیە ، چونکە الله تعالى فەرمووی ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە ، نەیفەرموو ئەی خەڵکینە ، بەڵکو فەرمووی ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە ، وەئەمەش بەڵگەیە کە ڕۆژو تایبەتە بە ئیسلام و موسڵمانان

﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ ﴾ کتب واتە (فرض) وە بەڵکوو لە (فرض) ـەش ئەملاترە ، چونکە (کتب) نوسراوە واتا تەواو بڕیاردراوە و نوسراوە ،

الله تعالى لەسەر موسڵمانان و ئیماندارانی پێویست کردوە کە مانگی ڕەمەزان بەڕۆژو بن ،

﴿ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ ﴾ وەک چۆن لەسەر ئەوانەی پێش ئێوە نوسراوە کە بەڕۆژوبن ،

ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ڕۆژو لەسەر ئومەتەکانی پێشوش پێویست کراوە و نوسراوە لەسەریان ،

وە ئەو وتەی کە فەرموویەتی ﴿ كَمَا ﴾ (وەک چۆن) ئەمە بۆ جۆری ڕۆژەکە نیە ، بەڵکو بۆ فەرزیەتی ڕۆژەوەکەیە ، واتا اللہ تعالی بەو دەرەجەی ڕۆژوی لەسەر ئیمە پێویست کردوە کە لەسەر ئومەتەکانی پێش ئێمەی پێویست کردوە ،

چونکە ڕۆژی ئێمە جیاوازی هەیە لەگەڵ ڕۆژی ئومەتەکەنی پێشوو ، وەک ئەوەی لە ناو نەصرانیەت ڕۆژو گرتن لە دەبوو قسەش نەکەیت ، وەک اللہ تعالی باسی دەکات ﴿ فَكُلِي وَاشرَبِي وَقَرِّي عَينًا فَإِمّا تَرَيِنَّ مِنَ البَشَرِ أَحَدًا فَقولي إِنّي نَذَرتُ لِلرَّحمنِ صَومًا فَلَن أُكَلِّمَ اليَومَ إِنسِيًّا ﴾[93]واتە : ئینجا لەو خورمایە بخۆ، لەو ئاوەیش بخۆرەوە، خەمیشت نەبێت،ئەگەر کەسێکت لە خەڵکی بینی و (پرسیاری لێ کردی)، ئەوە بە ئیشارەت تێی بگەیەنە پێی بڵێ: بەڕاستی من بڕیارمداوە و نەزرم کردووە بە ڕۆژوو بم بۆ اللہ ی میهرەبانم، لەبەر ئەوە ئەمڕۆ من هەرگیز قسە لەگەڵ کەسدا ناکەم.›

لە ڕۆژوی ئەوان دا ئەوە بوە کە قسەنەکەن ، تا کاتی ڕۆژیان تەواو دەبێت بەڵام لە ڕۆژوی ئێمەدا قسەکردن دروستە ، بەڵام قسەکردنی بێسود و بێمانا و حەڕام ئەوە لە پاداشت و تەواویەتی ڕۆژەکە کەم دەکات نەک ڕۆژوەکە نەهێڵێت و بیشکێنێت ،

﴿ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴾ بۆ ئەوەی خۆتان لە حەڕامکراوەکان بە دور بگرن و تەقوا کار و خۆپارێز کار بن ،

---

[93] [ مریم: ٢٦ ]

مـتـن

وَدَلِـيلُ الْحَـجِّ: قَـوْلُهُ تَعَـالَى: ( وَلِلّهِ عَـلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْـهِ سَبِيـلًا وَمَـن كَفَرَ فَإِنَّ الله غَنِيٌّ عَنِ الْعَالَمِينَ )[آل عمران: 97].[49]

الْمَرْتَبَةُ الثَّانِيَةُ: الإِيمَانُ

وَهُـوَ بِضْعُ وَسَبْـعُونَ شُعْبَةً، فَـأَعْلاهَا قَـوْلُ لا اله إِلا اللهُ، وَأَدْنَاهَا إِمَاطَةُ الأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ، وَالْحَيَاءُ شُعْبَةُ مِنْ الإِيمَانِ.[50].................................

وە ئەمە حیکمەتە لە بەڕۆژو بون ، جا گەر پرسیارت لێکرا بۆچی موسڵمان دەبێت بە ڕۆژو بێت ئەوا پێی بڵێ بۆ ئەوەی تەقوای اللہ تعالی بکات و خۆی بە دور بگرێت و لە حەڕامکراوەکان ، وە گوێڕایەڵی اللہ تعالی بێت بەوەی سەرپێچی نەکات و لە فەرمانی لا نەدات ،

ڕۆژو عیبادەتێکی لاشەیی و ناخییە ، کەسی بە ڕۆژو بوو دەگرێتەوە لە زۆر شت ، وە خاوی دەکاتەوە لە چەندین بواردا ، وە دوری دەخاتەوە لە چەندین حەڕام ،

[49]بەڵگەی حەج وتەی اللہ تعالی یە کەفەرموویەتی : جا اللہ تعالی ﷻ بڕیاریداوە لەسەر خەڵکی حەج و سەردانی (بیت الحرام) بکەن بە تەنها ئەوانەی کە توانای (دارایی و تەندروستیان) هەیە، جا ئەوەی کە باوەڕی نەهێناوە، ئەوە با بزانێت بەڕاستی اللہ تعالی بێ نیازە لە هەموو خەڵکان (پێویستی بە چاکە و پەرستنی کەس نیە).

❁ **ڕوونکردنەوە** ❁

پێناسەی حەج لە زمانەوانی دا بریتیە لە : مەبەست ،

پێناسەی حەج لە شەرعدا بریتیە لە : مەبەست بوونی كعبة بۆ پەرستنی الله تعالی بە چەند كار و كردەوییەكی دیاری كراو و تایبەت (وەک تەواف و صەفا و مەڕوا.. هتد ) ،

حەج عیبادەتی لاشەیی و ماڵییە ، کە نوێژ و زیکری تێدایە کە لاشەییە ، وە خوێن ڕشتن و قوربانی تێدایە کە ماڵییە ،

حەج تەنها لەیەک شوێن دەکرێت ئەویش لە مكة لە (مسجد الحرام) ، نەک لە کەربەلا و کفری و شوێنی تر ، بەڵکو تەنها لە شاری مەکە دەکرێت بە چەند جۆر عیبادەتی دیاری کراو وەک تەواف و عەرەفە و صەفاو مەڕوا ،

الله تعالی فەرموویەتی ﴿ وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ ﴾ مافی الله تعالی هەیە لەسەر خەڵكی ، واتە پێویستە لەسەر خەڵکی و الله تعالی پێویستی کردوە لەسەریان کە حج بکەن،

گەر دیقەت بدەیت دەبینیت لێرە الله تعالی حەجی تەنها لەسەر ئیمانداران پێویست نەکرد بەڵکوو فەرمووی پێویستە لەسەر خەڵکی کە حەج بکەن بۆ الله تعالی ،

وە ئەمەش دەکرێت لەبەر دوو شت بێت ،

یەکەم : هۆکاری ئایەتەکە دەگەڕێتەوە بۆ دەمکوت کردن و جولەکە کە خۆیان وا نیشان دەدا کە موسڵمان و شوێن کەوتوی پێغەمبەرانن ، جا الله تعالی فەرمووی لەسەر خەڵکیە کە حەج بکەن ، تا دەری خات کە ئایە جولەکە ڕاستگۆن لە قسەکەیان یان نا ، وە هەر بۆیەش لە کۆتایی فەرمووی ﴿ وَمَنْ كَفَرَ فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ الْعَالَمِينَ ﴾ جا هەر کەسێک بێباوڕ بێت بەحج ئەوە الله تعالی دەوڵەمەندە بەسەر دروست کراوەکانیەوە ،

جا ئەوکات درۆی جولەکە کەشف بوو کە خۆیان بە موسڵمان نیشاندە دا کەچی بێباوەڕ بوون بەحج ،

دووەم : حەج عیبادەتێکە کە بەتاک ڕاگرتنی الله تعالی ی تێدایە لە عیبادەت دا لە چەندین ڕووەوە ، وەک تەواف کە نوێژە ، یان کە داواکردنی لە ڕۆژی عەرەفە ، وە سەر بڕین و قوربانی کردن ، هەموو ئەمانە بەتاک پەرستنی الله تعالی ی تێدایە و تەوحیدی پێوە بەستراوەتەوە ، وە لەسەر هەموو خەڵکیشەکە الله تعالی بەتاک و تەنها بپەرستن ، بۆیەش مادام ئەوەی تەوحیدی الله تعالی پێوە بەستراوەتەوە ، ئەوە داوا لە هەموو مرۆڤەکان کراوە کە ئەنجامی بدەن ، چونکە بەتاک و پەرستنی الله تعالی یە ،

﴿ حِجُّ الْبَيْتِ ﴾ کە سەر دانی ماڵی الله تعالی بکەن کە کعبة یە ، البیت لەم ئایەتە بە مانای کعبة دێت ،

﴿ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ﴾ الله تعالی لێرە ڕوخسەتی داناوە بۆ موسڵمانان ، کە گەر توانایان نەبوو ئەوا لۆمە ناکرێن لەوەی حەج نەکەن ، وە مەبەستیش لەوەی بۆ هەر کەسێک کە توانای هەبوو ، بریتیە لەوەی کە توانای ماڵی هەبێت ، وەک سامان ، وە توانای لاشەیی هەبێت تا بڕوات بۆی ، بەڵام ئەوەش ئێستا یەکیان ئاسان بوە ، کە ڕێگایە و خەڵکی بەتەیارە یاخود سەیارە سەفەر دەکەن ،

جا گەر کەسێک توانای لاشەیی نەبوو بچێت ئەوە لۆمە ناکرێت ، وە یان گەر سامانی نەبوو ئەوا لۆمە ناکرێت گەر نەی کات ، بەڵام گەر کەسێک توانای ماڵی و سامانی هەبوو ئەوە لەسەری فەرزە کە حەج ێک بکات ، وە گەر ویستی بکات بە دوو ئەوە ئەوەی دوەم سونەتە ، بەڵام هەموو موسڵمانێک لە ژیانی حەجێکی لەسەر واجبە کە ئەنجامی بدات ،

﴿ وَمَنْ كَفَرَ فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ الْعَالَمِينَ ﴾ جا هەر کەسێک بێباوەڕ بێت بە حەج کردن و باوڕی پێنەهێنی ، ئەوە اللّٰه تعالى زۆر دەوڵەمەندە بەسەر هەموو دروست کراوەکانی و بێ نیازە لە کردەوەی بەندەکانی و پەکی نەکەوتوە لەسەریان ،

[٥٠]پلەی دووەم : ئیمان

بریتیە لە حەفتا و هەندێک بەش ، بەرزترینییان بریتیە لە وتەی لااله الا اللّٰه ، وە نزمترنییان بریتیە لە لابردنی ناڕەحەتیێک لەسەر ڕێگا ،وە شەرم و حەیاش بەشێکە لە ئیمان ،

❁ ڕوونکردنەوە ❁

ئەم پێناسەی شێخ (رحمەاللّٰە) بریتیە لەو وتەیەی کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ﴿ الإيمانُ بضعٌ وسبعون شعبةً ، أعلاها( أو فأفْضَلُها ) قولُ لا إله إلا اللّٰهُ ، وأدناها إماطةُ الأذى عن الطريق[94] ، والحَيَاءُ شُعْبَةٌ مِنَ الإيمَانِ ﴾[95]

ئیمان لە زمانەوانیدا بریتیە لە : بەڕاست زانین و دانپێدانان ،

اللّٰه تعالى فەرموویەتی ﴿ قالوا يا أبانا إنّا ذَهَبنا نَستَبِقُ وَتَرَكنا يوسُفَ عِندَ مَتاعِنا فَأَكَلَهُ الذِّئبُ وَما أَنتَ بِمُؤمِنٍ لَنا وَلَو كُنّا صادِقينَ ﴾[96]واتە : ووتیان ئەی باوکی ئێمە بەڕاستی ئێمە ڕۆیشتین پێشبڕکێمان دەکرد و یوسفمان لای شتومەکەکانمان بەجێ هێشت بۆیە گورگ خواردی وە تۆ قەت باوەڕ بە ئێمە ناکەیت هەرچەند ئێمە ڕاستگۆش بین. ›

[94] [رواه مسلم: برقم ٣٥ ]
[95] [ رواه البخاري: برقم ٩ ]
[96] [ يوسف: ١٧ ]

موفەسرین لە تەفسیری وتەی ﴿ أَنتَ بِمُؤمِنٍ لَنا ﴾ دەڵێت واتە (بمصدق لنا) ، یانی تۆ ئێمە بەڕاست نازانیت ،

وە لە شەرعدا بریتیە لە : بەڕاست زانیت و دان نان بە شەش شت ئەوانیش الله تعالی و پێغەمبەرەکەی و کتێبەکانی و مەلائیکەتەکان و ڕۆژی دوایی و قەدەر خێر و شەری ،

بەڵگەی ئەمەش لە دواتر باسدەکەین کە شێخ (رحمەالله) هێناویەتی ،

وە ئەو بەڕاست زانین و دانپێدانانە دەبێت بە سێ شت بێت ، ئەوانیش

یەکەم : بە دڵ (بیروباوەڕ) دەبێت کەسی موسڵمان بڕوای تەواوی بەو شەش شتە هەبێت و بەڕاستیان بخاتەوە و بەڕاستی بزانێت ،

دووەم : بە زمان (وتە) دەبێت کەسی موسڵمان دان بەو شەش شتە دابنێت و دەری بڕێت بەزمان ، چونکە دەکرێت لە دڵ بڕوای پێ هەبێت بەڵام دەری نەبێت ، بەڵام تەنها بەڕاست زانینی دڵ بەس نیە بەڵکوو دەبێت بەزمان و وتەش دەری بڕێت و بەڕاستی بزانێت و دانی پێدابنێت ،

سێیەم : بەئەندامەکانی لاشە (کردەوە) دەبێت کەسی موسڵمان بە ئەندامەکانێ لاشە دەری بڕێت و دانی پێدابێت کە بڕوای بەو شەش شتە هەیە ، وە ئەوەش بەوەی شوێنی بکەوێت و گوێڕایەڵ بێت ، وە پێچەوانەی ئەنجام نەدات بە لاشە ،

جا هیچ یەکێک لەم سیانە بەبێ ئەوەی تر نابێت و سودی نیە بۆ خاوەنەکەی ،

لله تعالی فەرموویەتی ﴿ قالَتِ الأَعرابُ آمَنّا قُل لَم تُؤمِنوا وَلكِن قولوا أَسلَمنا وَلَمّا يَدخُلِ الإيمانُ في قُلوبِكُم وَإِن تُطيعُوا اللَّهَ وَرَسولَهُ لا يَلِتكُم مِن أَعمالِكُم

شَيئًا إِنَّ اللَّهَ غَفورٌ رَحيمٌ ﴾[97] واته : عەرەبە دەشتەکیەکان وتیان باوەڕمان هێناوە (ئەی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم)) بڵێ باوەڕتان نەهێناوە بەڵکو بڵێن موسوڵمان بووین (بەسەر زارەکی) چونکە هێشتا باوەڕ نەچۆتە ناو دڵەکانتانەوە خۆ ئەگەر گوێ ڕایەڵی الله تعالى و پێغەمبەرەکەی بن هیچ لە (پاداشتی) کردەوەکانتان کەم ناکاتەوە بەڕاستی الله تعالى لێبوردەی میهرەبانە.›

وە ئەمەش بەڵگەی ڕونە کە جێگای ئێمە لە دڵ دایە ، چونکە الله تعالى فەرمووی ﴿ وَلَمّا يَدخُلِ الإيمانُ في قُلوبِكُم ﴾ واتە : لەبەر ئەوەی هێشتا ئیمان نەچۆتە دڵتانەوە ،

وە لەو فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ دەردەکەوێت کە ئیمان بریتیە لە وتە وەک فەرمووی ﴿ قولُ لا إله إلا اللهُ ﴾ واتە : وتەی لاالە الاالله ،

وە هەر لە فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ دەر دەکەوێت کە کردەوەش لە ئیمانە و ئیمانیش لە کردارە ، وەک فەرمووی ﴿ وأدناها إماطةُ الأذى عن الطريقِ ﴾ واتە : نزمترین بەشی ئیمان بریتیە لە لابردنی نارحەتی لەسەر ڕێگا ، وە فەرمووی ﴿والحَيَاءُ شُعْبَةٌ مِنَ الإيمَانِ ﴾ واتە : وە شەرم کردن و بە ئابڕو بوون بەشێکە لەئیمان ،

جا شەرم کردن و لابردنی نارەحەتی لەسەر ڕێگا ، هەر دووکیان کردەوەی لاشەیین و کردەوەن ، وە ئەمەش دەبێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی ئیمان کردەوەیە ، جا لەسەر موسڵمانە کە بەم سێ ستەی باسمان کرد کە بیرو باوەڕ و وتە و کردار بوو ، دەبێت ئیمان بهێنێت بە شەش شت کە الله تعالى و پێغەمبەرەکەی و مەلائیکەت و کتابەکان و ڕۆژی دوایی و قەدەر بەخێر و شەڕەوە ،

---

[97] [ الحجرات: ١٤ ]

متن

وَأَرْكَانُهُ سِتَّةٌ:أَنْ تُـؤْمِنَ بِـاللهِ[51]وَمَـلائِـكَتِهِ[52]وَكُـتُبِهِ[53]وَرُسُلِـهِ[54] وَالْيَوْمِ الآخِرِ[55]وَتُـؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ[56]وَالدَّلِيلُ علَى هَذِهِ الأَرْكَانِ السِّتَةِ:قَوْلُهُ تَعَالَى:(لَّيْسَ الْبِرَّ أَن تُوَلُّواْ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْـرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَالْمَلآئِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ)[البقرة :177]ودليل القدر:قَوْلُهُ تَعَالَى:(إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ)[القمر:49].[57]

وە هەر کەسێک لەو سێ شتە دانەیێکی نوقستان بێت یان لە شەش شتەکە دانەیێکی نوقستان بێت ئەوا ئیمانەکەی سودی بۆی نابێت ، و نای خاتە بەهەشتەوە ،

[٥١]پایەکانی ئیمان

پایەکانی ئیمان : شەش دانەن ئەوانیش بریتین لەوەی

یەکەم : ئیمان بهێنی بە ﷲ تعالی

❁ ڕوونکردنەوە ❁

ئیمان شەش پایەی هەیە کە دەبێت هەموو کەسێکی موسڵمان بڕوای تەواوی پێی هەبێت و بەڕاستی بزانێت و دانی پێدابنێت ، (وەک لە پێناسەکەی باسمان کرد ،)

وە هەر کەسێک ئیمان بەیەکێک لەم پایانە نەهێنێت ئەوە بە ئیماندار دانانرێت و ئیمانی نوقستانە ، وە گەر کافر بێت ئەوە بەبێ یەکێک لەمانە نابێت بە ئیماندار ئەگەر چی باوڕی بە پێنجەکەی تر هەبێت ،

وەگەر موسڵمان بوو پاشان باوەڕی بەیەکێک لەمانە نەما و بێباوڕ بوو پێی ئەوا ئیمانی هەڵدەوشێتەوە و کافر دەبێت ،

یەکەم پایە بریتیە لە ئیمان هێنان بە ﷲ تعالی ،

وە ئیمان هێنان بە الله تعالى سێ شت لە خۆی دەگرێت ئەوانیش ،

یەکەم : ئیمان هێنان بە هەبوون و وجودی الله تعالى کە دەبێت مرۆڤ بڕوای بەوە هەبێت کە الله تعالى بوونی هەیە ، چونکە کەسی وا هەیە بڕوای بە وجودی الله تعالى نیە یان لەگومان دایە ، وەک مولحیدەکە و هەندێک لە موشریکانی پێشوو ،

الله تعالى دەفەرموێت ﴿ وَقالوا إِنّا كَفَرنا بِما أُرسِلتُم بِهِ وَإِنّا لَفي شَكٍّ مِمّا تَدعونَنا إِلَيهِ مُريبٍ – قالَت رُسُلُهُم أَفِي اللَّهِ شَكٌّ فاطِرِ السَّماواتِ وَالأَرضِ يَدعوكُم لِيَغفِرَ لَكُم مِن ذُنوبِكُم ﴾[98]واتە : (موشریکان)وتیان بەڕاستی ئێمە بێ بڕواین بەو (پەیامە) ی کە بە ئێوەدا نێردراوە وە بەڕاستی ئێمە لە گوماندایین لەوەی بانگمان دەکەن بۆ لای و دوو دڵین. پێغەمبەرەکانیان : وتیان (پێیان) ئایا لە الله دا گومان هەیە کە بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی یە بانگتان دەکات بۆ ئەوەی لە گوناهەکانتان خۆش بێت.،

بۆیە دەبێت سەرەتا ئیمان بە وجودی الله تعالى بهێنێت ، ئەگەر چی باوڕ بوون بە وجودی الله تعالى لە سروشتی هەموو مرۆڤێک هەیە ، بەڵام هەندێک جار مرۆڤ بەهۆی کوفر و شیرک و گومڕاییەوە ئەو سروشتەی لەیاد دەکات و پش گوێی دەخات ، بەڵام کەسێک کە دەیەوێت موسڵمان بێت و ئیمان بە الله تعالى بێنێت دەبێت سەرەتا ئیمان و باوڕی دامەزراوی هەبێت بەوەی الله تعالى وجودی (بوونی) هەیە ،

دووەم : ئیمان هێنان بەوەی کە الله تعالى شایەنی پەرستنە و دەبێت بپەرسترێت ،

[98] [إبراهيم: ٩ – ١٠]

بێگومان باوەڕ بوون بە وجودی الله تعالى ئیمان هێنان پێی کاملْ ناکات هەتاوەکو دان بەوە دانەنێ و ئیمان بەوە نەهێنی کە الله تعالى شایەنی پەرستنە ،

الله تعالى فەرموویەتی ﴿ وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾[99] واتە : بێگومان من پەری و ئادەمیزاد م دروست نەکردووەتەنها بۆ ئەوەنەبێت کەمن بپەرستن و فەرمانبەردارم بن .›

وە الله تعالى فەرموویەتی ﴿ إِنَّ هذِهِ أُمَّتُكُم أُمَّةً واحِدَةً وَأَنا رَبُّكُم فَاعبُدونِ ﴾[100] واتە : خەڵکینە ! بەڕاستی ئەم ئایینەی کە ئەم پێغەمبەرانە هێناویانە ئایینەکەی ئێوەیە، کە یەک ئایینە و منیش پەروەردگارتانم، تەنها من بپەرستن.›

وە الله تعالى فەرموویەتی ﴿ يا عِبادِيَ الَّذينَ آمَنوا إِنَّ أَرضي واسِعَةٌ فَإِيّايَ فَاعبُدونِ ﴾[101] واتە : ئەی بەندەیانێکم کە باوەڕتان هێناوە بێگومان زەوی من پان و فراوانە کەواتە هەر من بپەرستن.›

بۆیە دەبێت کەسی موسڵمان باوەڕ بەوەش بێنێت کە الله تعالى دەبێت بپەرسترێت وە دەبێت بی پەرستێت ،

چونکە کەسی وا هەیە باوڕی بە وجودی الله تعالى هەیە بەڵام نای پەرستیت ، بۆیە دەبێت کەسی باوەڕ بە الله تعالى بێنێت و بی پەرستێت ،

سێیەم : ئیمان هێنان بەوەی کە تەنها الله تعالى شایستەی ئەوەیە بپەرسترێت بە تاک و تەنها ،

---

[99] [ الذاريات: ٥٦ ]

[100] [ الأنبياء: ٩٢ ]

[101] [ العنكبوت: ٥٦ ]

وە جگەلەوەی کە دەبێت باوەڕ بە وجودی الله تعالى بهێنیت وە باوڕ بەوەش بێنیت کە الله تعالى شایەنی پەرستنە ، ئەوە دەبێت باوەڕ بەوەش بهێنی کە الله تعالى بەتاک و تەنها شایەنی پەرستنە و هیچ پەرستراوێکی تر نیە لە غەیری ئەو کە شایەنی پەرستن بێت بەحەق ،

بەڵکو تەنها الله تعالى شایەنی ئەوەیە کە بپەرسترێت بەحەق بەتاک و تەنها دوور لە شەریک و هاوبەش دانان بۆی ،

دەبێت الله تعالى بپەرستنی بەتاک و تەنها ، نەک هەر باوەڕ بەو وجودی الله تعالى بهێنی و بیپەرستنی و گوێنەدەیت بەوەی کە شەریکی بۆ بڕیار دەدەیت یان نا ، بەڵکوو تەنها پەرستن بێت و تەواو ، نەخێر ئەم ئیمان هێنانە تەواو و نیە و قبوڵ کراو نیە ، بەڵکو ئەو ئیمانە تەواو و قبوڵە کە بەتاک ڕاگرتنی و بەتاک پەرستنی الله تعالى تێدایە لە پەستن دا ، وە دورە لە شەریک و هاوبەش دانان بۆی ،

الله تعالى فەرموویەتی ﴿ وَما أَرسَلنا مِن قَبلِكَ مِن رَسولٍ إِلّا نوحي إِلَيهِ أَنَّهُ لا إِلٰهَ إِلّا أَنا فَاعبُدونِ ﴾[102]واتە : وە ئێمە نەمان ناردووە پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێك مەگەر نیگامان بۆ ناردووە (بەوەی کە) بێگومان جگە لە من هیچ پەرستراوێك نی یە بەحەق ، کەواتە تەنها من بپەرستن.›

وە الله تعالى فەرموویەتی ﴿ وَاعبُدُوا اللَّهَ وَلا تُشرِكوا بِهِ شَيئًا ﴾[103]واتە ئەی خەڵکینە) تەنها الله تعالى بپەرستن و هیچ جۆرە شەریک و هاوەڵێکی بۆ بڕیار مەدەن.›

[102] [ الأنبياء: ٢٥ ]
[103] [ النساء: ٣٦ ]

وه الله تعالى فەرموویەتی ﴿ لَقَد أَرسَلنا نوحًا إِلى قَومِهِ فَقالَ يا قَومِ اعبُدُوا اللَّهَ ما لَكُم مِن إِلهٍ غَيرُهُ إِنّي أَخافُ عَلَيكُم عَذابَ يَومٍ عَظيمٍ ﴾ [104] واته : سوێند به الله بەڕاستی ئێمه - نوح – مان ڕەوانه كرد بۆ سەر قەومەكەی، جا ئەویش پێی وتن: ئەی گەل و هۆزم ئێوه هەر الله تعالى بپەرستن، چونكه جگه لەو زاته پەرستراوێكی ترتان نیه، بەڕاستی من دەترسم لەڕۆژێكی گەورەدا تووشی بەڵاو سزایەكی زۆر سەخت ببن.›

وه الله تعالى فەرموویەتی ﴿ فَآمِنوا بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ وَلا تَقولوا ثَلاثَةٌ انتَهوا خَيرًا لَكُم إِنَّمَا اللَّهُ إِلهٌ واحِدٌ سُبحانَهُ أَن يَكونَ لَهُ وَلَدٌ ﴾ [105] واته : ، ده ئیتر باوەڕی دامەزراو به خوایەتی الله تعالى و به پێغەمبەرانی بهێنن، هەرگیز مەڵێن الله تعالى سیانه (لەو گوفتاره نابەجێ یه) واز بهێنن چاكتره و قازانجتانه، چونكه بەڕاستی الله تعالى تەنها یەک تاكه خوایه، پاک و بێگەردو دووره لەوەی كه منداڵی ببێت.›

وه الله تعالى فەرموویەتی ﴿ ذلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ هُوَ الحَقُّ وَأَنَّ ما يَدعونَ مِن دونِهِ هُوَ الباطِلُ وَأَنَّ اللَّهَ هُوَ العَلِيُّ الكَبيرُ ﴾ [106] واته : ئەمه لەبەر ئەوەیه بەڕاستی هەر الله تعالى هەق و ڕاسته وه بێگومان ئەوەی جگه له الله تعالى هاواری لێ دەكەن (دەیپەرستن) هەر ئەوه بەتاڵ و ناڕاست و بەڕاستی الله تعالى هەر خۆی بەرزو بڵندو گەورەیه.›

بۆیه لەسەر كەسی موسڵمانه كه باوڕ بەوه بێنێت كه الله تعالى بوونی هەیه ، وه شایەنی پەرستنه ، وه بەتاک و تەنها شایەنی پەرستنه و دوره لەشەریک و هاوبەش ، وه هەر كەسێكیش شەریک و هاوبەشی بۆ بڕیار بدات(مەبەست لەو

[104] [ الأعراف: ٥٩ ]
[105] [ النساء: ١٧١ ]
[106] [ الحج: ٦٢ ]

شیرکەیە کە خاوەنەکەی دەر دەکات لە ئیسلام ، کە ئەویش شیرکی گەورەیە )
ئەوە ئیمانی هەڵدەوەشێتەوە دەر دەچێت لە ئیسلام ،

وە ئەم ئیمان هێنانە بەوەی کە هیچ پەرستراوێک نیە شایەنی پەرستن بێت تەنها
الله تعالى نەبێت ، لە سێ بەش خۆی دەگرێتەوە و پێکهاتەوە ، ئەوانیش

یەکەم : بەتاک ڕاگرتنی الله تعالى لە کردەوەکانی دا (توحيد الربوبية)

دووەم : بەتاک ڕاگرتنی الله تعالى لە پەرستن دا (توحيد الألوهية)

سێیەم : بەتاک ڕاگرتنی الله تعالى لە ناو و سیفەتەکانی دا (توحيد الأسماء
والصفات)

یەکەم : بەتاک ڕاگرتنی الله تعالى لە کردەوەکانی دا (توحيد الربوبية)

ئەم بەتاگ ڕاگرتنە بریتیە لە بەتاک ڕاگرتنی الله تعالى لە کردەوەکانی خۆی ،

وەک ڕزقدان و باران باراندن و بەڕێو بردنی جیهان و دروست کردن و ژیاندن و
مراندن ، و چەندین کاری تر ، کە هەمووی تایبەتە بە الله تعالى و ماف و بەشی
هیچ یەکێکی تێدا نیە لە دروست کراوەکان نە پێغەمبەران و مەلائیەکەت و
پیاو چاکان ،

بەڵگە لەسەر ئەوەی الله تعالى دروست کەرە ،

الله تعالى فەرموویەتی ﴿ إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذي خَلَقَ السَّماواتِ وَالأَرضَ في سِتَّةِ أَيّامٍ ثُمَّ استَوى عَلَى العَرشِ يُغشِي اللَّيلَ النَّهارَ يَطلُبُهُ حَثيثًا وَالشَّمسَ وَالقَمَرَ وَالنُّجومَ مُسَخَّراتٍ بِأَمرِهِ أَلا لَهُ الخَلقُ وَالأَمرُ تَبارَكَ اللَّهُ رَبُّ العالَمينَ ﴾[107]واتە :
بەڕاستی پەروەردگارتان ئەو خوایەیە کە ئاسمانەکان و زەوی لە شەش ڕۆژدا

[107] [ الأعراف: ٥٤ ]

دروست کردووە پاشان ( الله تعالى) چووە سەر عەرش (ئێمە ئیمانمان پێ یەتی بەڵام شێوەکەی نازانین) بە( تاریکایی) شەو( ڕۆشنایی) ڕۆژ دادەپۆشێ (بەپێچەوانەشەوە) (ڕۆژ بەشوێن شەوەوەیە بە خێرایی و) شەو بەشوێن ڕۆژەوەیە بە خێرایی خۆرو مانگ و ئەستێرەکانیش ژێر بار کراوون بەفەرمانی خۆی بێدار بن کە بەدی هێنان و فەرماندان هەر بۆ خوایە پاك و بێ گەردە(لەهەموو کەم و کوڕی یەك) خوای پەروەردگاری جیهانیان. ›

وە الله تعالى فەرموویەتی ﴿ خَلَقَ الْإِنْسَانَ مِنْ عَلَقٍ ﴾[108]واتە : ئادەمیزادی لە چەند خانەیەکی هەڵواسراو (لەناو منداڵداندا) دروست کردووە.›

وە الله تعالى فەرموویەتی ﴿ وَخَلَقَ كُلَّ شَيءٍ فَقَدَّرَهُ تَقديرًا ﴾ [109]واتە : هەموو شتێکی دروستکردووە بە ئەندازەو قەبارە و شێوە و تام و بۆن و ڕەنگ و جیاوازی هەمە جۆر...هتد، نەخشەی ڕێک و پێکی بۆ هەموو شتێک داناوە (بە شێوەیەک کە پێویستیەکانی ئادەمیزاد دابین بکەن و لە خزمەتیدا بن).›

بەڵگە لەسەر ئەوەی کە الله تعالى ژیێنەر و مرێنەرە ،

وە الله تعالى فەرموویەتی ﴿ كَيفَ تَكفُرونَ بِاللَّهِ وَكُنتُم أَمواتًا فَأَحياكُم ثُمَّ يُميتُكُم ثُمَّ يُحييكُم ثُمَّ إِلَيهِ تُرجَعونَ ﴾ [110] واتە : (خەڵکینە)، چۆن بێ بڕوا دەبن بە الله تعالى لەکاتێکدا ئێوە بێ گیان بوون (لە توێی خاکدا) خوا (دروستی کردوون) و گیانی بەبەردا کردن، پاشان دەتانمرێنێت و دوایی زیندووتان دەکاتەوە، ئەوسا هەر بۆ لای ئەویش دەبرێنەوە.›

---

[108] [ العلق: ٢ ]
[109] [ الفرقان: ٢ ]
[110] [ البقرة: ٢٨ ]

بەڵگە لەسەر ئەوەی کە الله تعالی باران بارێنەرە ،

الله تعالی فەرموویەتی ﴿ إِنَّ اللَّهَ عِندَهُ عِلمُ السّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الغَيث ﴾[111]واتە : بەڕاستی هەر الله تعالی خۆی زانیاری بەرپابوونی ڕۆژی قیامەت دەزانێت، بارانیش هەر ئەو دەیبارێنێت، ›

بەڵگە لەسەر ئەوەی الله تعالی بە ڕێوبەری جیهانەکانە و کار و بار هەڵدەوسوڕێنێ

الله تعالی فەرموویەتی ﴿ قُل مَن يَرزُقُكُم مِنَ السَّماءِ وَالأَرضِ أَمَّن يَملِكُ السَّمعَ وَالأَبصارَ وَمَن يُخرِجُ الحَيَّ مِنَ المَيِّتِ وَيُخرِجُ المَيِّتَ مِنَ الحَيِّ وَمَن يُدَبِّرُ الأَمرَ فَسَيَقولونَ اللَّهُ فَقُل أَفَلا تَتَّقونَ ﴾[112]واتە : ئەی محمد( ﷺ ) بڵێ ئایا کێ ڕسق و ڕۆزی تان دەدات لە ئاسمان (بە باران) و لە زەوی یەوە (بە ڕووەك) یا کێ خاوەنی (دروست کەری) گوێ و چاوانە وە کێ زیندوو لە مردوو دەردەهێنێ وە مردوو لە زیندوو دەردەهێنێ هەروەها کێ کارەکان هەڵدەسوڕێنێ بێگومان یەکسەر دەڵێن الله کەواتە (ئەی محمد(ﷺ) پێیان بڵێ دەی بۆ خۆتان ناپارێزن لە سزای الله ؟›

ئەمە بریتیە لە تەوحیدی الربوبیة کە بەتاک ڕاگرتنی الله تعالی یە لە کردەوەکانی کە نابێت کەس بکەیت بە شیرک و هاوبەش بۆ الله تعالی لەوەی کە کەسێک یان یەکێک لە دروستکراوەکان ڕزقی مرۆڤ دەدات یان بارانی بۆ دەبارێنێت یان گەردون بە ڕێوە دەبات یان شیفا دەدات یان دەمرێنێت ،

نابێت کەس بکەیت بە شەریکی الله تعالی لەکردەوەکانی ،

[111] [ لقمان: ٣٤ ]
[112] [ یونس: ٣١ ]

جا هەر کەسێک شتێک بکات بەشەریکی الله تعالی لە کارەکانی ئەوە ئیمانی هەڵدەوشێتەوە و کافر دەبێت ، وە دەچێتە دەرەوەی ئیسلام بەهۆیەوە ،

دووەم : بەتاک ڕاگرتنی الله تعالی لە پەرستن دا (توحيد الألوهية)

ئەم تەوحیدە بریتیە لە بەتاک ڕاگرتنی الله تعالی لە پەرستنەکان دا کە ئەوەش کرداری بەندەیە لەبەرامبەر بۆ الله تعالی ،

لە توحیدی الربوبية کردەوەی الله تعالی بوو لەسەر بەندەکان ، بەڵام تەوحیدی دووەم بریتیە لە کردەوەکانی بەندە بۆ الله تعالی ، وە ئەوکردەوانەش بریتیە لە عیبادەتەکان کە الله تعالی داوای لە بەندەکانی کردوە بۆی ئەنجام بدەن ،

ئەو عیبادەتانەش ، وەک نوێژ و ڕۆژو و زەکات دان و حەج کردن و جیهاد کردن لە پێناو الله تعالی و چاکە کردن لەگەڵ دایک وباوک و ئەنجامدانی کاری خێر و قوربانی کردن و چاک بوون لەگەڵ موسڵمانان و ئەنجامدانی ،

هەموو ئەو عیبادەتە و ئەوانەی تریش کە الله تعالی داوای لە بەندەکانی کردوە کە بۆی ئەنجام بدەن ، دەبێت کەسی موسڵمان ئەنجامی بدات بۆ الله تعالی ،

بەڵگە لەسەر نوێژ و زەکات

الله تعالی فەرموویەنی ﴿ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَارْكَعُوا مَعَ الرَّاكِعِينَ ﴾[113] واتە : نوێژ بکەن و زەکات بدەن وەلەگەڵ کڕنوش بەراندا کڕنوش بەرن.›

بەڵگە لەسەر ڕۆژو

[113] [ البقرة: ٤٣ ]

اللّٰه تعالى فەرموویەتی ﴿ يا أَيُّهَا الَّذينَ آمَنوا كُتِبَ عَلَيكُمُ الصِّيامُ ﴾[114] واتە : ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە ڕۆژووتان لەسەر نووسراوە (کە ئەنجامی بدەن).›

بەڵگە لەسەر چاکە کردن لەگەڵ دایک و باوک

اللّٰه تعالى فەرموویەتی ﴿ وَقَضى رَبُّكَ أَلّا تَعبُدوا إِلّا إِيّاهُ وَبِالوالِدَينِ إِحسانًا ﴾ [115] واتە : وە پەروەردگارت بڕیاری داوە کە هیچ شتێ نەپەرستن بێجگە لە ئەو وە لەگەڵ دایك و باوکتان چاکە بکەن .›

بەڵگە لەسەر جیهاد

اللّٰه تعالى فەرموویەتی ﴿ يا أَيُّهَا الَّذينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَابتَغوا إِلَيهِ الوَسيلَةَ وَجاهِدوا في سَبيلِهِ لَعَلَّكُم تُفلِحونَ ﴾ [116] واتە :ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە لە اللّٰه بترسن بگەڕێن بەدوای هەموو هۆکارێکدا کە نزیکتان بخاتەوە لە اللّٰه ، وە تێ بکۆشن و خەبات بکەن لە ڕێگەی اللّٰه تعالى دا بە ئومێدی ڕزگار بوونتان.›

بەڵگە لەسەر حەج

اللّٰه تعالى فەرموویەتی ﴿ وَلِلَّهِ عَلَى النّاسِ حِجُّ البَيتِ ﴾ [117] واتە : مافی اللّٰه تعالى لەسەر خەڵکی کە سەردانی ماڵی اللّٰه تعالى(المسجد الحرام) بکەن.›

بەڵگە لەسەر قوربانی کردن

---

[114] [ البقرة: ١٨٣ ]
[115] [ الإسراء: ٢٣ ]
[116] [ المائدة: ٣٥ ]
[117] [ آل عمران: ٩٧ ]

الله تعالى فەرموویەنی ﴿ قُل إِنَّ صَلاتي وَنُسُكي وَمَحيايَ وَمَماتي لِلَّهِ رَبِّ العالَمينَ ﴾ [118] واتە : ئەی محمد( ﷺ ) بڵێ بێگومان نوێژ و (بەندایەتی) و قوربانی و ژیان و مردنم هەر بۆ الله ی پەروەردگاری هەموو جیهانیانە.›

بەڵگە لەسەر باش بوون هاوکاری کردنی موسڵمان

الله تعالى فەرموویەنی ﴿ وَتَعاوَنوا عَلَى البِرِّ وَالتَّقوى ﴾ [119] واتە : وە هاوکاری یەکتری بکەن لەسەر چاکە و پارێزگاری.›

هەموو ئەم عیبادەتانە و ئەوانی تریش کە الله تعالى داوای لە بەندەکانی کردوە کە ئەنجامی بدەن ، دەبێت موسڵمان ئەنجامی بدات بۆ الله تعالى بەتاک و تەنها ، نابێت بەهیچ شێوەیێک شەریک و هاو بەش بڕیار بدات بۆ الله تعالى ، جا هەر کەسێک شەریک و هاو بەش بۆ الله تعالى بڕیار بدات ئەوە موشریک دەبێت (گەر شیرکەکەشیرکی گەورە بێت ) .

سێیەم : بەتاک ڕاگرتنی الله تعالى لە ناو و سیفەتەکانی دا (توحيد الأسماء والصفات)

الله تعالى ناوی جوان و سیفاتی بەرزی و تەواوی هەیە ،

الله تعالى فەرموویەتی ﴿ وَلِلَّهِ الأَسماءُ الحُسنى فَادعوهُ بِها وَذَرُوا الَّذينَ يُلحِدونَ في أَسمائِهِ سَيُجزَونَ ما كانوا يَعمَلونَ ﴾[120]واتە : هەر بۆ الله یە هەموو ناوە جوان و پیرۆزەکان، جا (ئەی ئیمانداران) بەو ناوانە دۆعا و نزا بکەن و هاناو هاوار بۆ ئەو زاتە بەرن، واز بهێنن لەوانەی کە لە ناوە پیرۆزەکانی الله دا لادان

[118] [ الأنعام: ١٦٢ ]
[119] [ المائدة: ٢ ]
[120] [ الأعراف: ١٨٠ ]

دەکەن و (سیفەت و ناوەکانی الله تعالی بەکاردەهێنن بۆ غەیری الله)، لە ئایندەدا پاداشتی ئەو کارو کردەوانەیان وەردەگرن کە ئەنجامیان دەدا.›

وە الله تعالی فەرموویەتی ﴿ وَلِلَّهِ الْمَثَلُ الْأَعْلَىٰ ۚ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾[121] واتە : وە پەروەردگاریش خاوەنی هەموو سیفاتی بەرزو بڵندو پیرۆزە ئەو زاتە هەر خۆیشی باڵادەست و دانایە.›

لەم ئایەتە دا (المثل) بەمانای سیفەت دێت ،

وە لەسەر موسڵمان پێویستە کە هەر کاتێک یەکێک لەناوەکانی الله تعالى ی پێ گەیشت یان سیفەتێک لە سیفەتەکانی الله تعالى ی پێگەیشت ئەوە خۆی لەم چوار خاڵە بەدور بگرێت ،

یەکەم : التحريف ( گۆڕینی ماناکەی )

دووەم : التعطيل ( پەکخستنی ناو یان سیفەتەکە )

سێیەم : الكيفية ( دیاری کردنی چۆنیەتیەکەی )

چوارەم : التمثيل ( نمونە بۆ هێناوە و شوبهاندنی )

نابێت کەسی موسڵمان هیچ یەکێک لەمانە ئەنجام بدات لەبەرامبەر ناو و سیفەتەکانی الله تعالی ، بەڵکوو دەبێت دانی پێدا بێنت و ئیمانی پێ بهێنێت ، وە چۆنیەتیەکەی بگەڕێنێتەوە بۆ الله تعالی ،

لەبەر ئەوەی الله تعالی وەک دروست کراوەکانی نییە ،

121 [ النحل : ٦٠ ]

الله تعالى فەرموویەتی ﴿ لَيسَ كَمِثلِهِ شَيءٌ وَهُوَ السَّميعُ البَصيرُ ﴾[122] واتە : هیچ شتێك نیە لە وێنەی ئەوزاتە، هیچ شتێك لەو ناچێح ، هەر ئەویش بیسەرو بینایە.›

وە فەرموویەنی ﴿ فَلا تَضرِبوا لِلَّهِ الأَمثالَ إِنَّ اللَّهَ يَعلَمُ وَأَنتُم لا تَعلَمونَ ﴾ [123] واتە : کەواتە وێنە بۆ الله تعالى مەهێننەوە بەڕاستی الله تعالى دەزانێ و ئێوە نازانن.›

وەفەرموویەتی ﴿ رَبُّ السَّماواتِ وَالأَرضِ وَما بَينَهُما فَاعبُدهُ وَاصطَبِر لِعِبادَتِهِ هَل تَعلَمُ لَهُ سَمِيًّا ﴾ [124] واتە : ئەو زاتە پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و هەموو دروستکراوانی نێوانیانە، کەواتە، هەر ئەو بپەرستە و زۆر بەردەوام و خۆگربە لە پەرستنیدا، ئایا کەس شک دەبەیت هاوناوی ئەو و هاوتای ئەو بێت؟ (خاوەنی سیفەتی بەرزو بڵندو پیرۆز بێت وەک ئەو؟!).›

ئەم بەشانەی تەوحید زۆر وردەکاری و تەفصیلی تێدایە کە پێویستە کەسی موسڵمان زانستی پێیان هەبێت و شارەزابێت لێیان ، دەبێت زۆر زیاتر بخوێنێت لە بارەیانەوە تاوەکو توشی هیچ گومڕایی و هەڵە نەبێت ، وە بەتایبەتی لەباسی ئەم تەوحیدە کە زۆرترینی گروپە گومڕاکان لەم بەشتە تێکەووتوون و گومڕا بوونە ، بۆیە پێویستە کە کەسی موسڵمان شارەزایی تەواوی هەبێت لە بارەیانەوە تا دور بێت لە هەموو گومڕاییێک ،

وە بزانە کە هیچ یەکێک لەم تەوحیدانە کامڵ و تەواو نابێت تەنها بە دوو ڕوکنی سەرەکی نەبێت کە ئەوانیش بریتین لە

122 [ الشورى: ١١ ]
123 [ النحل: ٧٤ ]
124 [ مريم: ٦٥ ]

یەکەم : النفي( ڕەتکردنەوە )

دووەم : الإثبات( دان پێدانان )

جا لە هەر یەکێک لە بەشی تەوحیدەکان پێویستە ئەم دوو ڕوکنە جێ بەجێ بکەیت چونکە تەوحید قبوڵ کراو نابێت بەبێ ئەم دوو ڕونکە بەڵکو کەس نابێت بە خاوەنی تەوحید ئیلا دەبێت ئەم دوو ڕوکنە ئەنجام بدات ،

جا ئەم دوو ڕوکنەش بەم شێوەیە لەبەشی بەتاک ڕاگرتنی الله تعالی لە کردەوەکانی بریتیە لەوەی کە هەرچی کردەوەی الله تعالی یە وەک ڕزق دان و باران بیرین و شیفادان کردەوەکانی تری ، ئەوە دەبێت دانی پێدانێیت بۆ الله تعالی (کە ئەمەش بریتیە لە الإثبات)، وە ڕەتی بکەیتەوە بۆ غەیری الله تعالی کە ئەو کردارەی هەبێت کە شیفادان و ڕزق دان و هتد..(کە ئەمەش بریتیە لە النفي) ، جا ئەگەر بەندە ، دانی بەوە دانا کە الله تعالی شیفا دەدات ، بەڵام شیفادانی بۆ غەیری الله تعالی ڕەت نەکردوە ، وەک سۆفی و درەوێشەکان کە دەڵێن الله تعالی شیفادەرە کە ئەمەش دان پێدانانە ، بەڵام لەهەمان کاتدا داوای شیفا لە غەیری الله تعالی دەکەن ، کە ئەوەش ڕەت نەکردنەوەی کاری شیفادانە بۆ غەیری الله تعالی ،

جا هەر کەسیک شیفادان ڕەت نەکاتەوە (یان کارە تایبەتیەکانی تری الله تعالی) بۆ غەیری الله تعالی ئەوە ئەو کەسانەی کە موشریکە ،

وە لە بەتاک ڕاگرتنی الله تعالی لە پەرستنەکان دا بریتیە لەوەی کە هەرچی عیبادەت هەیە کە الله تعالی داوای لە بەندەکانی کردوە کە بۆی ئەنجام بدەن ئەوە دەبێت کەسی موسڵمان دان بەوە دابنێت کە دەبیت ئەو عیبادەتە بۆ الله تعالی ئەنجام بدات وە ئەنجامشی بدات ، وە دەبێت لە هەمان کاتدا ئەوە

ڕەتبکاتەوە کە یەکێک لەم عیبادەتانە بۆ غەیری الله تعالی ئەنجام بدات ، وەک نوێژ و ڕۆژو و قوربانی کردن حوکم گێڕانەوە جیهاد کردن ،

جا ئەگەر بەندە دانی بەوە دانا کە دەبێت قوربانی بۆ الله تعالی ئەنجام بدات ، ئەوە دەبێت ڕەتی بکاتەوە کە قوربانی بۆ غەیری الله تعالی ئەنجام بدات ، جا ئەگەر بێت و دانی بەوە دانا کە قوربانی بۆ الله تعالی ئەنجام بدات پاشان ڕۆشت قوربانی بۆ غەیری الله تعالی ئەنجام دا ئەوە یەکێک لە ڕوکنەکانی تەواوکردنی تەوحیدی ئەنجام نەداوە وە بە ئەنجام نەدانی یەکێک لەم ڕوکنانە ئەوا تەوحیدی خاوەنەکەی قبوڵ کراو نابێت ، وە بە موشریک حساب دەکرێت ،

وە لە تەوحیدی سێیەم دوو ڕوکنەکە بەم شێوەیە کە بریتیە لەوەی هەرچی الله تعالی دانی پێدانەوە بۆ خۆی لەناو و سیفەتەکانی یان پێغەمبەرەکەی ﷺ باس و وەسفی پێکردوە ،ئەوە دەبێت دانی پێدا بێنی بۆ الله تعالی کە خاوەنی ئەو ناو و سیفەتانەیە ، وە لە هەمان کات دا ڕەتی بکاتەوە کە یەکێک لە دروست کراوەکانی الله تعالی هاوشێوەی الله تعالی خاوەنی ئەو ناو سیفاتە بێت ، وە ئەمەش بریتیە لە دان پێدانان و ڕەتکردەوە لە بەتاک ڕاگرتنی الله تعالی لە ناو و سیفەتەکانی دا ،

جا ئەگەر کەسێک دانی نەنا بەناوێک یان بە سیفەتێک لە سیفەتەکانی الله تعالی و ڕەتی کردەوە ، وە یان کەسێک ناو یاخود سیفەتێک لە سیفەتە تایبەتیەکانی الله تعالی بۆ غەیری الله تعالی دان پێدانان ، ئەوە ئەو کەسە کافر و موشریک دەبێت ،

وە هەموو ئەوەش لە گرینگی و گەورەیی ئەو دوو ڕونکەیە کە لە بەشەکانی تەوحیدن ، وە هەر ئەوەشە جیاوازی خستۆتە نێوان موسڵمان و موشریک ،

[٥٢]دووەم : ئیمان هێنان بە مەلائیکەتەکان

۞ **ڕوونکردنەوە** ۞

یەکێکی تر لە پایەکانی ئیمان بریتیە لە ئیمان هێنان بە مەلائیکەتەکانی اللە تعالی ، وە ئیمان هێنان بە مەلائیکەتەکان پێنج شت لە خۆی دەگرێت ، کە ئەوانیش

یەکەم : بە وجود (بوون)یان

بێگومان مەلائیکەتەکان بونیان هەیە ، وە بەچەندین بەڵگەی دینی و بەڵگەی ئەوەی کە چەندین کەس بینیویانە ،

اللە تعالی فەرموویەتی ﴿ وَإذ قُلنا لِلمَلائِكَةِ اسجُدوا لِآدَمَ فَسَجَدوا إِلّا إِبليسَ أَبى وَاستَكبَرَ وَكانَ مِنَ الكافِرينَ ﴾ [125]واتە :کاتێکیش بەفریشتەکانمان وت: سوژدە بەرن بۆ ئادەم (سوژدەی ڕێزو بەفەرمانی اللە تعالی، وەکو ڕووگەیەك) سوژدەیان برد، جگە ئیبلیس نەبێت کە سەرپێچی کردو خۆی بە گەورەزانی و خۆی خستە ڕیزی کافرەکانەوە.›

وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ﴿ إنَّ للَّهِ ملائِكَةً سيَّاحينَ في الأَرضِ ﴾[126] واتە : اللە تعالی چەند مەلائیکەتێکی هەیە کە لەسەر زەوی دەگرێن و دەسورێن .›

دووەم : بە کردارەکانیان

مەلائیکەتەکانی اللە تعالی بێکار نین و بێ مەبەست دروست نەکراون بەڵکوو کاریان هەیە و ئەنجامی دەدەن ،

---

[125] [ البقرة: ٣٤ ]

[126] [ حديث صحيح رواه الترمذي: برقم / ٣٦٠٠ ]

لە كارەكانیان بریتیە لە بەتاك ڕاگرتنی اللّٰه تعالی و دور گرتنی لە شەریک و هاوبەش بۆی ،

اللّٰه تعالی فەرموویەتی ﴿ شَهِدَ اللَّهُ أَنَّهُ لا إِلٰهَ إِلّا هُوَ وَالمَلائِكَةُ وَأُولُو العِلمِ قائِمًا بِالقِسطِ لا إِلٰهَ إِلّا هُوَ العَزيزُ الحَكيمُ ﴾ [127] واتە : اللّٰه تعالی شایەتی ئەدات(واتە ڕای دەگەیەنێت و بەبەڵگە دەی چەسپێنێت) كە بەڕاستی هیچ پەرستراوێک نی یە ئەو نەبێ وە فریشتەكانیش شایەتی ئەدەن (واتە ئیقرار ئەكەن) وە خاوەن زانستەكانیش شایەتی ئەدەن(واتە باوەڕی چەسپاویان هەیە)،( اللّٰه تعالی هەمیشە دادپەروەری ڕاگرتووە هیچ پەرستراوێكی بەڕاستی نی یە تەنیا اللّٰهتعالی نەبێ كە باڵادەستی كاربەجێ یە.›

وە اللّٰه تعالی فەرموویەتی ﴿ وَيُسَبِّحُ الرَّعدُ بِحَمدِهِ وَالمَلائِكَةُ مِن خيفَتِهِ وَيُرسِلُ الصَّواعِقَ فَيُصيبُ بِها مَن يَشاءُ وَهُم يُجادِلونَ فِي اللَّهِ وَهُوَ شَديدُ المِحالِ ﴾[128]واتە : وە هەورە گرمە سوپاس و ستایشی ئەو ( اللّٰه تعالی) دەكات هەروەها فریشتەكانیش لە هەیبەت و ترسی ئەو ( اللّٰه تعالی ستایشی دەكەن) وە (پەروەردگار) هەورە بروسكەكان دەنێرێ و دەیدات لە هەر كەسێ كە بیەوێ لە كاتێكدا ئەوانە دەمە دەمێ دەكەن دەربارەی اللّٰه و ئەو ( اللّٰه ) هێزو توانای زۆر بەتینە.›

وە اللّٰه تعالی فەرموویەتی ﴿ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً قَالُوا أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ قَالَ إِنِّي أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾ [129] واتە : كاتێک كەپەروەردگاری تۆ بە فریشتەكانی وت بەڕاستی من جێ نشینێک دروست دەكەم لەسەر زەوی

---

[127] [ آل عمران: ١٨ ]

[128] [ الرعد: ١٣ ]

[129] [ البقرة: ٣٠ ]

فریشتەکان وتیان: ئایا کەسێکی وای تیا دروست دەکەیت کە خراپەو بەدیی تێدا بکات وە خوێنی تیا بڕێژێ ،؟ لە کاتێکدا کە ئێمە یادت دەکەین بەستایش کردنت وە بەپاک ڕات دەگرین( اللّٰه تعالی) فەرموی: بێگومان ئەوەی من دەیزانم ئێوە نایزانن .›

ئەوەی کە لە ئەسڵدا بۆی دروست کراون بریتیە لەوەی کە عیبادەتی اللّٰه تعالی بکەن و هەمیشە بە پاک و بێگەردی و بێ کەم و کوڕی ڕای بگرن.

بەڵام چەندین کاری تریشیان هەیە وەک سەلام و دوعاکردن بۆ ئەهلی ئیمان وە موژدەدان بە ئەهلی ئیمان ،وە لەعنەت لەئەهلی کافران وچەندین کاری تر،

بەڵگە لەسەر ئەوەی فریشتەکان سەلام و صلوات دەنێرن بۆ پێغەمبەر ﷺ ،

اللّٰه تعالی فەرموویەتی ﴿ إِنَّ اللَّهَ وَمَلائِكَتَهُ يُصَلّونَ عَلَى النَّبِيِّ يا أَيُّهَا الَّذينَ آمَنوا صَلّوا عَلَيهِ وَسَلِّموا تَسليمًا ﴾ [130] واتە : بەڕاستی اللّٰه تعالی و فریشتەکانی سەڵاوات دەدەن لەسەر پێغەمبەر(صلی اللّٰه علیه وسلم) ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە ئێوەش سەڵات و سەلامی زۆری لەسەر بدەن.›

بەڵگە لەسەر ئەوەی مەلائیکەتەکان سەلام دەکەن لە ئەهلی ئیمان ،

اللّٰه تعالی فەرموویەتی ﴿ الَّذينَ تَتَوَفّاهُمُ المَلائِكَةُ طَيِّبينَ يَقولونَ سَلامٌ عَلَيكُمُ ادخُلُوا الجَنَّةَ بِما كُنتُم تَعمَلونَ ﴾ [131]واتە : ئەوانەی کەفریشتەکان (ی گیان کێشان) گیانیان دەکێشن بە پاکی (فریشتەکان) دەڵێن سەلامتان لێ بێ بچنە بەهەشتەوە بەهۆی ئەوەی کەدەتان کرد (لە دنیا) دا.›

[130] [ الأحزاب: ٥٦ ]

[131] [ النحل: ٣٢ ]

بەڵگە لەسەر ئەوەی مەلائیکەتەکان موژدە دەدەن بە ئەهلی ئیمان

اللّٰە تعالی فەرموویەتی ﴿ فَنادَتهُ المَلائِكَةُ وَهُوَ قائِمٌ يُصَلّي فِي المِحرابِ أَنَّ اللَّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحيى مُصَدِّقًا بِكَلِمَةٍ مِنَ اللَّهِ وَسَيِّدًا وَحَصورًا وَنَبِيًّا مِنَ الصّالِحينَ ﴾[132] واتە : جا فریشتە بانگی لێکرد لەکاتێکدا کە زەکەریا لە میحرابەکەدا وێستابوو نوێژی دەکرد بەڕاستی اللّٰە تعالی مژدەت دەداتێ بە(کوڕێک ناوی) یەحیایە کە بڕواهێنەرە بە عیسای وتەی اللّٰە تعالی و پێشەوایە وە جڵەوگری نەفسی خۆیەتی وە یەکێکە لە پێغەمبەرانی چاک کردار.›

بەڵگە لەسەر ئەوەی مەلائیکەتەکان موژدەی ئاگر بە کافران دەدن ،

اللّٰە تعالی فەرموویەتی ﴿ وَلَو تَرى إِذ يَتَوَفَّى الَّذينَ كَفَرُوا المَلائِكَةُ يَضرِبونَ وُجوهَهُم وَأَدبارَهُم وَذوقوا عَذابَ الحَريقِ ﴾[133] واتە : وە ئەگەر دەتبینی کاتێ فریشتەکان گیانی بێ باوەڕان دەکێشن لە دەموچاوو پاشیان دەدەن و (پێیان دەڵێن) بچەژن سزای ئاگری سوتێنەر.›

بەڵگە لەسەر ئەوەی کە مەلائیکەتەکان لەعنەت لە کافران دەکەن .

اللّٰە تعالی فەرموویەتی ﴿ إِنَّ الَّذينَ كَفَروا وَماتوا وَهُم كُفّارٌ أُولئِكَ عَلَيهِم لَعنَةُ اللَّهِ وَالمَلائِكَةِ وَالنّاسِ أَجمَعينَ ﴾[134] واتە : بەڕاستی ئەوانەی بێ بڕوابوون و مردوون و بێ بڕوا بوون ئەوانە لەسەریانە نەفرینی اللّٰە تعالی و فریشتەکان و خەڵکی بەتێکڕایی .›

[132] [ آل عمران: ٣٩ ]

[133] [ الأنفال: ٥٠ ]

[134] [ البقرة: ١٦١ ]

ئەمانە هەموو کار مەلائیکەتەکانن ، جا لەسەر ئەهلی ئیمان و موسڵمانان پێویستە کە ئیمان بە کاری فریشتەکان بهێنن هەر کاتێک کە بەڵگەی ڕاستیان پێ گەیشت لەسەر ئەوەی کە ئەم کارە کاری مەلائیکەتەکانە ،

سێیەم : بەوەی لە نور دروست کراون

اللّٰه تعالی مەلائیکەتەکانی لە نور دروست کردوە ، وە لەسەر موسڵمان پێویستە کە ئیمانی پێ بهێنت و بەڕاستی بزانێت

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی ﴿ خُلِقَتِ الْمَلَائِكَةُ مِنْ نُورٍ ﴾ [135] واتە : مەلائیکەکەت لە نور دروست کراوە .›

چوارەم : بە ناوەکانیان

مەلائیکەتەکانی اللّٰه تعالی ناویان هەیە بەڵام ئێمە ناوی هەمویان نازانین ، بەڵکوو تەنها ئەوە دەزانین کە لە قورئان و فەرموودەی ڕاست پێمان گەیشتوە ، وەک

جوبرائیل و میکاپیل و ئسرافیل و ملك الموت و ڕەقیب و عەتید و هاروت و ماروت ...هتد..

جا هەر یەکێک لەم ناوانە کە موسڵمان پێی گەیشت لە بەڵگەی ڕاست و تەواو ئەوە پێویستە کە ئیمانی پێ بهێنت و بەڕاستی بزانێت ،

پێنجەم : بەوەی گوێڕایەڵن و سەرپێچی کەرنین

مەلائیکەتەکان هەرگیز سەرپێچی فەرمانی اللّٰه تعالی ناکەن ، بەڵکوو هەموو کات گوێڕایەڵ و ملکەچن بۆ فەرمانی اللّٰه تعالی ،

[135] [ راوه مسلم برقم / ٢٩٩٦ ]

الله تعالى فەرموويەتى ﴿ يا أَيُّهَا الَّذينَ آمَنوا قوا أَنفُسَكُم وَأَهليكُم نارًا وَقودُهَا النّاسُ وَالحِجارَةُ عَلَيها مَلائِكَةٌ غِلاظٌ شِدادٌ لا يَعصونَ اللَّهَ ما أَمَرَهُم وَيَفعَلونَ ما يُؤمَرونَ ﴾ [136]واتە : ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە خۆتان و کەس و کارتان بپارێزن لە ئاگرێك کە سووتەمەنی یەکەی ئادەمی و بەردە سەرپەرشتی ئەو (ئاگری دۆزەخەن) چەند فریشتەیەکی دڵ ڕەق توند و تیژی وا کە نافەرمانی الله تعالى ناکەن لەوەی کە فەرمانیان پێ بدات وە چ فەرمانێکیان پێ بدرێ دەیکەن.›

بۆیە پێویستە لەسەر کەسی ئیماندار کە ئیمان بهێنێت بە مەلائیکە ، وە مەرج نیە کەسێک ناوی مەلائیکەتەکانی نەزانی ئەوە کافربێت ، یان گەر کاریانی نەزانی ئەوە کافر بێت ، یان گەر نەیزانی لەچی دروست کراون ئەوە کافر بێت ، بەڵکو لەبەر ئەوە کافر دەبێت کە بڕوا بەیەکێک لەوانە نەهێنێ ، وەک بڵێت مەلائیکە لە نور دروست نەکراون یان بڵێت مەلائیکەتەکان بێکارن ،

[٥٣]سێیەم : ئیمان بهێنی بە پەرتوکەکان ( ئاسمانیەکان )

۞ ڕوونکردنەوە ۞

ئیمان هێنان بە کتابەکان چوار شت لەخۆی دەگرێت ئەوانیش

یەکەم : ئیمان هێنان بەوەی کە ئەم کتابانە لەلایان الله تعالى ەوە دابەزیوون بۆ پێغەمبەران (عليهم السلام)

الله تعالى فەرموويەتى ﴿ وَكَذلِكَ أَنزَلنا إِلَيكَ الكِتابَ ﴾ [137] واتە : هەروەك (پێغەمبەرانی پێشوو) قورئانمان بۆ تۆ ئەی محمد( ﷺ ) ناردە خوارەوە.›

[136] [ التحريم: ٦ ]

[137] [ العنكبوت: ٤٧ ]

وە فەرموویەتی ﴿ إِنّا أَنزَلنا إِلَيكَ الكِتابَ بِالحَقّ فَاعبُدِ اللَّهَ مُخلِصًا لَهُ الدّينَ ﴾ [138]واتە : بێگومان ئێمە بە حەق و ڕاستی قورئانمان بۆ تۆ هێناوەتە خوارەوە كەواتە اللّٰه تعالی بپەرستەو بە تەنها هەر بۆ ئەو ملكەچ بە.›

وە فەرموویەتی ﴿ لَقَد أَنزَلنا إِلَيكُم كِتابًا فيهِ ذِكرُكُم أَفَلا تَعقِلونَ ﴾ [139] واتە : سوێند بە اللّٰه ناردومانەتە خوارەوە كتێبێك بۆ ئێوە كە سەربەرزی و ناوبانگی ئێوەی تێدایە دەی ئایا بۆ بیر ناكەنەوە.›

وە فەرموویەتی ﴿ يا أَيُّهَا النّاسُ قَد جاءَكُم بُرهانٌ مِن رَبِّكُم وَأَنزَلنا إِلَيكُم نورًا مُبينًا ﴾ [140] واتە : ئەی خەڵكینە بەڕاستی بۆتان هات بەڵگەی ئاشكرا لە پەروەردگارتانەوە، وە ناردمانە خوارەوە بۆتان ڕووناكی یەكی ئاشكراكەر (واتە قورئان).›

وە فەرموویەتی ﴿ إِنّا أَنزَلناهُ قُرآنًا عَرَبِيًّا لَعَلَّكُم تَعقِلونَ ﴾ [141] واتە : بەڕاستی ئێمە ناردومانەتە خوارەوە قورئانێك بە عەرەبی بۆ ئەوەی ژیربن و لێ ی تێ بگەن.›

دووەم : بەڕاست زانینی ئەو هەو هەواڵ و باسانەی كە تێیدا هاتووە ،

پێویستە لەسەر كەسی موسڵمان كە هەر چی لەو كتابە دا هەیە و دابەزیوە لەلایان اللّٰه تعالی ەوە ئەوە بەڕاستی بزانێت و ئیمانی پێ بهێنی ، چونكە هەر كەسێك بەڕاستی نەزانێت ، یان بە درۆی بزانێت ئەوە كافرە ،

[138] [ الزمر: ٢ ]
[139] [ الأنبياء: ١٠ ]
[140] [ النساء: ١٧٤ ]
[141] [ يوسف: ٢ ]

الله تعالى فەرموویەتی ﴿ وَلَقَد أَنزَلنا إِلَيكَ آياتٍ بَيِّناتٍ وَما يَكفُرُ بِها إِلَّا الفاسِقونَ ﴾ [142] واته : سوێند بە الله بێگومان بۆمان ناردوویت چەند نیشانەیەكی ڕوون و ئاشكرا(كە قورئانە) وە كەس بێ بڕوا نابێت پێیان، مەگەر بەدكاران.›

وە فەرموویەتی ﴿ وَالَّذينَ كَفَروا وَكَذَّبوا بِآياتِنا أُولئِكَ أَصحابُ النّارِ هُم فيها خالِدونَ ﴾ [143] واته : وە ئەوانەی كەبێ بڕوابوون و نیشانە و ئایەتەكانی ئێمەیان بەدرۆ زانی ئەوانە هاوەڵ و هاودەمی ئاگرن تیایدا ئەمێننەوە بەهەتا هەتایی .›

وە فەرموویەتی ﴿ مِن قَبلُ هُدًى لِلنّاسِ وَأَنزَلَ الفُرقانَ إِنَّ الَّذينَ كَفَروا بِآياتِ اللَّهِ لَهُم عَذابٌ شَديدٌ وَاللَّهُ عَزيزٌ ذُو انتِقامٍ ﴾ [144] واته : لەپێش قورئاندا بەڕێنموونیی خەڵكی وە ناردیە خوارەوە فورقان(واتە: جیاكەرەوەی ڕاست و ناڕاست _ مەبەست پێ ی قورئانە) بێگومان ئەوانەی كە بێ بڕوابوون بە ئایەتەكانی الله تعالى بۆیان هەیە (لە قیامەت دا) سزای سەخت وە الله تعالى باڵا دەست و بەتوانایە خاوەنی تۆڵەو سزایە.›

وە فەرموویەتی ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ ۚ فَالَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يُؤْمِنُونَ بِهِ ۖ وَمِنْ هَٰؤُلَاءِ مَنْ يُؤْمِنُ بِهِ ۚ وَمَا يَجْحَدُ بِآيَاتِنَا إِلَّا الْكَافِرُونَ ﴾ [145] واته : هەروەك (پێغەمبەرانی پێشوو) قورئانمان بۆ تۆ ئەی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم) ناردە خوارەوە جا ئەو كەسانەی كە كتێبمان پێداون (هەندێكیان) باوەڕ بەو (قورئانە) دێنێ وە لەمانەش (بت پەرستەكانی عەرەب) كەسانێ بڕوای پێ دێنێ تەنیا بێ باوەڕانی (ڕۆچوو) دان نانێن بە ئایەتەكانی ئێمەدا.›

[142] [ البقرة: ٩٩ ]
[143] [ البقرة: ٣٩ ]
[144] [ آل عمران: ٤ ]
[145] [ العنكبوت: ٤٧ ]

بۆیە پێویستە لەسەر کەسی موسڵمان کەوا ئیمان بهێنت بە وتەکان و کتابەکانی الله تعالى چونکە گەر ئیمان بە ئایەتەکانی الله تعالى نەهێنێ ئەوە بە کافر حساب دەکرێت و کافردەبێت ، چونکە ئایەت بۆ دووشت بە کار دێت ، یان قورئان و وتەی الله تعالى ، یان دروست کراوەکانی الله تعالى وەک خۆر و مانگ و شەو و ڕۆژ ، جا ئەو ئایەتانەی هێناومانە مەبەست لە وتە و کتابی الله تعالى یە نەک خۆر و مانگ ،

سێیەم : دەبیت حوکم بەو کتابانە بکرێت کە لەلایان الله تعالى ەوە دابەزیوە وە نابێت پشت گوێ بخرێن و حوکم بە غەیری ئەو بکرێت ،

وە قورئان هەموو کتابەکانی پێش خۆی نسخ(مەبەست لەوەیە کە قورئان جێگارەوەی هەموو ئەوانەی پێش خۆیەتی و دەبێت حوکم بە قورئان بکرێت لە جیات ئەوەی بە کتابەکانی تر بکرێت) کردۆتەوە ،

الله تعالى فەرموویەتی ﴿ وَأَنزَلنا إِلَيكَ الكِتابَ بِالحَقِّ مُصَدِّقًا لِما بَينَ يَدَيهِ مِنَ الكِتابِ وَمُهَيمِنًا عَلَيهِ فَاحكُم بَينَهُم بِما أَنزَلَ اللَّهُ وَلا تَتَّبِع أَهواءَهُم عَمّا جاءَكَ مِنَ الحَقِّ ﴾[146] واتە : ئێمە قورئانمان هاوڕێ لەگەڵ هەموو حەقیقەت و ڕاستیەکدا بۆ تۆ دابەزاندووە، ڕاستی و دروستی کتێبەکانی پێش خۆیشی دیاری دەکات و چاودێرە بەسەر هەموویاندا (کاتێک خاوەنانی کتێب لە گاورو جوو گیروگرفتیان دەهێنن بۆ لای تۆ) بەو بەرنامەیەی الله تعالى ناردوویەتی داوەریی بکە لە نێوانیانداو شوێن ئارەزووەکانی ئەوان مەکەوەو لەو حەقە لامەدە کە بۆت ڕەوانە کراوە، ›

146 [ المائدة: ٤٨ ]

وە فەرموویەتی ﴿ إنّا أَنزَلنا إِلَيكَ الكِتابَ بِالحَقِّ لِتَحكُمَ بَينَ النّاسِ بِما أَراكَ اللَّهُ وَلا تَكُن لِلخائِنينَ خَصيمًا ﴾[147] واتە : بێگومان ئێمە دامان بەزاندۆتە سەر تۆ ئەم قورئانە بەڕاستی بۆ ئەوەی بڕیار بدەی لە نێوان خەڵكیدا بەو بڕیارەی كە اللە تعالی نیشانی داویت وە بۆ ناپاكان مەبە بە پارێزەر و داواچی.›

وە حوكم كردن دەبێت بە دوو مەرجەوە بێت ئەوانیش

یەكەم : ملكەچ بون و قبوڵ بوون ،

ئەوەش لەبەر ئەوەی اللە تعالی فەرموویەتی ﴿ فَلا وَرَبِّكَ لا يُؤمِنونَ حَتّى يُحَكِّموكَ فيما شَجَرَ بَينَهُم ثُمَّ لا يَجِدوا في أَنفُسِهِم حَرَجًا مِمّا قَضَيتَ وَيُسَلِّموا تَسليمًا ﴾ [148] واتە : نەخێر(وانی یە كە خۆیان بە باوەڕدار نیشان دەدەن) سوێند بە پەروەردگارت بڕوا دارنین تا تۆ نەكەنە دادوەر لەهەر ئاژاوە و دووبەرەكی یەكی نێوانیان دا لەپاشان هەست نەكەن لە دەرونیاندا بە هیچ بێزاری یەک لەو بڕیارەی تۆ داوتە و مل كەچ نەكەن بە مل كەچی یەكی تەواو.›

دووەم : پێڕازی بوونن و پێ خۆش بوون

ئەوەش لەبەر ئەوەی اللە تعالی فەرموویەتی ﴿ وَالَّذِينَ كَفَرُوا فَتَعْسًا لَّهُمْ وَأَضَلَّ أَعْمَالَهُمْ – ذلِكَ بِأَنَّهُم كَرِهوا ما أَنزَلَ اللَّهُ فَأَحبَطَ أَعمالَهُم ﴾[149] واتە : ئەوانەش كە بێ باوەڕ بوون ئەوە نەگبەتی و سەرشۆڕی بەشیانە وە ( اللە تعالی) كردەوەكانیان بێ مایە دەكات. – ئەو تۆڵەیان لەبەر ئەوەیە كە بێگومان ئەوانە ڕقیان لەو قورئانە بوو كە اللە ناردوویەتی بۆیە اللە تعالی ش كردەوەكانیانی پووچ كردەوە.›

---

[147] [ النساء: ١٠٥ ]

[148] [ النساء: ٦٥ ]

[149] [ محمد: ٨-٩ ]

چوارەم : دەبێت ئیمان بە ناوەکانیان بهێنیت و دانی پێدابنێی هەر کاتێک کە پێت گەیشت ،

کتابەکانی اللہ تعالى زۆرن بەڵام ناوی چوار دانەیان هاتوە ئەوانیش کە بریتین لە

یەکەم : القرآن

کتابی قورئان بۆ پێغەمبەر محمد (صل اللہ علیه وسلم) دابەزیوە ،

اللہ تعالى فەرموویەتی ﴿ أَفَلا يَتَدَبَّرونَ القُرآنَ وَلَو كانَ مِن عِندِ غَيرِ اللَّهِ لَوَجَدوا فيهِ اختِلافًا كَثيرًا ﴾[150]واتە : ئەوە بۆ بیر ناکەنەوە لە قورئان ؟ خۆ ئەگەر لە لایەن کەسێکی ترەوە بوایە جگەلە اللہ تعالى بێگومان دەیان بینی تیایدا جیاوازی زۆر.›

وە فەرموویەتی ﴿ شَهرُ رَمَضانَ الَّذي أُنزِلَ فيهِ القُرآنُ هُدًى لِلنّاسِ وَبَيِّناتٍ مِنَ الهُدى وَالفُرقانِ ﴾ [151] واتە : مانگی ڕەمەزان مانگێکە قورئانی تێدا نێرراوەتە خوارەوە بە ڕێنما بۆخەڵکی وە بەڵگەیانی ڕۆشن بۆ ڕێنموونیی و جیاکردنەوە(ی دروست ونادروست) .›

وە فەرموویەتی ﴿ إِنّا أَنزَلناهُ قُرآنًا عَرَبِيًّا لَعَلَّكُم تَعقِلونَ ﴾ [152] واتە : بەڕاستی ئێمە ناردومانەتە خوارەوە قورئانێك بە عەرەبی بۆ ئەوەی ژیربن و لێ ی تێ بگەن.›

دووەم : التوراة

[150] [ النساء: ٨٢ ]

[151] [ البقرة: ١٨٥ ]

[152] [ يوسف: ٢ ]

کتابی تەورات بۆ پێغەمبەر موسی (علیه السلام) دابەزیوە ،

الله تعالی فەرموویەتی ﴿ نَزَّلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَأَنزَلَ التَّوْرَاةَ وَالْإِنجِيلَ ﴾ [153] واتە : ناردوویە تیە خوارەوە بۆت قورئان بەڕاستی و دروستی، بەڕاست دانەری هەموو ئەو (کتێب) انە یە لەپێشیدا بوون وە تەورات و ئینجیلی نارده خوارەوە.›

سێیەم : الإنجيل

کتابی ئینجیل بۆ پێغەمبەر عیسا (علیه السلام) دابەزیوە ،

الله تعالی فەرموویەتی ﴿ قُل يا أَهلَ الكِتابِ لَستُم عَلى شَيءٍ حَتّى تُقيمُوا التَّوراةَ وَالإِنجيلَ وَما أُنزِلَ إِلَيكُم مِن رَبِّكُم ﴾ [154] واتە : ئەی محمد( ﷺ ) بڵێ ئەی نامەدارەکان ئێوە لەسەر هیچ شتێك نین هەتا بەڕێك و ڕاستی پەیڕەوی تەورات و ئینجیل نەکەن هەروەها ئەو قورئانەی کە هێنراوەتە خوارەوە بۆتان لە لایەن پەروەردگارتانەوە.›

چوارەم : الزبور

کتابی زەبور بۆ پێغەمبەر داوود (علیه السلام) دابەزیوە ،

الله تعالی فەرموویەتی ﴿ وَآتَينا داوودَ زَبورًا ﴾ [155]واتە : وە زەبوریشمان بەخشی بە داوود.›

وە فەرموویەتی ﴿ وَلَقَد كَتَبنا فِي الزَّبورِ مِن بَعدِ الذِّكرِ أَنَّ الأَرضَ يَرِثُها عِبادِيَ الصّالِحونَ ﴾ [156] واتە : سوێند بە الله بێگومان ئێمە نووسیوومانە لە زەبووردا

[153] [ آل عمران:٣ ]
[154] [ المائده: ٦٨ ]
[155] [ النساء: ١٦٣ ]
[156] [ الأنبياء: ١٠٥ ]

لە دوا نوسینی لە (لوح المحفوظ) دا بەڕاستی سەر زەوی (بەهەشت) دەبنە خاوەنی بە میرات دەیبەن بەندە چاك و پاكەكانم.›

پێویستە لەسەر موسڵمان كەوا ئیمان بە كتابەكانی الله تعالى بهێنن بەبێ جیاوازی ، ئەگەر چی جولەكە و گاور دەستكاری تەوارت و انجیلی ان كردووە بەڵام ئێمە مەبەستمان لەوەیە كە لەلایان الله تعالى ەوە دابەزیوە و هیچ دەستكاری نەكراوە و وەک خۆی ماوەتەوە ، جا گەر كەسێک ئیمان بەكتێبێک نەهێنێت یان ئیمان بە چەند بەشێكی نەهێنێت ئەوە كافرە چونكە ئیمانی بە یەكێک لە كتابەكان نەهێناوە یان ئیمانی بەبەشێكی نەهێناوە ، وە هەر كەسێک ئیمان بە هەمویان نەهێنت ئەوا كافرە و ئیمانی نوقستانە و قبوڵ كراو نیە ،

[٥٤]چوارەم : ئیمان هێنی بە پێغەمبەران (عليهم السلام)

۞ ڕوونكردنەوە ۞

ئیمان هێنان بە پێغەمبەران (عليهم السلام) چوار شت لە خۆی دەگرێت ئەوانیش

یەكەم : ئیمان هێنان بەوەی ئەوان لەلایان الله تعالى ەوە كراون بە پێغەمبەر و نێدراون بۆ خەڵكی

وەک الله تعالى فەرموویەتی ﴿ ما أَصابَكَ مِن حَسَنَةٍ فَمِنَ اللَّهِ وَما أَصابَكَ مِن سَيِّئَةٍ فَمِن نَفسِكَ وَأَرسَلناكَ لِلنّاسِ رَسولًا وَكَفى بِاللَّهِ شَهيدًا ﴾[157]واتە : هەر چاكەیەكت تووش بوو ئەوە لە الله وەیە وە هەر خراپەیەكت تووش بوو ئەوە

[157] [ النساء: ٧٩ ]

لە خۆتەوەیە و ئێمە تۆمان ناردووە بە پێغەمبەر بۆ خەڵکی وە الله بەسە شایەتی ئەوە بدات›

وە فەرموویەتی ﴿ وَلَقَد بَعَثنا في كُلِّ أُمَّةٍ رَسولًا أَنِ اعبُدُوا اللَّهَ وَاجتَنِبُوا الطّاغوتَ ﴾[158] واتە : سوێند بە الله لەناو هەموو گەل و ئوممەتێکدا پێغەمبەرێکمان ناردووە بەمەی تەنها الله تعالی بپەرستن و دووركەونەوە لە (پەرستنی) هەر پەرستراوێکی تر ›

وە فەرموویەتی ﴿ إِنّا أَرسَلنا إِلَيكُم رَسولًا شاهِدًا عَلَيكُم كَما أَرسَلنا إِلى فِرعَونَ رَسولًا ﴾[159] واتە : بێگومان ئێمە پێغەمبەرێکمان بۆ ناردن کە شاهیدە لە سەرتان هەروەك پێغەمبەرێکمان نارد بۆ فیرعەون›

وە فەرموویەتی ﴿ وَلَقَد أَرسَلنا نوحًا إِلى قَومِهِ إِنّي لَكُم نَذيرٌ مُبينٌ ﴾[160] واتە : سوێند بە الله بەڕاستی ئێمە نوحمان نارد بۆ لای قەوم و خزمەکانی، (پێی وتن) بێگومان من بۆ ئێوە داچڵەکێنەرێکی ئاشکرام ›

بۆیە پێویستە موسڵمان ئیمان بەوە بهێنی کە پێغەمبەران هەڵبژێردراوی الله تعالی ن لە ناو خەڵکی و کراون بە پێغەمبەر بۆ خەڵکی ،

دووەم : بەڕاست زانینی ئەو هەواڵانەی کە ئەو پێغەمبەرانە (علیهم السلام)دەیدەن بە قەوم و ئوممەتەکەیان ،

پێویستە لەسەر کەسی موسڵمان کە ئەو هەواڵە بە ڕاست بزانێت کە پێغەمبەران پێیان دەڵێن ، وە هەر کەسێک ئەو هەواڵانە بە درۆ بزانێت ئەوە کافرە ،

[158] [ النحل: ٣٦ ]
[159] [ المزمل: ١٥ ]
[160] [ هود: ٢٥ ]

الله تعالى فەرموویەتی ﴿ وَإِن يُكَذِّبوكَ فَقَد كَذَّبَت قَبلَهُم قَومُ نوحٍ وَعادٌ وَثَمودُ ﴾[161]واتە : وە ئەگەر (بێ باوەڕان) تۆ بە درۆزن دەزانن و باوەڕت پێ ناکەن ئەوە بێگومان پێش ئەوان باوەڕیان نەکردووە (بە پێغەمبەرانیان) گەلی نووح و عاد و سەموود.›

وە فەرموویەتی ﴿ بَل كَذَّبوا بِالحَقِّ لَمّا جاءَهُم فَهُم في أَمرٍ مَريجٍ ﴾ [162] واتە : زیندوو بوونەوە دوور نی یە بەڵکو ئەوان باوەڕیان بە قورئان نەکرد کاتێ بۆیان هات بۆیە ئەوان لەناو کارێکی تێکەڵ و پێکەڵ دان.›

وە فەرموویەتی ﴿ وَالَّذينَ كَفَروا وَكَذَّبوا بِآياتِنا أُولئِكَ أَصحابُ النّارِ هُم فيها خالِدونَ ﴾[163]واتە : ئەوانەش بێ باوەڕ بوون و باوەڕیان بە ئایەتەکانی ئێمە نەبوو، ئەوانە نیشتەجێی دۆزەخن و بۆ هەتا هەتایی تیایدا دەمێننەوە.›

جا هەر کەسێک بێباوڕ بێت بەیەکێک لە پێغەمبەران ئەوا بێ باوەڕ بوە بە هەموو پێغەمبەران ، چونکە هەموو پێغەمبەران یەک دینیان هەبوە ،

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ﴿ الأنبياءُ إخوَةٌ لعَلّاتٍ ، دِينُهم واحِدٌ، وأُمَّهاتُهم شَتَّى ﴾[164] واتە : پێغەمبەران بران لە باوک ، وە یەک دینیان هەیە ، وە دایکیان جیاوازە.›

جا دینی پێغەمبەران یەک دینە کە ئەویش بەتاک پەرستنی الله تعالى بوە بەبێ شەریک و هاوبەش دانان بۆی ، جا گەر کەسێک پێغەمبەرێک بە درۆ بزانێت

[161] [ الحج: ٤٢ ]

[162] [ ق: ٥ ]

[163] [ البقرة: ٣٩ ]

[164] [ رواه البخاري برقم: ٣٤٤٣ ]

ئەوا وەک ئەوەیە هەمووی ئەوانی تریشی بە درۆ زانبێت ، چونکە هەموویان وەک یەکن ،

وەک الله تعالى فەرموویەتی ﴿ كَذَّبَت عادٌ المُرسَلينَ – إذ قالَ لَهُم أَخوهُم هودٌ أَلا تَتَّقونَ – إِنّي لَكُم رَسولٌ أَمينٌ ﴾[165] واتە : قەومی عادیش بەرنامەی هەر هەموو پێغەمبەرانیان بە درۆزانی. – کاتێک (هود)ی پێغەمبەری برایان پێی وتن: باشە، ئێوە لە الله ناترسن، پارێزکار نابن. – بەڕاستی دڵنیابن کە من فرستادەیەکی ئەمین و دڵسۆزم بۆتان.›

جا الله تعالى فەرموویەی قەومی عاد پێغەمبەرەکانیان بەدرۆ زانی ، لەکاتێک دا تەنها پێغەمبەر هودیان تێدابوو ،

وە (قال) و (إنی) و (رسول) بۆ تاک(واتا بۆ یەک کەس) بەکار دێت ، کە ئەویش بریتی بوو لە پێغەمبەر هود علیه السلام کە قەومەکەی بەدرۆیان زانی ، بەڵام الله تعالى فەرمووی ئەوان پێغەمبەرەکانیان بە درۆ زانی ، ئەمەش بەڵگەیە کە هەر کەسێک پێغەمبەرێک بە درۆ بزانێت ئەوا وەک ئەوەیە هەموو پێغەمبەرانی بە درۆ زانی بێت ،

سێیەم : کارکردنی بە شەریعەتەکەی و شوێن کەوتن و چاو لێکردنی ،

پێویستە لەسەر کەسی موسڵمان کە شوێن پێغەمبەر ﷺ بکەوێت و چاوی لێبکات وە کار بەو بەرنامە و ڕێبازە بکات کە پێغەمبەر ﷺ لەسەری بووە و پێی هاتوە ،

الله تعالى فەرموویەتی ﴿ قُل إِن كُنتُم تُحِبّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعوني يُحبِبكُمُ اللَّهُ وَيَغفِر لَكُم ذُنوبَكُم وَاللَّهُ غَفورٌ رَحيمٌ ﴾[166] واتە : ئەی محمد ( ﷺ ) بڵێ: ئەگەر ئێوە

[165] [الشعراء: ١٢٣ – ١٢٥ ]

[166] [ آل عمران: ٣١ ]

الله تان خۆش دەوێت کەواتە دوای من بکەون تا الله تعالى ش ئێوەی خۆش بوێت وە لە گوناهەکانتان خۆش ببێت وە الله ش لێخۆشبووی میهرەبانە.›

وە هەر کەسێک پشت لە ڕێبار و بەرنامەی پێغەمبەر ﷺ بکات ئەوە کافرە لەبەر ئەوەی الله تعالى فەرموویەتی ﴿ قُل أَطيعُوا اللَّهَ وَالرَّسولَ فَإِن تَوَلَّوا فَإِنَّ اللَّهَ لا يُحِبُّ الكافِرينَ ﴾[167] واتە : (دووبارە) پێیان بڵێ: فەرمانبەرداری الله تعالى و پێغەمبەر بن، خۆ ئەگەر سەپێچی بکەن و پشتی تێبکەن ئەوە دڵنیابن الله تعالى بێ باوەڕانی خۆش ناوێت.›

بۆیە دەبیت شوێن پێغەمبەر ﷺ بکەویت تا بەئیمان دار حساب بکرێیت ، چونکە ئەو کەسەی شوێنی پێغەمبەر ﷺ ناکەوێت و پشتی تێدەکات ، ئەوە کافرە ،

وە دەبێت حوکمی بۆ لا بگرێتەوە و کار بە بەرنامە و ڕێبازەکەی بکەیت و ملکەچ بیت ، چونکە هیچ کەسێک نابێتە ئیمان دار هەتاوەکو لەکاتی ناکۆکی و کێشەدا حوکم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ نەباتەوە ،

الله تعالى فەرموویەتی ﴿ فَلا وَرَبِّكَ لا يُؤمِنونَ حَتّى يُحَكِّموكَ فيما شَجَرَ بَينَهُم ثُمَّ لا يَجِدوا في أَنفُسِهِم حَرَجًا مِمّا قَضَيتَ وَيُسَلِّموا تَسليمًا ﴾[168] واتە : نەخێر(وانی یە کە خۆیان بە باوەڕدار نیشان دەدەن) سوێند بە پەروەردگارت بڕوا دارنین تا تۆ نەکەنە دادوەر لەهەر ئاژاوە و دووبەرەکی یەکی نێوانیان دا لەپاشان هەست نەکەن لە دەرونیاندا بە هیچ بێزاری یەک لەو بڕیارەی تۆ داوتە و مل کەچ نەکەن بە مل کەچی یەکی تەواو.›

[167] [ آل عمران: ٣٢ ]

[168] [ النساء: ٦٥ ]

وە پێغەمبەر ﷺ پێشەنگە کە دەبێت چاوی لێ بکرێت تا ئەوکەسەی چاوی لێدەکات گومڕا نەبێت و سەر لێ شێواو نەبێت ،

الله تعالی فەرموویەتی ﴿ لَقَد كانَ لَكُم في رَسولِ اللَّهِ أُسوَةٌ حَسَنَةٌ لِمَن كانَ يَرجُو اللَّهَ وَاليَومَ الآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثيرًا ﴾[169]واتە : سوێند بە الله بەڕاستی لەپێغەمبەری الله تعالی دا چاکترین نموونەی تەواو ڕێك پێك هەیەتا چوی لێ بکەن و شوێنی بکەون، بەتایبەت بۆ ئەو کەسانەی ڕەزامەندی الله یان مەبەستە، سەرفرازی قیامەت ئاواتیانە، هەمیشە و بەردەوام یادی الله بە زۆری ئەنجام دەدەن و زمانیان پاراوە بەیادی ئەو.›

چوارەم : ئیمان هینان و بەڕاست زانینی ناوەکانیان ،

پێویستە کە ئیمان بە ناوی پێغەمبەرەکان (علیه السلام) بهێنی،

لێرە پێویستە دوو شتی لێک جیا بکەینەوە ئەویش جیاوازی نێوان وشە و کاری (النبي)و(الرسول)

یەکەم : النبی : بریتیە لەوەی کە شەریعەتی بۆ نێدراوە بەڵام فەرمانی پێنەکراوە کە بە خەڵکی ڕابگەیێنێ ،

دووەم : الرسول : بریتیە لەوەی کە شەریعەتی تازەی بۆ نێدراوە و فەرمانی پێکراوە کە بەخەڵکی ڕابگەیێنێ ،

جا ئەوەی ئێمە باسی دەکەین بریتیە لە الرسول ، کە دەبێت ئیمانی پێ بهێنێت،

جاگەر کەسێک وتی گەر بڕوا هێنان تەنها بە الرسول بێت ئەوا بۆ ئیمان بە النبی بێنین لەکاتێک دا الله تعالی فەرموویەتی (ورسله) نەیفەرموو (ونبیه)

[169] [ الأحزاب: ٢١ ]

ولۆم ئەوەیە کە بڕوا هێنان بە (النبي) دەچێتە ناو ئیمان هێنان بە کتابەکانەوە ،

جا ئیمان هێنان بەناوی پێغەمبەرەکان پێویستە لەسەر کەسی موسڵمان کاتێک کە پێی گەیشت بەبەڵگەی ڕاست ،

جا الرسول نمونەی ، محمد و ابراهیم و نوح و عیسا و موسی و هود صالح و لوط غەیری ئەویش ، کە هەر کات کەسێک ناوێ یەکێک لە پێغەمبەرانی پێگەیشت بە بەڵگەی ڕاست ، ئەوا پێویستە ئیمانی پێ بهێنی ،

الله تعالى فەرموویەتی ﴿ وَتِلكَ حُجَّتُنا آتَيناها إِبراهيمَ عَلى قَومِهِ نَرفَعُ دَرَجاتٍ مَن نَشاءُ إِنَّ رَبَّكَ حَكيمٌ عَليمٌ – وَوَهَبنا لَهُ إِسحاقَ وَيَعقوبَ كُلًّا هَدَينا وَنوحًا هَدَينا مِن قَبلُ وَمِن ذُرِّيَّتِهِ داوودَ وَسُلَيمانَ وَأَيّوبَ وَيوسُفَ وَموسى وَهارونَ وَكَذلِكَ نَجزِي المُحسِنينَ – وَزَكَرِيّا وَيَحيى وَعيسى وَإِلياسَ كُلٌّ مِنَ الصّالِحينَ – وَإِسماعيلَ وَاليَسَعَ وَيونُسَ وَلوطًا وَكُلًّا فَضَّلنا عَلَى العالَمينَ – وَمِن آبائِهِم وَذُرِّيّاتِهِم وَإِخوانِهِم وَاجتَبَيناهُم وَهَدَيناهُم إِلى صِراطٍ مُستَقيمٍ ﴾ [170] واتە : ئەو(بەڵگانە) بەڵگەی ئێمە بوون کە دابوومان بە ئیبراهیم لە بەرانبەر گەلەکەیەوە هەر کەسێك بمانەوێت پلە و پایەی بەرز دەکەینەوە بەڕاستی پەروەردگارت کار دروستی زانایە. – وە ئیسحاق و (لە ئیسحاقیش) یەعقوب مان پێ بەخشی ڕێنموونیی هەموویانمان کرد وە لەوەوپێش ڕێنموونیی نووحیشمان کرد و لە نەوەکانی نووح داوود و سولەیمان و ئەیوب و یوسف و مووسا و هاروونمان (ڕێنموونیی ) کرد ئا بەو چەشنە پاداشتی چاکە کاران دەدەینەوە. – وە زەکەریا و یەحیا و عیسا و ئیلیاس هەر یەك لەمانە لە چاکە کاران بوون. – وە ئیسماعیل و یەسەع و یونس و لووط هەر یەکە لەمانە

[170] [الأنعام: ٨٣ – ٨٧]

ڕێزمان داوون بەسەر هەموو خەڵكی دا. – هەروەها هەندێ لە باوك و نەوەو براكانیان هەڵمان بژاردوون و ڕێنموونیمان كردوون بۆ ڕێگەی ڕاست.»

جا ناوی هەندێک لە پێغەمبەران و باسی ژیانیان هاتوە وە ناو و باسی ژیانی زۆر لە پێغەمبەران نەهاتوە ، ئەوەش هەر الله تعالى دەزانێ كە بۆچی باسی نەكردوە و حیكمەتەكەی چیە لە باس نەكردنی ،

وەک الله تعالى فەرموویەتی ﴿ وَرُسُلًا قَد قَصَصناهُم عَلَيكَ مِن قَبلُ وَرُسُلًا لَم نَقصُصهُم عَلَيكَ وَكَلَّمَ اللَّهُ موسى تَكليمًا ﴾ [171] واتە : وە پێغەمبەرانێك بێگومان بەسەرهاتەكانیانمان گێڕاوەتەوە بۆت لەمەوپێش وە پێغەمبەرانێك بەسەرهاتەكانیانمان نە گێڕاوەتەوە بۆت وە الله تعالى قسەی كرد لەگەڵ مووسا بە قسە كردن.

بۆیە پێویستە لەسەر ئێمە ئیمان بهێنین بەناوی هەر یەكێک لە پێغەمبەران كە بەبەڵگەی ڕاست پێمان گەیشت ،

وە جیاوازی نیە لە ئیمان هێنان بەناوی (الرسول) بێت یان (البني)

**[٥٥]** پێنجەم : ئیمان بهێنی بە ڕۆژی دواى (قیامەت)

## ❁ ڕوونكردنەوە ❁

ئیمان هێنان بە ڕۆژی دوای ( كە مەبەست لە قیامەتە) زۆر شت لە خۆی دەگرێت ، هەموو ئەوانەی لە دوای مردن دێت ئەوە دەچێتە ناو بەشی ئیمان هێنان بە ڕۆژی دوای كە ئەوانیش بریتین لە عەزاب و خۆشەیكانی ناو قەبر و پرسیاری دوو مەلائیكەتەكە و زیندوو بونەوە مەحشەر و شافاعەت و میزان و

[171] [ النساء: ١٦٤ ]

حساب و کتاب وەرگرتن و پردی سیرات و پردی قنطر ە و حەوزی کەوسەر و بەهەشت و دۆزەخ ،

هەموو ئەمانە دەچێتە ناو بەشی ئیمان هێنان بە ڕۆژی دوایەوە ، کە پێویستە موسڵمان ئیمان بەهەمووی بێنێت ،

وە هەر یەکێک لەمانە بەڵگەی لەسەرە لە قورئان و سونەت ،

بەڵام ئیمان هێنان بە ڕۆژی دوای سێ شتی سەرەکی لە خۆ دەگرێت کە ئەوانیش

یەکەم : ئیمان هینان بە زیندوو بونەوەی لە دوای مردن ،

پێویستە لەسەر کەسی موسڵمان کە ئیمان بەوە بهێنی کە کاتێک مرۆڤەکان دەمرن ئەوا زیندوو دەکرێنەوە ،

الله تعالی فەرموویەتی ﴿ ثُمَّ إِنَّكُم يَومَ القِيامَةِ تُبعَثونَ ﴾ [172] واتە : لەپاشان بێگومان ئێوە لە ڕۆژی دواییدا زیندوو دەکرێنەوە.›

وە فەرموویەتی ﴿ وَلا تُخزِني يَومَ يُبعَثونَ ﴾ [173] واتە : (پێغەمبەر ئیبراهیم فەرمووی) وە شەرمەزار و ڕیسوام مەکە لە ڕۆژێکدا کە (خەڵکی) زیندوو دەکرێنەوە.›

وە فەرموویەتی ﴿ قالَ رَبِّ فَأَنظِرني إِلى يَومِ يُبعَثونَ – قالَ فَإِنَّكَ مِنَ المُنْظَرِينَ ﴾ [174] واتە : (شەیتان) وتی ئەی پەروەردگارم دەی مۆڵەتم بدە تا ڕۆژێ (مردووان)

[172] [ المؤمنون: ١٦ ]

[173] [ الشعراء: ٨٧ ]

[174] [ الحجر: ٣٦- ٣٧]

زیندوو دەکرێنەوە - (الله تعالی ش) فەرمووی ئەوە بەڕاستی تۆ لە مۆڵەت دراوانی.›

وە فەرموویەتی ﴿ يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ اللَّهُ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا أَحْصَاهُ اللَّهُ وَنَسُوهُ وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ ﴾ [175] واتە : لە ڕۆژێکدا کە الله تعالی هەموویان تێکڕا زیندوو دەکاتەوە پاشان هەواڵیان پێ دەدات بەوەی کە کردوویانە کە الله تعالی هەمووی هەڵژماردووە ، وە خۆیان لە بیریان چووە، وە الله تعالی بەسەر هەموو شتێکدا ئاگادارە.›

جا هەر کەسێک ئیمان بە زیندوو بونەوە نەهێنێت ئەوە کافرە وەک الله تعالی لە سیفەتی کافران باس دەکات و دەفەرموێت ﴿ زَعَمَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَن لَّن يُبْعَثُوا قُلْ بَلَى وَرَبِّي لَتُبْعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلْتُمْ وَذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ ﴾[176]واتە : ئەوانەی بێ باوەڕ بوون بە بۆچوونی خۆیان وتیان: هەرگیز زیندوو ناکرێنەوە، پێیان بڵێ: وا نیە، سوێند بە پەروەردگارم، بەڕاستی هەر زیندوو دەکرێنەوە، پاشان ئاگادار دەکرێن لە هەموو ئەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامتان دەدا، ئەوەش بۆ الله تعالی زۆر ئاسان و سادەیە. ›

جا الله تعالی ئینکاری وتە و بانگەشەی کافرانی کرد و ئەوەی چەسپاند کە زیندوو دەکرێنەوە و لە گۆڕەکانیان دەر دە هێندرێن ،

بۆیە هەر کەسێک بێ باوڕ بێت بە زیندوو بونەوە ئەوە کافر دەبێت و بە ئیمان دار حساب ناکرێت ،

دووەم : ئیمان هێنان بە حساب و لێپرسینەوە لەسەر کردەوەکان ،

---

[175] [ المجادلة: ٨ ]

[176] [ التغابن: ٧ ]

وە پێویستیشە کە کەسی موسڵمان ئیمان بە حساب و لێپرسنەوە بهێنێت کە خەڵکی بۆ زیندوو دەکرێتەوە لە ڕۆژی قیامەت ،

الله تعالی فەرموویەتی ﴿ إِنَّ إِلَيْنَا إِيَابَهُمْ – ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُم ﴾[177] واتە : بێگومان هەر بۆ لای ئێمەیە گەڕانەوەیان – لەوەودوایش بەڕاستی حیساب و لێپرسینەوە و دادگاییان لەسەر ئێمەیە.›

وە فەرموویەتی ﴿ ثُمَّ لَتُسْأَلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ النَّعِيمِ ﴾ [178] واتە : لە پاشان سوێند بە الله لەو ڕۆژەدا پرسیاری هەموو بەهرەیەکتان لێ دەکرێ.›

وە فەرموویەتی ﴿ يَوْمَئِذٍ تُعْرَضُونَ لَا تَخْفَى مِنكُمْ خَافِيَةٌ – فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ فَيَقُولُ هَاؤُمُ اقْرَءُوا كِتَابِيَهْ – إِنِّي ظَنَنتُ أَنِّي مُلَاقٍ حِسَابِيَهْ ﴾ [179] واتە : لەو ڕۆژەدا (لە بەردەمی خوادا) هەمووتان نیشان دەدرێن هیچ (کردەوەیەکی) پەنهانیتان بە نهێنی نامێنێتەوە. – ئەوسا ئەو کەسەی کە نامەی (کردەوەی) درایە دەستی ڕاستی دەڵێ: ها نامەکەم بگرن و بیخوێننەوە. – بێگومان من خۆم دەمزانی کە تووشی ئەم لێپرسینەوەیە دەبم.›

وە فەرموویەتی ﴿ وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئًا ۖ وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا ۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَاسِبِينَ ﴾[180] واتە : وە ئێمە دادەنێین تەرازووەکانی دادپەروەری (کە کردەوەی پێ دەکێشرێ) لە ڕۆژی قیامەتدا ئینجا هیچ کەس کەمترین ستەمی لێ ناکرێ با قورسی (کردەوەکەی) بەقەدەر تۆو خەرتەلەیەکیش بێت ئێمە دەیهێنین و بەسە کە ئێمە ( الله ) ژمێریاری (کردەوەی بەندەکان) بین.›

---

[177] [ الغاشية: ٢٥-٢٦ ]

[178] [ التكاثر: ٨ ]

[179] [ الحاقة: ١٨-٢٠ ]

[180] [ الأنبياء: ٤٧ ]

جا الله تعالى له ڕۆژی قیامەت لێ پرسینەوە لە بەندەكانی دەكات لەسەر كردەوەكانیان ، وە ئەمەش شتیكی ئاشكرایە لەنێوان موسڵمانان وە شتێكی چەسپاوە لە دینی ئیسلام وە هەر كەسێك ئینكاری بكات و بێ باوڕ بێت پێی ئەوە كافر دەبێت ،

سێیەم : ئیمان هێنان بە بەهەشت و دۆزەخ ،

الله تعالى بەهەشت و دۆزەخی دروست كردوە بۆ بەندەكانی جا ئەو بەندانەی كە ئیماندارن ئەوە الله تعالى دەیان خاتە بەهەشتەوە ، وە ئەو بەندانەی كە كافرن الله تعالى دەیان خاتە دۆزخەوە ، وە ئیمان هێنان بە بەهەشت و دۆزەخ لە بەشی ئیمان هێنانە بە ڕۆژی دوای ، جا هەر كەسێك بڕوای بە بەهەشت و دۆزەخ نەبێت ئەوە بە ئیماندار دا ناندرێت ، بەڵكو بەكافر حساب دەكرێت و لەقیامەت دەخرێتە دۆزەخەوە ،

یەكەم : بەهەشت

الله تعالى دروستی كردوە بۆ ئیمان دارن

الله تعالى فەرموویەتی ﴿ قُلْ أَؤُنَبِّئُكُم بِخَيْرٍ مِّن ذَٰلِكُمْ لِلَّذِينَ اتَّقَوْا عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَأَزْوَاجٌ مُّطَهَّرَةٌ وَرِضْوَانٌ مِّنَ اللَّهِ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ ﴾[181]واتە : بڵێ: خەبەرتان بدەمێ بەباشتر لەمانەتان بۆ ئەوانەی كە پارێزیان كرد لای پەروەردگاریان چەند بەهەشتێک هەیە كە بەژێر درەختەكانیاندا دەڕوات ڕووبارەكان بەئێجگاری تێدا دەمێننەوە، وە (بۆیان هەیە) ژنانی پاكیزە، وە ڕەزامەندی لە الله تعالى وە، وە الله تعالى بینایە بە بەندەكان.،

[181] [ آل عمران: ١٥ ]

وە ئیمان هێنان بە بەهەشت چەندین شت لە خۆی دەگرێت وەک ناوی و سیفاتی(شێوە و تایبەت مەندیەکانی) کە پێویستە موسڵمان ئیمان بەوانە بهێنێت کە بەبەڵگەی ڕاست هاتوە ،

دووەم : دۆزەخ

الله تعالى دروستی کردوە بۆ کافران

الله تعالى فەرموویەتی ﴿ قَالُوا بَلَى قَدْ جَاءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ اللَّهُ مِن شَيْءٍ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِي ضَلَالٍ كَبِيرٍ – وَقَالُوا لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِي أَصْحَابِ السَّعِيرِ – فَاعْتَرَفُوا بِذَنبِهِمْ فَسُحْقًا لِّأَصْحَابِ السَّعِيرِ ﴾[182] واته : وتیان بەڵێ ترسنەر (پێغەمبەر)بۆمان هاتووە بەڵام بەدرۆمان دەزانی، و دەمان وت (پێ ی) خوا هیچی نە ناردۆتە خوارەوە ئێوە بەس لە گومڕاییەکی گەورەدان – وە وتیان ئەگەر قسەی (پێغەمبەران) مان ببیستایە یا تێبگەشتینایە ئەمڕۆ لە هاوڕێ یانی دۆزەخ نە دەبووین – ئیتر پێیان نا لە گوناهەکەیان کەوابوو دووریی لە میهرەبانی الله بۆ هاوڕێ یانی دۆزەخ.›

وە ئیمان هێنان بە دۆزەخ چەندین شت لە خۆی دەگرێت وەک ناوی و سیفاتی(شێوە و تایبەت مەندیەکانی) کە پێویستە موسڵمان ئیمان بەوانە بهێنێت کە بەبەڵگەی ڕاست هاتوە ،

وە هەموو ئەوەنەی کە باسکرا لە سەرەتا لە پرسیاری ناو گۆڕ و عەزابی ناو گوڕ و حەشر و حساب و میزان و سیرات و کەوثر ، هەموو لەم ناو ئەم بەشی ڕۆژی دوایە دایە ، کە پێویستە موسڵمان بەڕاستیان بزانێت و دانیان پێدا بنێت ، وە

[182] [ الملك: ٩-١٠-١١ ]

هەر کەسێک دان بە یەکێک لەمانە دا نەنێ یان ئینکاری بکات یان بە درۆی بزانێت ئەوە کافرە بە ڕۆژی دوای ،

وە هەر یەکێک لەمانەی باسکر بەڵگەی چەسپاوی لەسەرە لە قورئان و فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ ،

[56]شەشەم : ئیمان بهێنی بە قەدەر خیرو شەڕی ،

❁ **ڕوونکردنەوە** ❁

ئیمان هێنان بە قەزاو قەدەر بریتیە لەوەی کە بڕوات وابیت کە هەرچی ڕوو دەدات لەم جیهانانە و هەرچی خۆشی و ناخۆشی و باش و چاک و ژیان و مردن و ڕزق و هەرچی ڕوو دەدات هەموو بە فەرمان و بڕیاری الله تعالى یە و الله تعالى دیاری کردوە ،

ئیمان هێنان بە قەدەر چوار شت لە خۆی دەگرێت

یەکەم : ئیمان هێنان بەوەی الله تعالى زانستی بە هەموو شتێک هەیە ،

الله تعالى زانستی بەهەموو دروست کراوەکانی هەیە پێش ئەوەی دروستیان بکات وە دەزانێت چی دەکەن و چی ناکەن ، ئاگارداری هەموو شتێکیانە ،

الله تعالى فەرمویەتی ﴿ وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴾[183]واتە : وە الله تعالى بە هەموو شتێک زانایە.›

[183] [ البقرة: ٢٨٢ ]

وە فەرموویەتی ﴿ قُل يُحيِيهَا الَّذي أَنشَأَها أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلقٍ عَليمٌ ﴾[184]
واتە : پێیان بڵێ: ئەو زاتەی کە یەکەمجار دروستی کرد، هەر ئەویش زیندووی دەکاتەوە، ئەو بەهەموو دروستکراوێک زاناو ئاگایە.›

وەفەرموویەتی ﴿ وَالَّذينَ آمَنوا مِن بَعدُ وَهاجَروا وَجاهَدوا مَعَكُم فَأُولئِكَ مِنكُم وَأُولُو الأَرحامِ بَعضُهُم أَولى بِبَعضٍ في كِتابِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيءٍ عَليمٌ ﴾[185]واتە : وە ئەوانەی لە دوایی دا بڕوایان هێناو کۆچیان کرد و لەگەڵ ئێوەدا تێکۆشان ئا ئەوانە لە ئێوەن وە ئەوانەی خزمی یەکترن هەندێکیان (بۆ میرات گرتن) شایستە ترن بە هەندێکی تریان لە کتێبی الله دا(قورئان یا لوح المحفوظ) بەڕاستی الله تعالى بە هەموو شتێك زانایە.›

الله تعالى زانستی هەیە بەهەموو شتێک و هەموو دروست کراوەکانی پێش ئەوەی دروستیان بکات ، بۆیە پێویستە لەسەر موسڵمان کەوا ئیمان بەوە بهێنی کە الله تعالى زانستی بە هەموو شتێک هەیە و زانایە پێی ،

دووەم : الله تعالى هەموو شتێکی نوسیوە لە (لوح المحفوظ)

الله تعالى لە لوح المحفوظ هەموو شتێکی نوسیوە کە ڕوو دەدات هەتا کەوتنی گەڵادار و هەناسەکان و سات و کاتی مردنیش ،

الله تعالى فەرموویەتی ﴿ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاءِ وَالْأَرْضِۗإِنَّ ذَٰلِكَ فِي كِتَابٍۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ ﴾[186]واتە : مەگەر نەتزانیووە کە بەڕاستی الله تعالى ئاگاو زانایە بەهەرچی لە ئاسمان و زەویدا هەیە و هەموو ئەو شتانەی (کە

[184] [ يس: ٧٩ ]
[185] [ الأنفال: ٧٥ ]
[186] [ الحج: ٧٠ ]

دەیکەن) لە کتێب و دۆسیەی (لوح المحفوظ) دا تۆمارکراوە، بەڕاستی ئەوکارە بۆ الله تعالی زۆر ئاسانە.›

وە فەرموویەتی ﴿ قَالَ عِلْمُهَا عِندَ رَبِّي فِي كِتَابٍۖ لَّا يَضِلُّ رَبِّي وَلَا يَنسَى ﴾[187] واتە : موسا وتی: زانیاری ئەوانە، لای پەروەردگارمەو لە دۆسیەکانی (لوح المحفوظ) دا پارێزراوە، پەروەردگاری من، هیچی لێ ون نابێت، هیچ شتێکیش فەرامۆش ناکات.›

وە فەرموویەتی ﴿ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَا تَأْتِينَا السَّاعَةُۖ قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتَأْتِيَنَّكُمْ عَالِمِ الْغَيْبِۖ لَا يَعْزُبُ عَنْهُ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ وَلَا أَصْغَرُ مِن ذَٰلِكَ وَلَا أَكْبَرُ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ ﴾[188] واتە : ئەوهانەی کافرو حەقپۆشن دەڵێن: قیامەت هەر نایەت و نامانگاتێ، (ئەی پێغەمبەر ﷺ ) پێیان بڵێ: (وانیە) ئەرێ!! سوێند بە پەروەردگارم هەر یەختان دەگرێت (چونکە ئەو زاتە) زانایە بە نهێنی و شاراوەکان و (هەر خۆی دەزانێ کەی بەرپای دەکات)، بەقەدەر ئەتۆمێك لە ئاسمانەکان و زەویدا ناتوانێتلەو پەنهان بێت، وە لەوەش بچووکتر بێت یان گەورەتر (چونکە هەموو شتێك) لە کتێبی تایبەتیدا ڕوون و ئاشکرایە (لوح المحفوظ)دا .›

وە فەرموویەتی ﴿ وَمَا تَكُونُ فِي شَأْنٍ وَمَا تَتْلُو مِنْهُ مِن قُرْآنٍ وَلَا تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلَّا كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُودًا إِذْ تُفِيضُونَ فِيهِۚ وَمَا يَعْزُبُ عَن رَّبِّكَ مِن مِّثْقَالِ ذَرَّةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ وَلَا أَصْغَرَ مِن ذَٰلِكَ وَلَا أَكْبَرَ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ ﴾[189] واتە : (ئەی پێغەمبەر ﷺ ) تۆ بەهیچ کارێک هەڵناسی، هیچ بەشێک لە قورئان ناخوێنیتەوە (کە ئێمە ئاگادار نەبین، ئێوەش ئەی خەڵکینە) بە هیچ

---

[187] [ طه: ٥٢ ]

[188] [ سبأ: ٣ ]

[189] [ يونس: ٦١ ]

هەڵسوکەوتێک هەڵناسن کە ئێمە شایەت نەبین بەسەریەوە لەکاتێکدا ئەنجامی دەدەن و تیایدا ڕۆدەچن، هیچ شتێکیش لە پەروەردگاری تۆ، ون نابێت لە پارچە ئەتۆمێکەوە بگرە لە زەوی یان لە ئاسماندا، بچوک تر بێت یان گەورە تر، کە لە دۆسیەیەکی تایبەتی ئاشکرادا لای ئێمە تۆمار نەکرا بێت.›

وە فەرموویەتی ﴿ إِنَّا نَحْنُ نُحْيِي الْمَوْتَىٰ وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا وَآثَارَهُمْ ۚ وَكُلَّ شَيْءٍ أَحْصَيْنَاهُ فِي إِمَامٍ مُبِينٍ ﴾[190] واتە : بێگومان هەر ئێمە مردووەکان زیندوو دەکەینەوە، هەرچی کردوویانە و دەیکەن تۆماری دەکەین لەگەڵ ئاسەوارەکانیشیاندا، هەموو شتێکمان لە کتێبێکی ئاشکرادا بەوردی تۆمار و ئامارکردووە.›

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ﴿ كَتَبَ اللَّهُ مَقَادِيرَ الْخَلَائِقِ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِخَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ، قَالَ : وَعَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ ﴾[191] واتە : الله تعالى کار و بار چارەنوسی دروستکراوەکانی نوسیوە پێش پەنجاهەزار پێش ئەوەی ئاسمانەکان و زەوی دروست بکات ، وە عەرشی الله تعالى لەسەر ئەوە.›

الله تعالى کار و بار و چارەنوسی هەموو دروستکراوەکانی نوسیوە لە لوح المحفوظ ، بۆیە واجبە کە کەسی موسڵمان ئیمانی پێ بهێنێت ،

سێیەم : هەرچی شتێک کە ڕوو دەدات ئەوە بەویستی الله تعالى یە وە هیچ شتێک ڕونادات گەر ویستی الله تعالى ی لەسەر نەبێت ،

هەرچی شتێک کە ڕوو دەدات ئەوە بەویستی الله تعالى یە ، جا ئەگەر بێت و ئەو شتە پەیوەندی بە کاری الله تعالى ەوە بێت یان پەیوەندی بە کاری بەندەوە هەبێت ئەوە هەر بەویستی الله تعالى دەبێت ،

---

[190] [ يس: ٧٠ ]

[191] [ رواه مسلم: برقم ٢٦٥٣ ]

الله تعالى سەبارەت بە کاری خۆی فەرموویەتی ﴿ قالَ رَبِّ أَنّى يَكونُ لي غُلامٌ وَقَد بَلَغَنِيَ الكِبَرُ وَامرَأَتي عاقِرٌ قالَ كَذلِكَ اللَّهُ يَفعَلُ ما يَشاءُ ﴾[192] واتە : زەکەریا وتی: ئەی پەروەردگارم من چۆن کوڕم دەبێت لە حاڵێکدا بەڕاستی پیری یەخەگیرم بووە وە ژنەکەشم نەزۆکە ؟ ( الله تعالى) فەرمووی کاری الله تعالى وایە چی بوێت دەیکات.›

وە فەرموویەتی ﴿ إِنَّ اللَّهَ يَفعَلُ ما يَشاءُ ۩ ﴾[193]واتە : بەدڵنیایەوە الله تعالى هەر شتێکی بوێ دەیکات.›

وە فەرموویەتی ﴿ يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذينَ آمَنوا بِالقَولِ الثّابِتِ فِي الحَياةِ الدُّنيا وَفِي الآخِرَةِ وَيُضِلُّ اللَّهُ الظّالِمينَ وَيَفعَلُ اللَّهُ ما يَشاءُ ﴾[194] واتە : ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە الله تعالى دامەزراویان دەکات بە وتەی بەڕێ و جێ (کە شایەتمانە) لە ژیانی دنیادا و لەڕۆژی دوایشدا وە الله تعالى ستەم کارانیش گومڕا دەکات وە الله تعالى هەرچی بیەوێ دەیکات.›

وە الله تعالى سەبارەت بە کاری بەندەکان فەرموویەتی : ﴿ وَما تَشاءونَ إِلّا أَن يَشاءَ اللَّهُ رَبُّ العالَمينَ ﴾ [195] واتە : ویستی ئێوەش نایەتە دێتە دی مەگەر کاتێك خوای پەروەردگاری جیهانیان بیەوێت.›

وە فەرموویەتی ﴿ وَما تَشاءونَ إِلّا أَن يَشاءَ اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ كانَ عَليمًا حَكيمًا ﴾ [196] واتە : ئێوە هیچتان پێناکرێت و هیچ کارێکتان پێ ئەنجام نادرێت مەگەر الله تعالى ویستی لەسەربێت، بێگومان الله تعالى زاناو دانایە.›

[192] [ آل عمران: ٤٠ ]
[193] [ الحج: ١٨ ]
[194] [ إبراهيم: ٢٧ ]
[195] [ التكوير: ٢٩ ]
[196] [ الإنسان: ٣٠ ]

وە فەرموویەتی ﴿ وَما يَذكُرونَ إِلّا أَن يَشاءَ اللَّهُ هُوَ أَهلُ التَّقوى وَأَهلُ المَغفِرَةِ ﴾ [197] واتە : جا ئەو خەڵکە یاداوەری وەرناگرێت و بیر لەم ڕاستیانە ناکاتەوە مەگەر ویستی الله تعالی ی لەسەر بێت ، جا هەر ئەو زاتەش شایستەی ئەوەیە کە خەڵکی حسابی بۆ بکەن و لە خەشمی بترسن و هەر ئەویش لە خۆی گرتووە کە لێخۆشبوو بێت.›

جا هەر شتێک کە ڕوو دەدات ئەوە ویستی الله تعالی لەسەرە و بەبێ ویستی ئەو هیچ شتێک نابێت ،

چوارەم : هەرچی ڕوو دەدات دروستکراوی الله تعالی ،

هەر شتێک کە هەیە وە هەرشتێک کە ڕوو دەدات ئەوە هەمووی دروستکراوی (مخلوق ی )الله تعالی ،

الله تعالی فەرموویەتی ﴿بَديعُ السَّماواتِ وَالأَرضِ أَنّى يَكونُ لَهُ وَلَدٌ وَلَم تَكُن لَهُ صاحِبَةٌ وَخَلَقَ كُلَّ شَيءٍ وَهُوَ بِكُلِّ شَيءٍ عَليمٌ – ذلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُم لا إِلهَ إِلّا هُوَ خالِقُ كُلِّ شَيءٍ فَاعبُدوهُ وَهُوَ عَلى كُلِّ شَيءٍ وَكيلٌ ﴾ [198] واتە : بێگومان ئەو زاتە بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەویە لە جوانترین و ڕێک و پێکترین شێوەدا، چۆن ڕۆڵەی دەبێت؟! خۆ ئەوزاتە هاوسەری نەگرتووە؟! بەڵکو هەموو شتێکی دروست کردوە، بەڕاستی ئەو زاتە بەهەموو شتێک زانایە. – ئا ئەو خوایە پەروەردگارتانە، جگە لەویش هیچ خوایەکی تر نیە، بەدیهێنەری هەموو شتێکە، کەواتە هەر ئەو زاتە بپەرستن و بەندایەتی تەنها ئەو بکەن، ئەو خوایە ئاگادارو چاودێری هەموو شتێکە.›

---

[197] [ المدثر: ٥٦ ]

[198] [ الأنعام: ١٠٢ ]

وە فەرموویەتی ﴿ اللَّهُ خالِقُ كُلِّ شَيءٍ وَهُوَ عَلى كُلِّ شَيءٍ وَكيلٌ ﴾[199] واتە : اللّٰه تعالى بەدیهێنەری هەموو شتێکە، هەر ئەویش سەرپەرشتیار و پارێزەری هەموو شتێکە.›

وە فەرموویەتی ﴿ ذلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُم خالِقُ كُلِّ شَيءٍ لا إِلهَ إِلّا هُوَ فَأَنّى تُؤفَكونَ ﴾[200]واتە : ئەو زاتە پەروەردگاری ئێوەیە و پەروەردگارتانە، بەدیهێنەری هەموو شتێکە، هیچ خوایەک نیە جگە لەو، ئیتر ئێوە بەرەو کوێ دەبرێن؟ چۆن لادەدرێن لە لەبەرنامەکەی؟.›

وە فەرموویەتی ﴿ الَّذي لَهُ مُلكُ السَّماواتِ وَالأَرضِ وَلَم يَتَّخِذ وَلَدًا وَلَم يَكُن لَهُ شَريكٌ فِي المُلكِ وَخَلَقَ كُلَّ شَيءٍ فَقَدَّرَهُ تَقديرًا ﴾ [201] واتە : ئەو زاتەی کە دەسەڵات و موڵکی ئاسمانەکان و زەوی هی ئەوە و هیچ منداڵی بۆ خۆی بڕیار نەداوە و کەس هاوبەشی نی یە لە فەرمانڕەوایی و موڵك داریدا وە هەموو شتێکی دروست کردووە وە ئەندازەی بۆ دیاری کرد بە چاکی.›

هەرچی ئەوەی کە ڕوو دەدات ئەوە دروستکراوی(مەخلوق ی) اللّٰه تعالى یە ،

وە ئەمەش بریتیە لە چوار پلەکەی ئیمان هێنان بوو بەقەدەر کە پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێک ئیمانی بەم دەرەجانە بهێنێت تاوەکو ئیمان هێنانی بە قەدەر تەواو و قبوڵ کراو بێت ، وە هەر کەسێک ئیمان بەیەکێک لەمانە نەهێنی ئەوە ئیماندار نیە بە قەدەر ، وە هەر کەسێک بێباوەڕ بێت بە قەدەر ئەوە کافرە و هەڵگەڕاوەتەوە لە دین ،

[199] [ الزمر: ٦٢ ]
[200] [ غافر: ٦٢ ]
[201] [ الفرقان: ٢ ]

وە مەسەلەی قەدەر پێویستی بە زیاتر شارەزایی هەیە ئەوەی ئێمە باسمان کرد تەنها بە گشتی بوو ، جاگەر کەسێک بیەوێت بە وردی لێی بکۆڵێتەوە ئەوە پێویستە لەسەری کە زیاتر بخوێنێت و لێی بکۆڵێتەوە گەرچی بەدوا داڕۆشتن و لێکۆڵینەوە باش نیە لەم باسەدا ،

جا هەموو ئەوانەی باسکران بریتین لە پایەکانی ئیمان کە پێویستە کەسی موسڵمان بە بیروباوەر و وتە و کردەوە ئیمانی پێ بهێنێت دانی پێدا بنێت ، وە هەرکەسێک باوەڕ بەیەکێک لەوانەکان ئەوە کافرە و هیچ ڕێزێکی نیە.

**[٥٧]** بەڵگەش لەسەر ئەم شەش پایەیە وتەی الله تعالى ـیە کە فەرموویەتی : کرداری چاك و کاری باش تەنها بریتی نیە لە ڕووکردنتان بەرەو ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا ، بەڵکو کرداری چاك و کاری باش بریتیە لەوەی کە ئادەمیزاد باوەڕی هێنابێت بە الله تعالى و بە ڕۆژی دوایی و بە فریشتەکان و بەکتێبەکان و بە پێغەمبەران.›

وە بەڵگەش لەسەر قەدەر وتەی الله تعالى : بێگومان ئێمە هەموو شتێکمان بەئەندازەو نەخشەی دیاریکراو دروست کردووە.›

❁ **ڕوونکردنەوە** ❁

شێخ رحمه الله بەڵگەی هێناوە لەسەر ئەوەی باسمان کرد لە پایەکانی ئیمان

مــتــن

**الْمَرْتَبَةُ الثَّالِثَةُ: الإِحْسَانُ**

رُكْنٌ وَاحِدٌ ، وهو :( أَنْ تَعْبُدَ اللهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ، فَإِن لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ ).
وَالدَّلِيلُ قَوْلُهُ تَعَالَى: ( إِنَّ اللّهَ مَعَ الَّذِينَ اتَّقَواْ وَّالَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ ) [النحل: 128].وقَوْلُهُ تَعَالَى:(وَتَوَكَّلْ عَلَى الْعَزِيزِ الرَّحِيمِ - الَّذِي يَرَاكَ حِينَ تَقُومُ - وَتَقَلُّبَكَ فِي السَّاجِدِينَ - إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ)[الشعراء:217-

چونکە هیچ شتێک قبوڵ نابێت لە دین ئیلا دەبێت بەڵگەی لەسەر بێت ، اللہ تعالى فەرموویەتی ﴿ لَيْسَ الْبِرَّ أَنْ تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ ﴾ ئەم ئایەتە ڕو بەڕوی جولەکەکانە کە لە مەدینە بوون ، اللہ تعالى فەرمووی چاکە ئەوە نیە کە ڕوو وەربگێڕن بۆ خۆر هەڵات و خۆر ئاوا ، چونکە جولەکە کان ڕویان دەکرە خۆر هەڵات و خۆر ئاوا تا نوێژ بکەن ، چونکە نوێژ کردنی جولەکەکان ئەوە بوو کە لە کاتی نوێژ کردن ڕو دەکەنە خۆر هەڵان و خۆر ئاوا ، جا اللہ تعالى دەفەرموێت ئەوە چاکە نیە کە ئێوە دەیکەن ، بەڵکو چاکە ئەوەیە ﴿ وَلَٰكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ ﴾ جا چاکە بریتیە لە ئیمان هێنان ، وە باشترین چاکەشە کە مرۆڤ ئەنجامی بدات ، ئەویش ئەوەیە ئیمان بەوانە بێنێت کە بەسکراون ،

جاگەر کەسێک بپرسێت ئایە هەموو پایەکانی ئیمان هاتوە لە یەک ئایەت دا ؟ لە وڵام دا بەڵێ هاتوە بەڵام بە ناو نەهاتوە کە هەر شەشی بە دوای یەک بێت ناو لەدوای ناو بەڵکو بەو شێوە هاتوە کە اللہ تعالى فەرموویەتی﴿ آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْهِ مِنْ رَبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ ۚ كُلٌّ آمَنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْ رُسُلِهِ ۚ وَقَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۖ غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ﴾[202]واتە : پێغەمبەرو ئیمانداران باوەڕیان هەیە بەوەی لە لایەن

[202] [ البقرة: ٢٨٥ ]

مـتـن

[220].وقَوْلُهُ تَـعَالَى: ( وَمَـا تَكُـونُ فِي شَـأْنٍ وَمَـا تَتْلُـو مِنْهُ مِن قُرْآنٍ وَلاَ تَعْمَلُـونَ مِنْ عَمَلٍ إِلاَ كُنَّـا عَلَيْـكُمْ شُهُودًا إِذْ تُفِيضُونَ فِيهِ ) [يونس: 61]
[58]وَالدَّلِيلُ مِنَ السُّـنَّةِ: حَدِيـثُ جِبْرِيلَ الْمَشْهُورُ: عَنْ عُمَرَ بنِ الْخَطَّابِ ـ رَضِيَ اللهُ عَـنْهُ ـ قَالَ: بَيْنَـمَا نَحْنُ جُلُـوسُ عِنْـدَ النَّبِيِّ ـ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ـ إِذْ طَـلَعَ عَلَيْنَا رَجُـلُ، شَدِيدُ بَيَاضِ الثِّيَابِ،شَـدِيدُ سَوَادِ الشَّعْرِ، لا

پەروەردگاریانەوە هاتۆتە خوارەوە، هەموویان باوەڕیان هەیە بە الله تعالى و فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی (دەڵێن) هیچ جۆرە جیاوازیەک ناکەین لە نێوان هیچ پێغەمبەرێ لە پێغەمبەرەکانی الله ـدا (لە باوەڕدا)، هەروەها وتیان: گوێڕایەڵ و ملکەچین (بۆ بەدیهێنەرمان) پەروەردگارا لێخۆش بوونی تۆمان دەوێت و سەرئەنجام هەر بۆ لای تۆیە گەڕانەوە.›

ئەو وتەیەی

﴿ آمَنَ بِاللَّهِ ﴾ ئەمە بریتیە لە ئیمان هێنان بە الله تعالى

﴿ وَمَلَائِكَتِهِ ﴾ ئەمە بریتیە لە ئیمان هێنان بە مەلائیکەتەکان

﴿ وَكُتُبِهِ ﴾ ئەمە بریتیە لە ئیمان هێنان بە کتابەکانی الله تعالى

﴿ وَرُسُلِهِ ﴾ ئەمە بریتیە لە ئیمان هێنان بە پێغەمبەران

﴿ وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ ﴾ ئەمە بریتیە لە ئیمان هێنان بە ڕۆژی دوایی چونکە دەفەرموێت بۆ لای تۆ دەگەڕێینەوە ، وە ئەمەش بریتیە لە ئیمان هێنان بە ڕۆژی دوای ، وە هەر ئەوەش بریتیە لە قەدەر چونکە الله تعالى دیاری کردوە کە هەر دەبێت بگەڕێنەوە بۆ لای الله تعالى ، وە ئەوانیش دان بەو دیاری کردنە دادەنیت کە لە پێشیانە و هێشتا ڕوی نەداوە ، وە ئەمەش بریتیە لە ئیمان هێنان بە قەدەر .

**[٥٨]** پلەی سێیەم : چاكەكاری

كە یەک پایەیە ، ئەویش بریتیە لەوەی كە : اللّٰه تعالی بپەرستی وەک ئەوەی كە دەیبینی ، جا ئەگەر تۆ ئەوت نەبینی ، ئەوە ئەو دەت بینێ ، بەڵگەش وتەی اللّٰه تعالی یە كە فەرموویەتی : بەڕاستی اللّٰه تعالی لەگەڵ ئەوانەیە كە خۆیان پاراستووە (لە تاوان) هەروەها ئەوانەش كە چاكەكارن.›

وە فەرموویەتی : وە پشت بەو خوایە ببەستە كە زاڵ و بە بەزەیی یە. – ئەو (خوایەی) كە دەتبینێ كاتێ بەتەنیا نوێژ دەكەی. – وە (دەبینێ) نوێژ كردنت لەناو نوێژكەراندا. – بەڕاستی تەنها ئەوە بیسەری ئاگادار.›

وە فەرموویەتی : وە (ئەی محمد ﷺ ) تۆ لە هەر مەبەست و كارێكدا بیت وە هەرچی لە قورئان بخوێنێ و (ئێوە) هەر كردەوەیەك بكەن بێگومان ئێمە بەسەرتانەوە شایەتین و ئاگادارین كاتێ دەڕۆنە ناویەوە و پێوەی خەریكن.›

## ۞ ڕوونكردنەوە ۞

ئیسحان بریتیە لە پلەی سێیەمی دین ، كە ئەویش وەک شێخ باسی كرد كە بریتیە لەوەی اللّٰه تعالی بپەرستی وەک ئەوەی كە دەیبینی ، جا ئەگەر تۆ ئەوت نەبینی ، ئەوە ئەو دەت بینێ ،

وە ئەم پێناسەیەش فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ وەک فەرموویەتی ﴿ الإحسانُ أن تعبدَ اللّٰهَ كأنك تراه ، فإن لم تكن تراه فإنه يَراك ﴾ [203] واتە : چەكەكاری ئەوەیە اللّٰه تعالی بپەرستی وەک ئەوەی كە دەیبینی ، جا ئەگەر تۆ ئەوت نەبینی ، ئەوە ئەو دەت بینێ.›

[203] [ صحيح الجامع برقم : ٢٧٦٢ ]

متن

يُرَى عَـلَيْهِ أَثَرُ الـسَّفَرِ، وَلا يَعْرِفُهُ مِنَّا أَحَدُ، فَجَلَسَ إِلَى النَّبِيِّ ـ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ـ فَأَسْـنَدَ رُكْبَتَـيْهِ إِلَى رُكْبَـتَيْهِ،وَوَضَـعَ كَفَّيْـهِ علَى فَخِذَيْهِ، وَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ أَخْبِـرْنِي عَـنِ الإِسْلامِ فَقَالَ: ( أَنْ تَشْـهَدَ أَنْ لا اله إِلا اللهُ وَأَنَّ مُحَـمَّدًا رَسُولُ اللهِ، وَتُقِيـمَ الصَّلاةَ، وَتُـؤْتِيَ الزَّكَاةَ، وَتَصُـومَ رَمَضَانَ، وَتَحُجَّ الْبَيْتَ إِنْ اسْتَطَعْتَ إِلَيْهِ سَـبِيلًا ).قَالَ: صَدَقْتَ. فَعَجِبْنَا لَهُ يَـسْأَلُهُ

ئیسحان بەبێ کردووەوە نابێت و ئەنجام نادرێت ، بەڵکوو دەبێت عیبادەتی لەگەڵ دابێت لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی الله تعالى بپەرستی ، نەی فەرموو وا حساب بکەی کە الله تعالی دەت بینێت ، بۆیە پێناسەی ئیحسان بەوە ناکرێت کە وا دابنێت کە الله تعالى دە بینێت ، چونکە گەر کەسێک بەبێ عیبادەت وا حساب بکات کە الله تعالی دەی بینێت ئەوە پێی ناوترێت ئیحسان بەڵکو پێ دەوترێت هەست کردن بە چاو دێری الله تعالى ،

جا بۆیە ئیحسان ئەو کاتە لە مرۆڤ دێتە دی کە الله تعالى بپەرستی و لەکاتی پەرستنەکە هەست دەکات الله تعالى دەیبنیت ،

پێویستە کەسی موسڵمان کە الله تعالى دەپەرستێ وەک نوێژ کردن و زەکات دان و بەڕۆژو بون و حەج و جیهاد و عیبادەتەکانی تر وای دابنێت کە الله تعالى دەبینێت کاتێک کە ئەو کەسە ئەو عیبادەتە دەکات ، وە ئەمەش چەندین سودی هەیە لەوانە دڵسۆز بون لە عیبادەتەکان ، کاتێک کە کەسی موسڵمان هەست بەوە دەکات کە الله تعالى دەیبینێت لە کاتی نوێژ کردنەکەی ئەوە دور دەبێت لەوەی بۆ ڕیایی بکات ،

وە سودی ئەوەی تێدایە کە دەبێتە هۆی هەبوونی خشوع و ملکەچی بەندە بۆ الله تعالى کاتێک کە بەندە هەست دەکات الله تعالى دەبینێ ئەوە ملکەچ ی و زەلیلی دای دەگرێت لە عیبادەتەکەی دا ،

وە سودی ئەوەی تێدایە کە چالاکی دەدات بە بەندە بۆ عیبادەت بەوەی هەست دەکات خۆشەویسترین شتی کە اللہ تعالی یە دەیبینێت و سەری دەکات ،

اللہ تعالی فەرموویەتی ﴿ إِنَّ اللّهَ مَعَ الَّذِينَ اتَّقَواْ وَّالَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ ﴾ اللہ تعالی لەگەڵ دوو جۆر کەسە

یەکەم : ئەو کەسەیە کە خۆی دور دەگرێت لە حەڕام کراوەکان و سنورەکانی اللہ تعالی نا بەزێنێت کە ئەمەش بریتیە لە کەسی پارێزکار یان خۆپارێز( لەوشتانەی کە اللہ تعالی قەدەغەی کردوە ) ،

دووەم : بریتیە لە کەسێک کە کاتێک اللہ تعالی دەپەرستێت هەست بەوە دەکات و بەجۆرێک عیبادەتەکە دەکات کە لە بەردەستەکانی اللہ تعالی ە و اللہ تعالی دەی بینێت و ئەویش اللہ تعالی دەبینێت کە ئەمەش کەسی چاکەکارە ، جا اللہ تعالی لەگەڵ کەسی چاکەکارە و دەی بینێت کە عیبادەت بۆ اللہ تعالی ئەنجام دەدات وەک پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ﴿ فإن لم تكن تراه فإنه يَراك ﴾ واتە : جا گەر چی تۆ ئەو نەبینی ئەوە ئەو ( اللہ تعالی) تۆ دەبینێت ،

جا ئەگەر چی مرۆڤ اللہ تعالی نەبینێت لە دونیا ئەوە اللہ تعالی ئەو دەبینێ لە هەموو کات و ساتێک دا ، اللہ تعالی فەرموویەتی ﴿ وَتَوَكَّلْ عَلَى الْعَزِيزِ الرَّحِيمِ ﴾ اللہ تعالی پێغەمبەرەکەی ﷺ فێر دەکات کە پشت ببەبستێت ( بە اللہ تعالی کە ) بەدەسەڵاتە بەسەر هەموو شتیک و بەبەزیی و بەڕوحمە ،

لێرە اللہ تعالی دوو سیفەتی تر و دوو ناو بۆ خۆی دەچەسپێنێت کە ئەوانیش توانا و بەدەسەڵاتی اللہ تعالی بەسەر هەموو شتێک (العزيز) وە بە بەزیی و میهربەکانی (الرحيم)

مـتـن

وَيُصَدِّقُـهُ.قَالَ:أَخْبِرْنِي عَنِ الإِيمَانِ.قَالَ:(أَنْ تُؤْمِنَ بِاللهِ،وَمَلائِكَتِهِ،وَكُتُبِهِ، وَرُسُـلِهِ، وَالْيَوْمِ الآخِـرِ، وَتُؤْمِـنَ بِالْقَدَرِ خَـيْرِهِ وَشَـرِّهِ ). قَالَ: صَدَقْتَ. قَالَ: أَخْـبِرْنِي عَنِ الإِحْـسَانِ. قَالَ: ( أَنْ تَعْبُـدَ اللهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ ). قَالَ: أَخْـبِرْنِي عَـنِ السَّاعَةِ. قَـالَ: (مَا الْمَسْؤُولُ عَنْهَا بِأَعْلَمَ مِنَ السَّائِلِ). قَالَ: فَأَخْـبِرْنِي عَـنْ أَمَارَاتِهَا. قَالَ: ( أَنْ تَلِدَ الأَمَةُ رَبَّتَهَا، وَأَنْ

جا پاشان ﷲ تعالى لە وەسفی ئەو زاتەی کە بە دەسەڵات و بەبەزیی یە دەفەرموێت ﴿ الَّذِي يَرَاكَ حِينَ تَقُومُ ﴾ ئەو زاتەی کە دەت بینێت کاتێک هەڵدەستیت ،

جالێرە سیفەتێکی ﷲ تعالى دەر دەکەوێت کە ئەویش سیفەتی بینینە کە ﷲ تعالى دەبینێت ،

جا ئەو زاتە تۆ دەبینێت کاتێک کە هەڵدەستیت نوێژ دەکەیت بۆ ﷲ تعالى بەتەنها لە شەو نوێژدا ، وە هەروها ﴿ وَتَقَلُّبَكَ فِي السَّاجِدِينَ ﴾ لەو کاتەش دەتبینێت کە نوێژ بە کۆمەڵ دەکەیت لەگەڵ سەحابەکان ﴿ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴾ وە ئەو ﷲ تعالى یە بیسەر بە دەنگت کاتێک قورئان دەخوێنیت وە زانایە بە نیەتی دڵتان و کردەوەکانتان ،

وە لێرەش ﷲ تعالى دوو سیفەتی تر بۆخۆی دەسپێنێت کە سیفەتی بیستن و هەبوونی زانستە ،

بەڵام سیفەتەکانی ﷲ تعالى وەک هیچ یەکێک لە دروستکراوەکانی نیە ، نە زاتی و بەتوانایی ﷲ تعالى وەک هی دروست کراوەکانیەتی ، وە نە بەزەیی ﷲ تعالى وەک هی دروست کراوەکانیەتی ، وە نە بینینی ﷲ تعالى وەک دروست کراوەکانیەتی ، وە نە بیستنی ﷲ تعالى وەک دروست کراوەکانیەتی ، وە نە زانستی ﷲ تعالى وەک هی دروست کراوەکانیەتی ، بەڵکوو بەو شێوەیە کە هەر

متن

قُلْنَا:اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ:(هَذَا جِبْرِيلُ أَتَاكُمْ يُعَلِّمُكُمْ أَمْرَ دِينِكُم).[59]

........................................................................................................

........................................................................................................

........................................................................................................

........................................................................................................

خۆی دەزانێت و شایستەیە بە خۆی ، بەڵام ئێمە لەسەرمان پێویستە کە دانی پێدا بنێین بۆ الله تعالى وەک چۆن الله تعالى دانی پێداناوە بۆ خۆی ، وە پێویستە ڕەتی بکەینەوە بۆ غەیری الله تعالى کە وەک الله تعالى ئەو سیفەتانەی هەبێت ،

پاشان الله تعالى فەرموویەتی ﴿ وَمَا تَكُونُ فِي شَأْنٍ ﴾ مرۆڤ هەر کاتێک لە ئەنجامدانی هەر کارێک بێت جا خێر بیت یان شەڕ ﴿ وَمَا تَتْلُو مِنْهُ مِن قُرْآنٍ ﴾ وە چەندێک لە قورئان بخوێنێت یان قسە بکات یان زانستی شەرعی بخوێنی یان زانستی دونیایی بخوێنی ﴿ وَلاَ تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ ﴾ وە یان هەر کردوەیێک بکات جا گەر خێر بێت یان شەڕ ﴿ إِلاَّ كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُودًا إِذْ تُفِيضُونَ فِيهِ ﴾ ئەوە بێگومان الله تعالى چاو دێر و شایەدە بەسەر تانەوە کە کاتێک کارێکی خێر یان شەڕ ئەنجامدەدن وەیان قسەی خێر یان شەڕ دەکەن وەیان زانستی بەسود و بێ سود دەخوێنن ، ئەوە الله تعالى دەتان بینێت و شایەدە بەسەر تانەوە و دەتان بینێت ،

لێرەشدا سیفەتێکی الله تعالى بەدیار دەکەوێت کە الله تعالى بۆخۆی دانی پێداناوە کە ئەویش سیفەتی چاودێری الله تعالى یە بەسەر دروست کراوەکانیەوە .

[٥٩]وەبەڵگەی فەرمودەش لەسەر پایەکانی ئیسلام وئیمان و ئیحسان،

لە عمر ی کوری خەتاب ( الله تعالی لێی ڕازی بێت ) دەفەرمت ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەری الله تعالی بووین ﷺ دانشتبووین لەناکاو پیاوێکمان لێ بەرکەوت کەجل و بەرگەکەی زۆر سپی بوو وە مووی لاشەی زۆر ڕەش بوونیشانەری سەفەرکردنی لێ نەدەبینرا وەهیچ کوسێکیش لەئێمە نەی دەناسی هەتا کەیشتە لای پێغەمبەر ﷺ دانیشت هەردوو چۆکی خۆی بەهەردوو چۆکی پێغەمبەر ﷺ نوساند وەهەردوو دەستەکانی خۆی لەسەر هەردوو ڕانەکانی خۆی دانا و فەرمووی ئەی محمد( ﷺ )هەواڵم بدەرێ لەبارەی ئیسلامەوە ئیسلام چییە ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ئیسلام ئەوەیە کەشایەتی بدەیت هیچ پەرستراوێك نیە شایەنی پەرستن بێت بەحەق تەنها الله تعالی نەبێت ، وە محمد یش نێردراوی الله تعالی یە و نوێژبکەیت و زەکات بدەیت و مانگی ڕەمەزان بەرۆژوو بیت و حەج ئەنجام بدەیت ئەگەر توانات هەبوو ، ئەو پیاوەی کەپرسیاری لێی کرد وتی ڕاست دەکەیت (ئیمامی عمر) فەرمووی سەرمان سورما لەکاتێکدا خۆی پرسیار دەکات و خۆیشی دەیگوت ڕاست دەکەیت ، دیسان پیاوەکە پرسیاری لێکرد فەرمووی ئەی ئیمان چیە؟ پێغەمبەریش ( ﷺ ) فەرمووی ئیمان بریتیە لە باوەڕهێنان بە الله تعالی و بەفریشتەکان و بەکتێبەکان و بەپێغەمبەران و بەرۆژی دوایی ، وە باوەرهێنانە بەقەزاو قەدەر خیری و شەری ، دیسان ، پیاوەکە وتی ڕاست دەکەیت پیاوەکە فەرمووی چاکەکردن (احسان)چییە؟پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی چاکەکردن بریتیە لەوەی کە الله تعالی بپەرستییت وەك ئەوەی بینی وەئەگەر تۆیش ئەو نەبینی ئەوا ئەو تۆ دەبینێت ، پیاوەکە گوتی پێم بڵێ کەی ڕۆژی دوای دێت پێغەمبەر( ﷺ ) فەرمووی پرسیار لێکراو زاناتر نیە لە باریەوە لە پرسیار کەر ، پیاوەکە گوتی پێم بڵێ نیشانەکانی کاتی هاتنی ڕۆژی دوایی چییە؟، پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی کچ دەبێتە گەوەری بە خێوکەری خۆی و بینینی پیاوی پێخواس ڕووت و هەژاری

شوانی مەران شانازی بەسەر یەكتریكەن بەبەرزی و جوانی كۆشك تەلارەكانیانەوە ، ئیمامی عمر دەفەرموێت لەپاشان پیاوەكە رۆیشت بۆ ماوەیەكی زۆر مامەوە لەپاشان پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی ئەی عمر دەزانیت ئەوەی پرسیاری كرد كێ بوو وتم الله تعالى و پێغەمبەرەكی ﷺ دەزانن پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی ئەوە جوبرائیل بوو هات بۆلای ئێوە بۆ ئەوەی دینەكەتان فێر بكات،›[204]

## ۞ ڕوونكردنەوە ۞

دوای ئەوەی شیخ (رحمەالله) بەڵگەی هێنایەوە لە ئایەتەكانی الله تعالى لەسەر ئیسلام و ئیمان و احسان ، بەهەمان شێوە بەڵگەی لە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ هێناوتەوە لەسەر ئیسلام و ئیمان و احسان ،

﴿ عَنْ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُ أَيضاً قَال: بَيْنَمَا نَحْنُ جُلُوْسٌ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ ﴾ لە ئیمانی عمر ـەوە الله تعالى لێی ڕازی بێت ،

ئەمەیە بەڵگەیە كە ئیمامی عمر یەكێک بوە لە هاوەڵەكانی پێغەمبەر ﷺ وە لەلای دانشتوە ، وە یەكێک لە مەرجەكانی بوون بە هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ بریتیە لە گەیشتن بە دیداری و لیقای ، وە ئیمامی عمر یش یەكێک بەوە لە و هاوەڵانە ، وە دانشتوە لەلای پێغەمبەر ﷺ وە قسەی لەگەڵ كردوە ،

ئیمامی عمر ناوی تەواوی عمر ی كوڕی خەطاب ی كوڕی نفیل ی العدوی القریشي یە كە یەكێكە لەو كەسانەی كە لە پێش هیجرەت كردن موسڵمان بوە ، وە كۆچی (هیجرەتی) كردوە بۆ مەدینە بە تەنها ،

[204] [رواه مسلم برقم: ٨]

وە دووەم خەلیفەیە وە یەکێکە لەو کەسانەی کە هەر لە دونیا موژدەی بەهەشتی پێدراوە ،

ئیمامی عمر دەفەرموێت ﴿ إِذْ طَلَعَ عَلَيْنَا رَجُلٌ شَدِيْدُ بَيَاضِ الثِّيَاب شَدِيْدُ سَوَادِ الشَّعْرِ لاَ يُرَى عَلَيْهِ أَثَرُ السَّفَرِ وَلاَ يَعْرِفُهُ مِنَّا أَحَدٌ حَتَّى جَلَسَ إِلَى النبي صلى الله عليه وسلم ﴾ ئەم پیاوە بریتیە لە جوبرائیلی مەلائیکەت کە گەورەترین و بەڕێزترین مەلائیکەتە لەلای الله تعالى ،

وە بریتیە لەو مەلائیکەتەی کە وەحی و نیگا لەلایان الله تعالى ەوە دەهێنێت بۆ پێغەمبەران ،

وە بریتیە لەو مەلائیکەتەی کە بەفەرمان و ویستی الله تعالى عەزاب و سزای قەومی موشریکان و دەدات و لەناویان دەبێت ،

جوبرائیل (علیه السلام) لەسەر شێوەی پیاوێک دێت بۆ لای پێغەمبەر ﷺ جلێکی سپی لەبەرە وە هیچ جێگا و نیشانەی کەسی گەشت کەری پێوە نیە ، چونکە مەلائیکەت نە ماندوو دەبێت وەنەک وەکو مرۆڤە کە لاشەی پیس ببیت ،

وە لەم فەرموودەیە بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە مەلائیکەت دەتوانێت شێوەی خۆی بگۆڕێت بۆ مرۆڤ و کەس نەزانێت کە ئەمە مەلائیکەیە ، دەتوانێت وەک مرۆڤ هەڵسو کەوت بکات لە چەندین بواردا ،

هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بۆ مەبەستێک کە ئەویش ئەوەیە هاوەڵەکانی پێغەمبەر ﷺ فێری دینەکەیان بکات بە شێوەی پرسیار و وڵام ،

﴿ فَأَسْنَدَ رُكْبَتَيْهِ إِلَى رُكْبَتَيْهِ وَوَضَعَ كَفَّيْهِ عَلَى فَخِذَيْهِ وَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ أَخْبِرْنِي عَنِ الإِسْلاَمِ ﴾ جوبرائیل ( علیه السلام ) لە پێغەمبەر ﷺ نزیکی پێغەمبەر ﷺ

دانیشت وە چۆکی نا بە چۆکی پێغەمبەر ﷺ وە دەستی لەسەر ڕانی دانا و پێی فەرموو ئەی محمد ( ﷺ ) هەواڵم پێدە سەبارەت بە ئیسلام ،

ئەم ڕەفتارەی جوبرائیل سیفەتێکی جوانە بۆ قوتابی فێرخوار کە ڕەچاوی بکات لە کاتی پرسیار کردن لە مامۆستاکەی ، جا ئەگەر نەیتوانی بەو شێوە بکات ئەوە باش وایە کە خۆی لێنزیک بکاتەوە بە شێوەیکی جوان وە گوێی لێ بگرێت ، وە ئەمەش پێچەوانەی ئەوەیە کە قوتابی فێرخواز دور بە دور پرسیار لە مامۆستاکەی بکات و دەنگ بەرزبکات لە دورەوە ، بەڵکو باش وایە گەر توانی ئەوە خۆی لێ نزیک بکاتەوە و بەڕەوشتیکی جوانە و پرسیاری لێ بکات و ناوی بهێنێت وەک بڵیت ئەی مامۆستا یاخود یا شیخ ،

ئەم جۆرە قسەکردنە خۆشەویستی و ڕێز دروست دەکات لە نیوان قوتابی و مامۆستاکەی ، بۆیە باش وایە کە کەسی فێرخواز ئەم ڕەوشتە لەخۆی بهێنێتە دی و ئەنجامی بدات ،

﴿ قَالَ: صَدَقْتَ ، فَعَجِبْنَا لَهُ يَسْأَلُهُ وَيُصَدِّقُهُ ﴾ دوای ئەوەی کە جوبرائیل پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد سەبارەت بە ئیسلام و وە پێغەمبەر ﷺ وڵامی دایەوە ، جا ئێمە لە پیشوو باسمان کرد بۆیە لێرە باسی ناکەین ،

جا ئیمامی عمر دەفەرموێت ئێمە سەرمان سوڕما لەوەی کە پرسیاری لێدەکرد و بەڕاستیشی دەخستەوە ، ئەوەش لەبەر ئەوەی هاوەڵە بەرێزەکان پیاوەکەیان نەدەناسی و سەریان لێدەهات کە چۆن کەسێک پێشتر ئێمە نەمان بینیوە و نەمان ناسیوە کە موسڵمان بوویێت کەچی ئەو شتەکان بەبێ لێ کۆڵینەوە و ئینکاری کردن بڕوا دەکات و دەڵێت ڕاست دەکەیت ،

﴿ قَالَ: فَأَخْبِرْنِي عَنِ السَّاعَةِ، قَالَ: مَا الْمَسْئُولُ عَنْهَا بِأَعْلَمَ مِنَ السَّائِلِ قَالَ : ﴾ پاشان جوبرائیل پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد سەبارەت بە ڕۆژی دوایی ، بەڵام پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ئەوەی پرسیاری لێکراوە زاناترە نیە لە بارەی ڕۆژی دوای لەو کەسی پرسیاری کردوە ،

مەبەستی پێغەمبەر ﷺ بریتی بوو لەوەی کە من کە پرسیارم لێکراوە سەبارت بە قیامەت زاناتر نیم لەو تۆ ئەی جوبرائیل کە پرسیار دەکەی لەبارەی ڕۆژی دوایی ، جا ئەوەش نیشانەی ئەوەیە کە نە پێغەمبەر ﷺ کە گەورترین و بەڕیزترین مرۆڤە لەلای الله تعالی ، وە نە جوبرائیل علیه السلام کە گەورەترین و بەرێزترین مەلائیکەیە لەلای الله تعالی ، ئەوە هیچیان نازان کە قیامەت کەی دێت و کەی بەرپا دەبێت ، چونکە ئەو کاتە کەس نایزانێت تەنها الله تعالی دەیزانێت ،

﴿ فَأَخْبِرْنِيْ عَنْ أَمَارَاتِها، قَالَ: أَنْ تَلِدَ الأَمَةُ رَبَّتَهَا، وَأَنْ تَرى الْحُفَاةَ العُرَاةَ العَالَةَ رِعَاءَ الشَّاءِ يَتَطَاوَلُوْنَ فِي البُنْيَانِ ﴾ پاشان لە دوای ئەوەی دەرکەوت کە نە پێغەمبەر ﷺ وە نە جوبرائیل علیه‌السلام نازانن ڕۆژی قیامەت کەی دێت ، ئەوە جوبرائیل فەرمووی هەواڵم پێبدە سەبارەت بە نیشانەکانی قیامەت ، جا پێغەمبەر ﷺ دوو نیشانەی پێوت ،

یەکەم : ئەوە بوو کە یەکێک لە نیشانەکانی ئاخیر زەمان بریتییە لەوەی کە کچ دەبیت بە گەورەی دایکی خۆی ، ئەوەش بەوەی کە ئازادی دەدرێت بە ئافرەت و وای لێدێت کچ فەرمان بەدایکی دەکات و سەر پەرشتی دەکات و دەبێتە قسەزان و قسەکەر بەسەر دایکیەوە ،

دووەم : ئەوەیە کە پیاوە شوانە بێ موڵک و سامانەکانی قەد شاخ و بیابانەکان دەبنە کەسانی دەوڵەمەند و خاوەن موڵکو سامان وە کەیفان لەماڵ و

متن

مَعْرِفَةُ نَبِيِّكُمْ مُحَمَّدٍ ـ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.
وَهُوَ مُـحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ بْنِ هَاشِمٍ، وَهَاشِمُ مِنْ قُرَيْشٍ، وَقُـرَيْشٌ مِنَ الْعَرَبِ، وَالْعَرَبُ مِنْ ذُرِّيَّةِ إِسْمَاعِيلَ بْنِ إِبْرَاهِيمَ الْخَلِيلِ عَلَيْهِ وَعلَى نَبِـيِّنَا أَفْضَـلُ الصَّلاةِ وَالسَّلامِ،[60]وَلَـهُ مِنَ العُـمُرِ ثَـلاثٌ وَسِـتُّونَ سَنَـةً، مِنْهَا أَرْبَعُـونَ قَـبْلَ النُّـبُـوَّةِ، وَثَلاثٌ وَعِـشْـرُونَ فـي الـنبـوة.[61]

سامانەکایان دێت و پێی سەر سام دەبن و خۆیانی پێ هەڵدەکێشن بەسەر یەکتری دا ،

﴿ ثُمَّ انْطَلَقَ فَلَبِثَ مَلِيّاً ثُمَّ قَالَ: يَا عُمَرُ أَتَدْرِي مَنِ السَّائِلُ؟ قُلْتُ: اللهُ وَرَسُوله أَعْلَمُ، قَالَ: فَإِنَّهُ جِبْرِيْلُ أَتَاكُمْ يُعَلِّمُكُمْ دِيْنَكُمْ ﴾ پاشان لەدوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ باسی چەند نیشانەیکی ئاخیر زەمانی کرد ، جورائیل هەڵساو ڕۆشت ،

پاشان پێغەمبەر ﷺ بە ئیمامی عمر ی فەرموو ئایە دەزانیت ئەو پیاوە کێ بوو ؟؟ ئیمام عمر فەرمووی الله تعالی و پێغەمبەرکەی زاناترن ﷺ ،

ئەو وڵامەی ئیمامی عمر بۆ پێغەمبەر ﷺ سیفەتێکی جوان و ڕەوشتێکی بەرزە بەرامبەر الله تعالی و پێغەمبەرەکەی ﷺ ، چونکە مرۆڤ هەرگیز لە الله تعالی و پێغەمبەرەکەی زاناتر نابێت بە دین ،

وە لەوەش ئەمە فێر دەبین کە کەس بۆی نیە قسەی خۆی بخاتە پێش قسەی الله تعالی و پێغەمبەرەکەی ﷺ ، وە پێچەوانەی الله تعالی و پێغەمبەرکەی ﷺ قسەبکات و خۆی لەوان بەزاناتر نیشان بدات ، چونکە کەس لە الله تعالی پێغەمبەرەکەی ﷺ زاناتر و شارەزاتر نیە بەدین ،

پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ئەوە جوبرائیل بوو هاتبوو تاوەکو فێری دینەکەتان بکات کە ئیسلام و ئیمان و ئیحسانە ،

# بنچینەی سێیەم

[60]ناسینی پێغەمبەرەکەتان محمد ﷺ، وە ئەویش (ناوی) محمد ی کوڕی عبدالله ی کوڕی عبدالمطلب ی کوڕی هاشم ە ، وە هاشیم لە (هۆزی) قورەیش ە ، وە قورەیش یش لە (نەتەوەی) عەرەبە ، وە عەرەبیش لە نەوەکانی (پێغەمبەر) اسماعیل ی کوڕی پێغەمبەر ابراهیم ە ،

❁ ڕوونکردنەوە ❁

سێیەم بنچینە بریتیە لە ناسینی پێغەمبەرمان ﷺ ،

پێویستە لەسەر کەسی موسڵمان کەوا ئەم بنچینەیش لە بیر نەکات کە بریتیە لە ناسینی پێغەمبەرمان ﷺ چونکە گەر کەسێک پێغەمبەر ﷺ نەناسێت و نەزانێت چۆن بوە ئەوە توشی گومڕایی دەبێت ، چونکە ناسینی پێغەمبەر ﷺ دەبێتە هۆی ناسینی سونەتەکەی و فەرموودەکانی ،

جا گەر پێغەمبەرەکەی ﷺ نەناسێت ئەوە بێگومان سونەکەشی ناناسێت ، وە بەهۆی نەزانینیەوە گومڕا دەبیت و توشی کوفر و شیرک و بیدعە و خوڕافیات دەبێت ،

ئەوەی لە باسی ناوی (بەڕاستی و دروستی) هاتوە بریتیە لە محمد ی کوڕی عبدالله ی کوڕی عبدالمطلب ی کوڕی هاشم ی کوڕی عبد مناف ی کوڕی قصي ی کوڕی کلاب ی کوڕی مرة ی کوڕی کعب ی کوڕی لؤي ی کوڕی غالب ی کوڕی فهر ی کوڕی مالك ی کوڕی النضر ی کوڕی کنانة ی کوڕی خزیمة ی کوڕی مدرکة ی کوڕی الیاس ی کوڕی مضر ی کوڕی نزار ی کوڕی معد ی کوڕی عدنان لە نەوەکانی اسماعیل ی کوڕی ابراهیم ە علیهما السلام ،

وە ئەمە بریتیە لە ڕەچەڵەکی (نسب ی ) پێغەمبەر ﷺ ، بەڵام ناوی خۆی کە لێی ناراوە و پێی ناسراوە بریتیە لە ناوی [محمد] ە

الله تعالی فەرموویەتی ﴿ مُحَمَّدٌ رَسولُ اللَّهِ ﴾ [205] واتە : محمد نێردراوی الله تعالی یە.›

وە هەروها ناوی احمد ە

الله تعالی فەرموویەتی ﴿ وَإِذ قالَ عيسَى ابنُ مَريَمَ يا بَني إِسرائيلَ إِنّي رَسولُ اللَّهِ إِلَيكُم مُصَدِّقًا لِما بَينَ يَدَيَّ مِنَ التَّوراةِ وَمُبَشِّرًا بِرَسولٍ يَأتي مِن بَعدِي اسمُهُ أَحمَدُ فَلَمّا جاءَهُم بِالبَيِّناتِ قالوا هذا سِحرٌ مُبينٌ ﴾[206]واتە : بیریان بخەرەوە، کاتێك عیسای کوری مەریەم بەنەوەی ئیسرائیلی وت: منیش بەڕاستی پێغەمبەری الله م بۆ سەر ئێوە، ڕاستی تەوراتیش دەسەلمێنم کەلە پێش مندا هاتووە، هەروەها مژدەدەریشم بەپێغەمبەرێك کە دوای من دێت و ناوی – ئەحمەد – ە، کەچی کاتێك بە بەڵگە و نیشانەی تێر و تەواوو موعجیزەی ئاشکراوە پێی ڕاگەیاندن، وتیان: ئەمە جادوویەکی ئاشکرایە.›

وە جگە لەم ناوانەش چەندین ناوی تری هەیە کە وەک الماحي و حاشر و العاقب.›[207]

بەڵام بەم ناوەی ناسراوە کە [محمد] ە ، وە کونیەی بریتیە [ابو القاسم] باوکی قاسم ،

**[٦١]**وە تەمەنی (پێغەمبەر) شێست و سێ ساڵ بوو ، چل ساڵی لە پێش پێغەمبەرایەتی بوو ، وە بیست و سێ ساڵی لە دوای پێغەمبەرایەتی بوو ،

---

[205] [ الفتح: ٢٩ ]

[206] [ الصف: ٦ ]

[207] [ رواه البخاري : برقم ٤٨٩٦ ]

متن

نُبِّئَ بـ(اقْرَأ)، وَأَرْسِلَ بـ (الْمُدَّثِّرْ)، وَبَلَدُهُ مَكَّةُ.[62]بَعَثَـهُ اللهُ بِالنِّذَارَةِ عَنِ الشِّرْكِ، وَبالَدْعُوة إِلَى التَّوْحِيدِ،[63]وَالدَّلِيلُ قَوْلُهُ تَعَالَى: (يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ -قُمْ فَأَنذِرْ-وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ-وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ-وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ-وَلاَ تَمْنُن تَسْتَكْثِرُ - وَلِرَبِّكَ فَاصْبِرْ )[المدثر: 1ـ7].وَمَـعْـنَى: ( قُـمْ فَأَنذِرْ ): يُنْـذِرُ عَنِ الشِّـرْكِ، وَيَدْعُو إِلَى التَّوْحِيدِ. (وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ):أَيْ: عَظِّمْهُ بِالتَّوْحِيدِ. (وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ):

### ❁ ڕوونکردنەوە ❁

پێغەمبەر ﷺ لە ساڵی فیل لە دایک بوە ، وە بۆیەش پێی دەوترێت ساڵ فیل چونکە لەو ساڵە دا پاشای شام ابرهة ویستی مەکە برۆخێنێت ، وە بۆ ئەوەش بە فیل هات ویستی هێرش بکاتە سەر شاری مكة ، وە پێغەمبەر ﷺ لەو ساڵە لە دایک بوە کە پێی دەورتیت ساڵی فیل لە دوانزەی ربیع الأول.›[208]

وە لە تەمەنی بیست و پێنج ساڵی هاوسەر گیری کردوە لەگەڵ دایکی ئیماندارن خديجة ى کچی خویلید.›[209]

وە ڕاسترین وتە لەسەر تەمەنی پێغەمبەر ﷺ بریتیە لەوەی تەمەنی شێست و سێ ساڵ بوە .›[210]

جا لە نێوان ئەو شێست و سێ ساڵە الله تعالى کردویەتی بە پێغەمبەر لەتەمەنی چل ساڵی دا کراوە بە پێغەمبەر لە ئەشکەوتی حراء پێغەمبەر ﷺ.›[211]

**[٦٢]**(پێغەمبەر ﷺ) بە(اقرأ)کراوە بە نبي وە بە (المدثر) ، وە شارەکەی مكة بووە ،

[208] [ السيرة النبوية : ١/٢٠٥ ]
[209] [ السيرة النبوية : ١/٢٣٣ ]
[210] [ رواه البخاري : برقم ٤٤٦٦]
[211] [ رواه مسلم : برقم ١٦٠ ]

## ❁ ڕوونكردنەوە ❁

پێغەمبەر ﷺ (النبي) و (رسول) ، لە پێشو باسی جیاوازیمان کرد لە نێوان النبي و رسول ، جا پێغەمبەری ئێمە ﷺ بریتیە لە النبي ، وە بریتیشە لە رسول ، وە ئەمەش لەگەورەیی پێغەمبەرمانە ﷺ ،

وە جگە لەوەی نبی و رسول ە بەڵكو یەكێكە لە گەورەترین پێغەمبەرەكان كە پێیان دەوتریت اولو العزم ە ، الله تعالى فەرموویەتی ﴿ فَاصبِر كَما صَبَرَ أُولُو العَزمِ مِنَ الرُّسُلِ وَلا تَستَعجِل لَهُم ﴾[212]واتە : كەوابوو ئەی پێغەمبەر ( ﷺ ) دان بەخۆدا بگرەو خۆڕاگربە، هەروەكوو پێغەمبەرانی خاوەن ویستی بەهێز خۆڕاگر بوون، پەلەشیان لێ مەكە.›

جا اولو العزم پێنج پێغەمبەرن (علیهم السلام) كە ئەوانیش بریتین لە نوح و ابراهیم و موسی و عیسی و محمد علیهم السلام ،

الله تعالى فەرموویەتی ﴿ وَإِذْ أَخَذْنَا مِنَ النَّبِيِّينَ مِيثَاقَهُمْ وَمِنْكَ وَمِنْ نُوحٍ وَإِبْرَاهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ ۖ وَأَخَذْنَا مِنْهُمْ مِيثَاقًا غَلِيظًا ﴾ [213] واتە : ئەی محمد( ﷺ ) بیریان بخەرەوە كاتێ كە پەیمانمان وەرگرت لە پێغەمبەران هەروەها لە تۆو نووح و ئیبراهیم و مووسا و عیسای كوڕی مەریەم وە لە هەموویان پەیمانی بەهێزو پتەومان وەرگرت.›

جا لەناو مرۆڤەكان ( النبي ) هەیە ، وە لەناو (النبي)ەكان (رسول) هەیە وە لە ناو (رسول)ەكان پێنج دانەی گەورە و بەڕێز هەیە كە پێیان دەوترێت (اولو العزم) وە لە ناو ئەو پێنج دانەیە یەک دانەیان لە هەمویان گەورەترە كە ئەویش بریتیە لە پێغەمبەرمان محمد ﷺ ،

[212] [ الأحقاف: ٣٥ ]

[213] [ الأحزاب: ٧ ]

پێغەمبەر ﷺ بە اقرأ کرا بە (النبي) کە لە ئەشکەوتی حراء بوو کاتێک جوبرائیل هات بۆ لای پێغەمبەر فەرمووی بخوێنە پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی من خوێندەوار نیم جا جوبرائیل باوشی لێدا بەتوندی و پاشان دوبارە فەرمووی بخوێنە ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی من خوێندەوار نیم ، بۆ جاری سێیەم جوبرائیل باوشی لێدا بەتوندی و پاشان و فەرمووی بخوێنە ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی من خوێندەوار نیم ، بۆ جاری چوارەم جوبرائیل باوشی لێدا و فەرمووی ﴿ اقرَأ بِاسمِ رَبّكَ الَّذي خَلَقَ – خَلَقَ الإنسانَ مِن عَلَقٍ – اقرَأ وَرَبُّكَ الأَكرَمُ – الَّذي عَلَّمَ بِالقَلَمِ – عَلَّمَ الإنسانَ ما لَم يَعلَم ﴾ [214]واتە : بخوێنە بە ناوی پەروەردگارتەوە کە هەموو شتێکی دروست کردووە. – مرۆڤی دروست کردوە لە خوێنێکی بەستوو. – بخوێنە،پەروەردگاری تۆ(لە هەموو کەس )بەخشدەترە - ئەوەی کە(مرۆڤ) فێر(ی نووسین) کردووە بەقەڵەم. – مرۆڤی شارەزا کردووە بەو شتانەی کە نەی دەزانی.›[215]

پێغەمبەر ﷺ کاتێک یەکەم جار سروشتی (وحی) بۆ دابەزی فەرمانی پێنەکرا کە بچێت ئاگاداری بەخەڵک بدات کە کراوە بە پێغەمبەر ، بەڵکو تەنها سروشتی بۆ نێدرابوو وەک ئاگاداری بۆ خۆی ،

جا لە دوای ماوەیێک کە وەحی بڕا لە دوای هاتنی جوبرائیل بۆ ئەشکەوتی ، ماوەیێک دوای ئەوە وەحی دابەزیەوە و کرا بە (رسول) بە المدثر ،›[216]

پێغەمبەر ﷺ لە مكة بوو ئەوکاتەی کە کرا بە پێغەمبەر و وەحی بۆ نێردار وە لەوێ داوای لێکرا کە یەکەم جار بانگەوازی قەومەکەی بکات بۆ بەتاک پەرستنی الله تعالی ، چونکە لە مكة خەڵکێکی زۆر شەریکیان بۆ الله تعالی بڕیار

[214] [ العلق: ١ – ٥ ]

[215] [ فتح الباري :٢٤/١]

[216] [رواه مسلم برقم : ٢١١٦ ].

دەدا و قوربان یان بۆ بتەکان سەر دەبڕی و داوای یارمەتی و شەفاعەتیان لە بەتەکان دەکرد ، کە سێ سەد و شێست بتیان دانبوو لە مكة لە چوار دەوری كعبة کە دەیان پەرست و کردبویانە شەریک و هاوبەش بۆ الله تعالى ،

جا الله تعالى یەکێکی لە ڕەگەز و خزم و ناسیاوی خۆیانی نارد بۆیان بە پێغەمبەر کە ڕاستگۆترین و دەست پاکترین کەسی ناویان بوو ، تا پێیان بڵێت الله تعالى بەتاک و تەنها بپەرستن و شەریک و هاوبەش بۆ الله تعالى بڕیار مەدەن بە هیچ شێوەیێک ، واز لەم بت و شیرکانە بێنن کە کردوتانەتە شەریک و هاوبەش بۆ الله تعالى ،

طاریقی کوڕی عبدالله ی محاربی فەرموویەتی ﴿ رأيْتُ رسولَ اللهِ صلَّى اللهُ عليْهِ وسلَّمَ مرتيْنِ مرةً بسوقِ ذي المجازِ وهو يُنادي بأعلى صوتِهِ يا أيُّها الناسُ قولوا لا إلهَ إلَّا اللهُ تُفلحوا ﴾[217]واتە : دوو جار پێغەمبەرم بینی ﷺ جارێکیان بەدەنگی بەرز لە بازاری مجاز لە (مكة) دەیفەرموو : ئەی خەڵکینە بڵێن هیچ پەرستراوێک نیە شایەنی پەرستن بێت بەحق تەنها الله تعالى نەبێت ،تا سەر فراز ببن.›

جا پێغەمبەر ﷺ ماوەی دەساڵ بانگەوازی خەڵکی دەکرد بۆ دوور کەوتنەوە لە شیرک بڕیاردان بۆ الله تعالى ،

[٦٣]الله تعالى (پێغەمبەری) نارد بە ئاگاداری کردنەوەی (خەڵکی) لە شیرک ، وە ناردی بە بانگەوازی کردنی خەڵک بۆ بەتاک ڕاگرتنی الله تعالى ،

۞ ڕوونکردنەوە ۞

[217] [ المحلى ٩/١١٢ ]

جا الله تعالی کاتێک پێغەمبەر ﷺ ی نارد بۆیان بەوە ناردی کە ئاگاردیان بکاتەوە لە شەریک بڕیاردان بۆ الله تعالی و بەڵگەیان نیشان بدات وە بانگەشەیان بکات بۆ ئەوەی الله تعالی بە تاک و تەنها بەپەرستن و دور بکەونەوە لە شیرکەکانیان و وازیان لێ بێنن ،

سەرەتای بانگەوازی پێغەمبەر ﷺ لە مکة بوو الله تعالی داوای لێکرد کە ئاگاداری قەومەکەی خۆی بکات لە کار و شیرکەکانیان وە خۆی بری بکات لە و شیرک و بت پەترستیە ،

الله تعالی فەرموویەتی ﴿ فَلا تَدعُ مَعَ اللَّهِ إِلهًا آخَرَ فَتَكونَ مِنَ المُعَذَّبينَ – وَأَنذِر عَشيرَتَكَ الأَقرَبينَ – وَاخفِض جَناحَكَ لِمَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ المُؤمِنينَ – فَإِن عَصَوكَ فَقُل إِنّي بَريءٌ مِمّا تَعمَلونَ ﴾ [218] واتە : لەگەڵ الله تعالی هانا و هاوار بۆ بەناو خوایەکی تر مەبە، چونکە بەهۆی ئەوەوە تۆش لە سزا دراوان دەبیت. – ئەی محمد ( ﷺ ) سەرەتا عەشرەت و تایەفە و کەس و کاری نزیکت بێدار بکەرەوە و بترسێنە. – باڵی بەزەیی و میهرەبانی خۆت نەوی بکە بۆ ئەو ئیماندارانەی کە شوێنت کەوتوون. – ئەگەر الله نەناسان یاخی بوون و سەرپێچیان کرد، ئەوە پێیان بڵێ: کە بەڕاستی من بەریم لە هەموو ئەو کارو کردەوانەی کە دەیکەن.،

الله تعالی داوای لە پێغەمبەر ﷺ کرد کە سەرەتا خۆی هەرگیز نەکات شەریک و هاوبەش بۆ الله تعالی دابنێت وەک چۆن موشریکەکان شەریک و هاوبەشیان بۆ الله تعالی دادەنا ،

[218] [الشعراء: ٢١٣ – ٢١٦ ]

پاشان الله تعالى فەرمانی پێکرد کە قەوم و خزم و کەس و کاری خۆی ئاگاداری ئەوە بکات کە نابێت شەریک و هاوبەش بۆ الله تعالى دابنرێت ، بەڵکو دەبێت بەتاک و تەنها بپەرسترێت ،

جاگەر ئیمانیان هێنا و وازیان لە شەریک بڕیاردان بۆ الله تعالى هێنا و کردەوەی چاکەیان کرد ئەوە نەرم و نیان و بەبەزی ببە لەگەڵیان ، وەگەر سەرپێچیتیان کرد و پشتیان لە بانگەوزایەکەت کرد ئەوە خۆت بەری بکە لەو شیرکانەی کە دەیەکەن بۆ الله تعالى ،

جا موشریکان خۆیان بە گەورە دەزانی و قسە و بوهتانیان پێدەکرد و بە شێت و ساحر ناویان دەبرد تا خەڵکی لێی دور بکەوێتەوە و بەقسەی نەکەن و واز لە شیرک نەهێنن و بەرەو تەوحید نەڕون ، الله تعالى فەرموویەتی ﴿ إِنَّهُم كانوا إِذا قيلَ لَهُم لا إِلهَ إِلَّا اللَّهُ يَستَكبِرونَ – وَيَقولونَ أَئِنّا لَتارِكو آلِهَتِنا لِشاعِرٍ مَجنونٍ – بَل جاءَ بِالحَقِّ وَصَدَّقَ المُرسَلينَ ﴾[219]واتە : بەڕاستی هەر کاتێ بەوانە ( موشریکان ) بوترایە هیچ پەرستراوێك نیە شایەنی پەرستن بێت بە حەق تەنها الله تعالى نەبێت ( ئەوە موشریکان ) خۆیان بە گەورە دەزانی (و ملکەچی نەدەبوو) ن. – وە ( موشریکان ) دەیان وت: ئایا ئێمە پەرستراوەکانمان واز لێ بێنین؟ لەبەر شاعیرێکی شێت. – ( الله تعالى فەرمووی )نەخێر وانی یە بەڵکو ئەو (پێغەمبەرە) هەقی هێناوەو باوەڕی بە پێغەمبەرانی پێشوو هەیە.›

وە الله تعالى فەرموویەتی ﴿ فَفِرّوا إِلَى اللَّهِ إِنّي لَكُم مِنهُ نَذيرٌ مُبينٌ – وَلا تَجعَلوا مَعَ اللَّهِ إِلهًا آخَرَ إِنّي لَكُم مِنهُ نَذيرٌ مُبينٌ – كَذلِكَ ما أَتَى الَّذينَ مِن قَبلِهِم مِن رَسولٍ إِلّا قالوا ساحِرٌ أَو مَجنونٌ ﴾[220]واتە : ئینجا بەپەلە بەرەو لای الله تعالى

[219] [ الصافات: ٣٥ – ٣٧ ]

[220] [ الذاريات: ٥٠ – ٥٢ ]

بڕۆن بەڕاستی من لەلایەن  الله تعالی وە ترسێنەرێکی ئاشکراو ڕوونم بۆ ئێوە. – وە لەگەڵ  الله تعالی دا پەرستراوی تر دامەنێن بەڕاستی من لەلایەن  الله تعالی وە ترسێنەرێکی ئاشکراو ڕوونم بۆ ئێوە. – بەم شێوەیە بۆ لای ئوممەتانی پێش ئەمان هیچ پێغەمبەرێك نەهاتووە مەگەر وتوویانە (بەو پێغەمبەرە) جادووگەر یان شێت.،

جا پێغەمبەر ﷺ بانگەشەی قەومەکەی دەکرد بۆ ئەوەی  الله تعالی بپەرستن و واز لە شەریک دانان بێنن بۆی ،

وە ئەوەش بریتیە لە تەوحید کە بەتاک ڕاگرتنی الله تعالی یە لە پەرستنەکان دا ، وە مانا و مەبەستی لااله الا الله  یە کە  الله تعالی هەموو پێغەمبەرانی بۆ ئەوە ناردوە . وەک  الله تعالی فەرموویەتی ﴿ وَما أَرسَلنا مِن قَبلِكَ مِن رَسولٍ إِلّا نوحي إِلَيهِ أَنَّهُ لا إِلهَ إِلّا أَنا فَاعبُدونِ ﴾ [221] واتە : وە ئێمە نەمان ناردووە پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێك مەگەر نیگامان بۆ ناردووە (بەوەی کە) بێگومان جگە لە من ( الله تعالی )هیچ پەرستراوێك نییە شایەنی پەرستن بێت بەحەق ، کەواتە تەنها من بپەرستن.،

وە فەرموویەتی ﴿ إِنَّني أَنَا اللَّهُ لا إِلهَ إِلّا أَنا فَاعبُدني وَأَقِمِ الصَّلاةَ لِذِكري ﴾[222] واتە : بەڕاستی هەر من خوام هیچ پەرستراوێکی ڕاست نی یە جگە لە من کەواتە من بپەرستە بە چاکی نوێژ بەجێ بێنە تامنت بێتەوە یاد.،

لێرە ئەوە تێدەگەین کە  الله تعالی لە کەسی قبوڵ ناکات کە  الله تعالی نە پەرستێ و شەریکی بۆ بڕیار نەدات ، وە لە کەسیشی قبوڵ ناکات کە  الله تعالی بپەرستی

---

[221] [ الأنبياء: ٢٥ ]

[222] [ طه: ١٤ ]

مـتـن

أَيْ: طَـهِّرْ أَعْمَالَكَ عَـنِ الشِّرْكِ. ( وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ ): الـرُّجْزَ: الأَصْنَامُ، وَهَجْرُهَا: تَرْكُهَا، وَالْبَرَاءَةُ مِنْهَا وَأَهْلُهَا،[64]أَخَذَ عَلَى هَذَا عَشْرَ سِنِيـنَ يَـدْعُو إِلَـى التَّوْحِيدِ،وَبَعْدَ الْعَشْرِ عُرِجَ بِهِ إِلَى السَّمَاءِ،وَفُرِضَتْ عَلَيْهِ الصَّلَوَاتُ الْخَمْسُ ،وصَـلَّى فِي مَـكَّةَ ثَـلاثَ سِنِينَ، وَبَعْـدَهَا أُمِرَ بِـالْهِجْرَةِ إِلَى الْمَدِينَةِ،[65] وَالْهِجْرَةُ الانْتِقَالُ مِنْ بَلَدِ الشِّرْكِ إِلَى بَلَدِ الإِسْـلامِ.وَالْهِـجْرَةُ فَرِيضَةٌ عَلَى

و شەریکی بۆ دابنێت ، بەڵکو الله تعالی ئەوە قبوڵ دەکات کە الله تعالی بپەرستێ و شەریکی هاوبەشی بۆ بڕیار نەدات ،

[٦٤]بەڵگەش وتەی الله تعالی یە کە فەرموویەتی : ئەی ئەو کەسەی کە خۆت پێچاوەتەوە. – هەستە (خەڵکی) بێدار کەرەوە. – وە پەروەردگارت بە گەورە بگرە. – وە پۆشاکت بە پاك ڕابگرە. – وە دەست لە گوناە هەڵ گرە. – وە شت مەبەخشە و بە زۆری بزانیت. – وە لەبەر پەروەردگارت خۆت ڕابگرە.›

مانای ( قُمْ فَأَنذِرْ ): ئاگاداری بکە لە شیرک ، وە بانگەوازی بکە بۆ تەوحید، ( وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ ) واتە : الله تعالی گەورە ڕابگرە بە تەوحید . ( وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ): واتە : کردەوەکانت پاك ڕابگرە لە شیرک ( وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ ): الرُّجْزَ: بریتیە لە بت ، وَهَجْرُهَا: یانی تەرکی بکە ، وە خۆت بەری بکە لە بت و ئەهلەکەی، ›

۞ **ڕوونکردنەوە** ۞

پێغەمبەر ﷺ یەکەم جار کە کرا بە پێغەمبەر بە سەرەتای سورة المدثر نێردرا کە شێخ یش (رحمه‌الله) هێناویەتی ،

ڕۆژێکان پێغەمبەر ﷺ بەڕێگا دا دەڕۆیشت گوێی لە سەوتێک بوو لە ئاسمانەوە سەری بەرزکردەوە و بینی ئەو مەلائیکەتە بوو کە هاتە لای لە (ئەشکەوتی) حراء ، دانشتبوو لەسەر کورسیێک لە نێوان زەوی و ئاسمان ، پێغەمبەر ﷺ

ترسا و گەڕایەوە ماڵەوە و فەرمووی دام پۆشن دام پۆشن ،›[223]جا لەو كاتەدا الله تعالى سەرەتای سورة ی المدثر ی دابەزاند و فەرمووی ﴿ يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ ﴾كاتیک پێغەمبەر ﷺ لەو بینینەی جوبرائیل ترسا و گەڕایەوە ماڵەوە و فەرمووی دام پۆشن دام پۆشن ، الله تعالى وەحی بۆ نارد و فەرمووی ئەی ئەو كەسەی كە خۆت داپۆشیوە جلەكانت بە خۆت داداوە ، ﴿ قُمْ فَأَنذِرْ ﴾ هەڵسە لە ناو جەلەكانت و خەڵكی ئاگادار بكەوە لە شەریک و بانگیان بكە بۆ بەتاک و تەنها پەرستنی الله تعالى ، كە ئەوەش موسڵمان بونە ، ﴿ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ ﴾ پەروەردگار و بەدی هێنەری خۆت بەگەورە و مەزن ڕابگرە بەوەی بەتاک و تەنها بیپەرستە و مەیهێنە قیاسی ئەو بتانە و بچوکی مەكەوە بەڵكو بەگەورە ڕای بگرە بەوەی تاک و تەنها بی بپەرستی و هیچ نەكەیتە شەریک و هاوتایی ئەو ، ﴿ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ﴾ وە كردەوەكانت پاک ڕابگرە و دروی بگرە لە شەریک بڕیار دان ،﴿ وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ ﴾ وە ئەو بت و پەیكەرانەی كە موشریكان كردویانە بەشەریک و هاوبەش بۆ الله تعالى ئەوە تۆ پشتیان تێ بكە و دور بكەوە لێیان وە دور بكەوە لە ئەهلەكەی بەوەی كە مەچوە لایان بۆ دانشتن ، بەڵكو تەنها بۆ بانگەوازی بچۆ بانگەوازیان بكە بۆ ئیسلام و ئیمان ،﴿ وَلاَ تَمْنُن تَسْتَكْثِرُ ﴾ وە منت مەكە بەوەی زۆرت بەخشیوە ، وە مەبەخشە بۆ ئەوەی زۆرترت پێ بدرێت لەوەی داوتە ، ﴿ وَلِرَبِّكَ فَاصْبِرْ ﴾ وە سەبر بگرە لەسەر تەوحید و بانگەوازی كردنی خەڵكی بۆ تەوحید وە سەر بگرە لەسە قسەو وڵامی موشریكەكان لە كاتی بانگەوازی كردن بۆ ئیسلام ،

الله تعالى پێغەمبەری ﷺ بەم چەند ئایەتە نارد سەرەتا كە چەندین سودی بۆ كەسی موسڵمان تێدایە كە بانگەوزەی دەكات ، وە لەسودەكانی بریتـــــــیە لە

[223] [ رواه البخاري برقم : ٤٩٢٥-٤٩٢٦ ، و رواه مسلم برقم : ٢١١٦ ]

یەکەم : لەسەر کەسی موسڵمانە کە بانگەشەی خەڵکی بکات بۆ دینی الله تعالی ،

دووەم : لەسەر کەسی موسڵمانە کە الله تعالی بەگەورە ڕاگرێت و هیچ شتێک بەگەورەتر نەزانێت لە پەروەدگاری ، وە کەس وەک ئەو سەیر نەکات ، چونکە شەریک ئەوەیە دوو شت بکەیتە هاوتای یەک ، جاگەر تۆ بتێک بکەی بە شەریکی اللهتعالی ئەوە وەک ئەوەیە بتەکەت بردبێتە پلە و پایەی الله تعالی یان الله تعالی ـت هێنابێتە پلە و پایەی بتەکە ، جابۆیە دەبیت الله تعالی بەگەورە ڕاگریت و کەس نەکەیتە شەریک و هاوتای ،

سێیەم : پێویستە لە بانگەوازی دا خەڵکی بانگ بکەی بۆ بەتاک ڕاگرتنی الله تعالی چونکە تەوحید گەورەتریت شتە کە لەسەر مروڤ پێویست کراوە ، وە هیچ کردەوییێک قبوڵ ناکرێت بەبێ تەوحید ، چونکە تەوحید بناغەی هەموو عیبادەتێکە ، ناکرێت کەسێک هێشتا نازانی تەوحید چیە تۆ بێی فێری نوێژ کردنی بکەی ، شتی وا ناکرێت چونکە نوێژەکەی قبوڵ نیە بەبێ تەوحید وە نوێژ لە دوای تەوحیدە ، بۆیە پێویستە لە بانگەوازی کردن یەکەم شت بانگەوازی بۆ تەوحید بکرێت ، جاگەر ئەویان قبوڵ کرد دواتر بانگەوازی بکرێن بۆ شتەکانی تر کە وەک نوێژ و ڕۆژو و زەکات ،

چوارەم : جا گەر بانگەوازی خەڵکت کرد بۆ تەوحید ئەوە پێویستە کە ئاگاداریان بکەیتەوە لە شیرک چونکە کەس نابێت بە خاوەنی تەوحید هەتا شیرک نەناسێت و خۆی لی دور نەگرێت ، بۆیە پێویستە کە بانگەوازی خەڵک بکەی بۆ تەوحید و وریا و ئاگاداریان بکەی لە شیرک و هەڵوەشێنەرەوەکانی تەوحید ،

پێنجەم : پێویستە لەسەر کەی موسڵمان کە دور بکەوێتەوە لە شیرک و ئەهلەکەی ، وە ئەمەش بەوەی کە وازیان لێبێنت و هاوڕێیەتی و هاتو چۆیان نەکات مەگەر بۆ بانگ کردنیان نەبێت بۆ تەوحید و ئیمان ، پێویستە کە خۆی بەری بکات لە کار و کردەوەکانیان کە سەرپێچی فەرمانی الله تعالی یە ،

شەشەم : مەرج نیە ئەوکەسەی بانگەوازی دەکات عالم بێت بەڵکو دەکرێت کەسێک بێت تەنها شیرک و کوفری خەڵکی دەزانێت و بەڵگەی لایە و شارەزایە لە تەوحید ، کەسێکی موسڵمان کە شارەزایی هەبێت لە تەوحید و شیرک ئەوە دەتوانێت و بۆی هەیە بانگەوازی خەڵکی بکات بۆ تەوحید و ئاگاداریان بکات لە شیرک گەرچی لە چەندین شتی تریش شارەزایی نەبێت ، چونکە پێغەمبەر ﷺ لەسەرەتایی بانگەوازیەکەی بانگی خەڵکی کرد بۆ تەوحید کەچی خۆ هێندەش ئایەت دا نەبەزیبوو تا ببێت بە عالم ، بەڵکو شارەزایی لێ هەبوو بۆیە فەرمانی پێکرا تا بانگەوازی بکات ،

حەوتەم : پێویستە کەسی موسڵمان سەبر بگرێت لە پێناو الله تعالی لەسەر ئەو کار و نارەحەتیانەی لە ڕێگای بانگەوازی دێتە ڕێگای و توشی دەبێت ، چونکە هەمیشە ئەهلی شیرک دژایەتی ئەهلی ئیمان و تەوحیدیان کردوە لەسەر بانگەوازیەکەیان وە گاڵتەیان پێکردون و بوهتانیان بۆیان کردوە و قسەی ناشریان پێیان وتوە ، جا بۆیە دەبێت سەبری هەبێت لەسەر کردەوەکانیان هەتا الله تعالی توانا و دەسەڵاتیان پێدەبەخشێت ،

هەشتەم : وە پێویستە لەسەر کەسی موسڵمان کەوا سەرەتا خۆی پاک بکاتەوە لە شیرک و خۆی دور بگرێت لە شیرک وە تەوحید لەخۆی بێنێتە دی پاشان بانگەوازی خەڵکی بکات بۆ تەوحید و دور کەوتنەوە لەشیرک ،

جا ئەمە پێغەمبەر ﷺ بەم شێوە فەرمانی پێکراوە بانگەوازی خەڵکی بکات ، کە پێویستە لەسەر کەسی موسڵمانیش کە شوێن پێغەمبەرەکەی ﷺ بکەوێت و چاوی لێبکات و کارەکانی دووبارە بکاتەوە ،

**[65]**لەسەر ئەمە بوو بۆ ماوەی دەساڵ بانگەوازی کرد بۆ تەوحید ، دوای ئەم دەساڵە بەرزکرایەوە بۆ ئاسمان ، وە پێنج نوێژەکەی لەسەر فەرز کرا ، وە لە مكة سێ ساڵ نوێژی کرد ، لە دوای ئەوە فەرمانی پێکرا بە کۆچکردن بۆ (شاری) مەدینە ،

## ❁ ڕونکردنەوە ❁

پێغەمبەر ﷺ دەساڵ بە شەو و ڕۆژ بانگەشەی موشریکانی کرد بۆ تەوحید جا هەندێک ئیمانیان پێی هێنا و موسڵمان بوون و وازیان لە شیرک هێنا ، وە هەندێکیان بێباوەڕ بوون و هەمیشە دژایەتی پێغەمبەریان دەکرد ﷺ وە چەندین جار هەوڵی کوژتنیان دا بەڵام الله تعالى پلان و فێڵەکانی پوچ کردنەوە ،

لە دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ دەساڵ بانگەشەی قەومەکەی کرد بۆ تەوحید ، الله تعالى بەرزی کردەوە بۆ ئاسمان تاوەکو چەندین شتی نیشان بدات و ئاگاداری بکاتەوە ، وە تا ببێت بۆ موعجزەیەک بۆ خەڵکی ،

الله تعالى فەرموویەتی ﴿ سُبحانَ الَّذي أَسرى بِعَبدِهِ لَيلًا مِنَ المَسجِدِ الحَرامِ إِلَى المَسجِدِ الأَقصَى الَّذي بارَكنا حَولَهُ لِنُرِيَهُ مِن آياتِنا إِنَّهُ هُوَ السَّميعُ البَصيرُ ﴾[224] واتە : پاك و بێگەردی بۆ ئەو زاتەی کە شەو ڕەوی کرد بە بەندەی خۆی لە شەوێکدا لە مزگەوتی بەڕێز و پیرۆزەوە (مەککە) بۆ مزگەوتی (الاقصى) لە (بيت

---

[224] [ الإسراء: ١ ]

المقدس) کە دەورو بەریمان پیرۆز و فەڕدار کردووە بۆ ئەوەی هێندێ لە بەڵگەو نیشانە ڕوونەکانی خۆمانی نیشان بدەین بەڕاستی هەر ئەو بیسەری بینایە.›

شەوێکیان پێغەمبەر ﷺ لەماڵێ ام هانئ بوو جوبرائیل (علیه السلام) هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وە سورایێکی پێ بوو ناوی بوڕاق بوو ، هات بۆ لای پێغەمبەر تا لە مکة ەوە بیبات بۆ قودس بۆ مزگەوتی ئەقصا ، جا کاتێک پێغەمبەری برد بۆ ئەوێ لەوێوە بەرزکرایەوە بۆ ئاسمانی یەکەم ، جا بەم شێوە ئاسمان بۆ ئاسمان بەرزکرایەوە تا ئاسمانی حەوتەم ، وە لە نێوان هەر دانەیێک توشی چەندین لە پێغەمبەران دەبوو و سەلامی لێیان دەکرد ، تا گەیشت بە ئاسمانی حەوتەم تا گەیشتە سدرة المنتهى ،

الله تعالى فەرموویەتی ﴿ أَفَتُمارونَهُ عَلى ما يَرى – وَلَقَد رَآهُ نَزلَةً أُخرى – عِندَ سِدرَةِ المُنتَهى – عِندَها جَنَّةُ المَأوى – إِذ يَغشَى السِّدرَةَ ما يَغشى – ما زاغَ البَصَرُ وَما طَغى – لَقَد رَأى مِن آياتِ رَبِّهِ الكُبرى ﴾[225] واتە : جا ئایا ( بێ باوەڕان ) ئێوە دەمەقاڵێ ی لەگەڵ دەکەن دەربارەی ئەوەی کە بەچاوی خۆی دەی بینێ. – سوێند بە الله بێگومان جارێکی تر جوبرەئیلی بینیوە. – لای درەختی سیدرەتو لمونتەها. – کە لای ئەوەوەیە بەهەشتی نیشتەجێ بوون. – کاتێ کە سیدرەی داپۆشی ئەوی کە داییپۆشی. – چاوی ئەو ( محمده ﷺ ) بەم لاولادا نەیدەنواڕی لە مەبەست تێ نەدەپەڕی. – سوێند الله بێگومان بینی گەورەترین بەڵگەو نیشانەی پەروەردگاری.›

لەو بەرز بونەوەیە بەرەو ئاسمان الله تعالى لە ئاسمان فەرمانی بە نوێژ کردن کرد و نوێژی لەسەر موسڵمانان فەرزکرد ، وە ئەوەیش پەنجا نوێژ بوو لە شەو و ڕۆژێکدا پاشان پێغەمبەر ﷺ لە گەڕانەوە بوو بۆ سەر زەوی لەئاسمان توشی

[225] [النجم: ١٢ – ١٨]

مـــتـــن

هَذِهِ الأَمَّـةِ مِنْ بَـلَدِ الشِّـرْكِ إِلَى بلـد الإِسْلامِ، وَهِيَ بَاقِيَةٌ إِلَى أَنْ تَقُومَ الـسَّاعَةُ، وَالـدَّلِيلُ قَـوْلُهُ تَعَالَى: ( إِنَّ الَّـذِينَ تَـوَفَّاهُمُ الْمَلآئِكَةُ ظَالِـمِي أَنْفُسِـهِمْ قَالُواْ فِيمَ كُـنتُمْ قَالُواْ كُـنَّا مُسْتَـضْعَفِينَ فِي الأَرْضِ قَالْوَاْ أَلَمْ تَكُـنْ أَرْضُ اللّهِ وَاسِعَةً فَتُـهَاجِرُواْ فِيهَا فَأُوْلَئِـكَ مَـأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَسَآءتْ مَصِيرًا-إِلاَّ الْمُـسْتَضْعَفِينَ مِنَ الـرِّجَالِ وَالنِّـسَآءِ وَالْوِلْـدَانِ لاَ يَسْـتَطِيعُونَ

پێغەمبەر موسی بوو (علیە السلام) لە ئاسمانی شەشم لەوێ پێغەمبەر موسی (علیە السلام) پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد کە چی لەسەر فەرزکراوە ، ئەویش پێی فەرموو کە هێندە نوێژی لەسەر فەرزکراوە لە شەو و ڕۆژێک ، پێغەمبەر موسی (علیە السلام)داوای لێکرد کە بچێتەوە لای الله تعالی و داوای لێبکات کە نوێژەکان کەم بکاتەوە و سوکی بکات لەسەری ، پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە بۆ لای الله تعالی ، بەم شێوە چەند جارێک پێغەمبەر موسی دەیگەڕاندەوە تا ئەوەی ژمارەی نوێژەکان کەم بویەوە تا بوو بە پێنج نوێژ لە شەو و ڕۆژێک دا ، پاشان الله تعالی فەرمووی ئەوە پێنج نوێژە بەڵام بە پەنجا نوێژ حسابە ،

پاشان پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە بۆ سەر زەوی و لە مزگەوتی ئەقصا پێش نوێژی بۆ هەندێک پێغەمبەر کرد ، پاشان گەڕایەوە بۆ مكة و حاڵ و سەفەرەکەی بۆیان گێڕایەوە ئەوکات موشریکان دەستیان کرد بە گاڵتە و کوفر کردن ، چونکە لایان سەیر بوو کە چۆن کەسێک لەشەوێک دەتوانێت بچێت بۆ قودس کە یەک مانگە ڕێگا دورە پاشان بچێت بۆ ئاسمانەکان و ئەوشتانەی کردبێت کە پێغەمبەر ﷺ کردویەتی ، وە خەریک بوو هەندێک لە موسڵمانە تازەکات هەڵگەڕێنەوە (هەندێکیان هەڵگەڕانەوە ) لەسەر سوڕماندا بێباوڕ ببنەوە ، بەڵام ابوبکر الصدیق بەڕاستی زانی ،

مــتــن

حِيلَةً وَلاَ يَهْتَدُونَ سَبِيلًا - فَأُوْلَئِكَ عَسَى اللّهُ أَن يَعْفُوَ عَنْهُمْ وَكَانَ اللّهُ عَفُوًّا غَفُورًا )[النساء: 97ـ99].[66]وَقَوْلُهُ تَعَالَى: ( يَا عِبَادِيَ الَّـذِينَ آمَنُوا إِنَّ أَرْضِي وَاسِعَةٌ فَإِيَّايَ فَاعْبُدُونِ )[العنكبوت: 56].قَالَ الْـبُغَوِيُّ ـ رَحِـمَهُ اللهُ ـ:نزلت هَذِهِ الآيَةُ فِي المُسْلِمِينَ الَّذِينَ بِمَكَّةَ ولَمْ يُهَـاجِرُوا، نَادَاهُمُ اللهُ بِاسْمِ الإِيمَـانِ.وَالـدَّلِيلُ علَى الْـهِجْرَةِ مِنَ السُّنَّـةِ:قَوْلُهُ ـ صَـلَّى اللهُ

ئەمە كورتەی باسەكەیە بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئیسرا و میعراج بگەڕێەوە بۆ كتابەكانی ژیان نامەی پێغەمبەر ﷺ ،

دوای چەند ساڵێكی تر كە موشریكان ویستیان پێغەمبەر ﷺ بكوژن جوبرائیل هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و هەواڵی پلانی قوریشی پێیان دا و داوای لێكرد كە كۆچ بكات بۆ مەدینە ،

**[٦٦]**وە كۆچكردن ڕۆشتنە لە شاری شیركەوە بۆ شاری ئیسلام ، كۆچ كردن لە وڵاتی شیركەوە بۆ وڵاتی ئیسلام فەرزە لە لەسەر ئەم ئومەتە ، وە كۆچ كردن بەردەوامە هەتا قیامەت هەڵدەستێت ، بەڵگەش وتەی الله تعالى یە كە فەرموویەتی : بەڕاستی ئەوانەی كە فریشتەكان گیانیان دەكێشن لە كاتێكدا كە ستەمیان لە خۆیان دەكرد(بە كۆچ نەكردنیان) بە تەشەرەوە پێیان دەڵێن(دەربارەی ئایینەكەتان) لە چیدا بوون ؟! دەڵێن ئێمە چەوساوە بووین لەسەر زەوی دا(پێیان) دەڵێن مەگەر زەویی الله تعالى فراوان نەبوو ؟. تا كۆچتان بكردایە تیایدا جا ئەوانە شوێنیان دۆزەخە ئای چ پاشە ڕۆژێكی خراپە. – بێجگە لەو چەوساوانەی كە لە پیاوان و ئافرەتان و لە منداڵانن كە توانای هیچ چارەیەكیان نی یە (لەبەر بێ هێزی و پیرییان) وە بە هیچ شێوازێك ڕێ دەرناكەن. – ئا ئەوانە الله تعالى لێ یان خۆش دەبێت وە الله تعالى هەمیشە چاوپۆشیكەر و لێ خۆشبووە.

۞ **ڕوونكردنەوە** ۞

کۆچ کردن بریتیە لە ڕۆشتن و جێهێنشتنی شار و وڵاتێک کە کوفر و دژایەتی دینی اللە تعالی تێدا دەکرێت ، بەرەو شارێک کە ئسلامەتی تێدایە و اللە تعالی و پێغەمبەرەکەی و دینەکەی سەر دەخسترێت تێیدا ،

دوای ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ نزیکی سێنزە ساڵ لە مكة و دەروی مكة بوو موشریکان هەوڵیاندا بیکوژن بەڵام اللە تعالی پلانەکەیانی پوچ کردەوە و فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی کرد کە کۆچ بکەن بۆ مەدینە ،چونکە لە مەدینە موسڵمانانی لێبوو و ئازاد بوون وە پێغەمبەریان ﷺ لە خۆ دەگرت ،

جا پێغەمبەر ﷺ موسڵمانی وردە وردە لە پێش خۆیەوە دەنارد و هیجرەتیان دەکرد تا ئەوکاتەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ابو بكر کاتیان دیاری کرد بۆ هیجرەت کردن و هیجرەتیان کرد وە امامی علی یان لە جێگای خەوتنەکەی پێغەمبەر ﷺ دانا تا ماڵ و سامانی موشریکان بداتەوە کە بە ئەمانەت لە لای پێغەمبەر ﷺ بوو ،

کۆچکردن چەندین جۆر و شێوەی هەیە لەوانیش

یەکەم : کۆچ کردن لە وڵاتی کوفرەوە بۆ وڵاتی ئیسلام ، کە ئەمەش مەبەستی شیخ ە (رحمەاللە)

دووەم : کوچ کردن لە شارێک کە خراپەی بە ئاشکرا تێدا بڵاوبۆتەوە و ڕێگری لێناکرێت، بۆ شارێک کە خراپەی تێدا ناکرێت ،

سێیەم : کۆچ کردن لە جێگایێک کە سەرپێچی اللە تعالی تێدا دەکرێت ، ئەمە جێگایکە بۆ نمونە وەک مەجلیسێک کە سەرپێچی اللە تعالی تێدادەکرێت وەک کوفر و شیرک و گوناهی گەورە ،

چوارەم: کۆچکردن لە حەڕامکراوەکان ، ئەمەیان مەبەست لێی دروکەوتنەوەیە لە حەڕام ،

پێنجەم: کۆچکردن لە کەسی تاوانکار و زاڵم ، بۆ نمونە کەسێکت هەڵە دەکات تۆش وازی لێدێنی تا خۆی چاک دەکات ،

بەڵام ئەوەی شێخ رحمە اللّٰە بریتیە لەوەی یەکەم کە کۆچکردنە لە وڵاتێک یان شارێک کە وڵاتی کوفرە و کوفر زاڵ بوە بەسەری دا ، پێویستە لەو وڵاتە کۆچ بکرێت بەرەو وڵاتی ئیسلام و ئیمان ،

وە کۆچ کردن بەردەوام دەبێت هەتا قیامەت دێت ، هەمیشە کەسانێک هەیە کە کۆچ بکەن ،

وە کۆچکردن یەکێکە لە گەورەترین عیبادەتەکان و پاداشتێکی زۆری هەیە بۆ خاوەنەکەی وەک اللّٰە تعالی فەرموویەتی ﴿ الَّذينَ آمَنوا وَهاجَروا وَجاهَدوا في سَبيلِ اللَّهِ بِأَموالِهِم وَأَنفُسِهِم أَعظَمُ دَرَجَةً عِندَ اللَّهِ وَأُولئِكَ هُمُ الفائِزونَ ﴾ [226] واتە : ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و کۆچیان کردووە و جیهادو هەوڵ و کۆششیان ئەنجامداوە لە پێناوی ڕێبازو ڕەزامەندیی خوادا بە ماڵیان و بەگیانیان، پلەپایەو پاداشتیان لای خوا بێ سنوور و گەورەترە، ئا ئەوانەش کە باسکران هەر ئەوانە سەرفرازو بەختەوەرن.›

ئەمە پاداشتە بۆ ئەوانەی کە ئیمان دەهێنن و کۆچ دەکەن جیهاد و دەکەن بە ماڵ و نەفسیان ،

بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە کۆچکروون فەرزە لەسەر ئەم ئومەتە لەوڵاتی شیرکەوە بۆ وڵاتی ئیسلام ، وتەی اللّٰە تعالی یە کە فەرموویەتی ﴿ إِنَّ الَّذِينَ

[226] [ التوبە: ٢٠ ]

تَوَفَّاهُمُ الْمَلآئِكَةُ ظَالِمِي أَنْفُسِهِمْ قَالُواْ فِيمَ كُنتُمْ قَالُواْ كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الأَرْضِ ﴾ ئەم ئایتە باس لە کەسانێک دەکات کە کۆچ ناکەن و بەزەلیلی لە وڵاتی کافران نیشتەجێن ، الله تعالى باسیان دەکات بەوەی زوڵمیان لە نەفسی خۆیان کرد بەهۆی کۆچ نەکردنەوە ،

جا لەسەرە مەرگ دا کاتێک مەلائیکەتەکات چواردەوری دەگرن پێیان دەڵێن ئێوە لە چ حاڵێک و ژیانێک دابون لەناو چ حاڵێک دابوون ؟ ئەوانیش دەڵێن ئێمە بێدەسەڵات و لاوازی بوین لە زەوی دا ، جا مەلائیکەتەکات وەک ڕەخنەیێک پێیان دەڵێن ﴿ قَالْوَاْ أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللّهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُواْ فِيهَا ﴾ ئایە زەوی الله تعالى فراون نەبووو تا کۆچ بکەن بۆ جێگاییێک کە بێ دەسڵات و لاواز نەبوونایە ،

پاشان الله تعالى لە سزای ئەوکەسانەی کە ناتوانن دینی خۆیان جی بەجێ بکەن و لە زەوی شیرکەوە کۆچ ناکەن بۆ زەوی ئیسلام فەرمووێت ﴿ فَأُوْلَئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَسَآءتْ مَصِيرًا ﴾ جا ئەو کەسانەی کە زەلیلن و بەبێ عوزی شەرعی کۆچ ناکەن و زەلیلن و ناتوانن دینی خۆیان جێ بەجێ بکەن ، ئەوە جێگایان دۆزەخە کە بەڕاستی چارەنوس و جێگایکی ناخۆش و خراپە ،

پاشان دوای ئەوە الله تعالى کەسانێک جیادەکاتەوە لەو کەسانەی پێشو کە کۆچیان نەکردبوو بۆ وڵاتی ئیسلام بەبێ عوزری شەرعی ، کە دەفەرموێت ﴿ إِلاَّ الْمُسْتَضْعَفِينَ ﴾ سەرەتا الله تعالى لە ئایەتی پێشو باسی کەسانێکی لاوازی کرد کە کۆچیان نەکردبوو بەبێ هەبوونی عوزری شەرعی ، بەڵام لەم ئایەتە باسی کەسانێکی لاواز دەکات کە کۆچیان نەکردبوو وە لەگەڵ ئەوەشد عوزیان هەیە کە ئەوانیش ﴿ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَآءِ وَالْوِلْدَانِ ﴾ الله تعالى لێرە باسی سێ جۆر کەس دەکات ئەوانیش

یەکەم : پیاوان ، جا گەر خێزاندار بێت یان بێ خێزان جاگەر پیر بێت یان گەنج بێت ،

دووەم : ئافرەتان ، جا گەر هاوسەر داربێت یان بێ هاوسەر جاگەر پیر بێت یان گەنج بێت ،

سێیەم : منداڵ

وە هەر ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کۆچ کردن لەسەر پیاوان و ئافرەتان و منداڵانە ، کە دەبێت کۆچ بکەن بۆ وڵاتی ئیسلام گەر لە توانیان دا هەبوو ،

پاشان الله تعالى فەرموویەتی ﴿ لاَ يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلاَ يَهْتَدُونَ سَبِيلًا ﴾ جا عوزرەکەیان دوو شتە کە ناتوانن کۆچ بکەن ، ئەوانیش

یەکەم توانایان نیە ، جا گەر لەوە بێت کە پیرن و بێ توانان ناتوانن بڕۆن ، یان هیچیان نەبێت پێی بڕون و ماڵ و سامانێکیان نەبیت پێی بڕۆن ،

دووەم : شارەزا نەبوونی ڕێگا ،

جا گەر کەسێک توانای هەبوو بەڵام شارەزایی ڕێگا نەبوو ئەوە عوزرەکەی قبوڵە ، وە یان کەسێک کە شارەزایی ڕێگایە بەڵام ناتوانێت کۆچ بکات چۆنکە هیچ توانایی لاشەیی و سامانی نیە ، ئەوەشیان هەر عوزری قبوڵە ، بەڵام ئەو کەسەی کە توانای هەیە و شارەزایی ڕێگایە کەچی کۆچ ناکات بەرەو وڵاتی ئیسلام لە کاتێک دا کە ناتوانێت دینەکەی خوی جێ بەجێ بکات ، ئەوە بەر ئەو سزایە دەکەوێت کە الله تعالى بۆی داناوە ،

وە ئەم سزایەش هەڕەشەیە نەک مانای ئەوەبێت کە کافر دەبێت و بە هەمشەیی لە ئاگر دەمێنێتەوە ،

متن

عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ـ : (لا تَنْقَطِعُ الْهِجْرَةُ حَتَّى تَنْقَطِعَ التَّوْبَةُ، وَلا تَنْقَطِعُ التَّوْبَةُ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا).[67]فَلَمَّا اسْتَقَرَّ فِي الْمَدِينَةِ أُمِرَ بِبَقِيَّةِ شَرَائِعِ الإِسْلامِ، مِثْلِ: الزَّكَاةِ، وَالصَّوْمِ، وَالْحَجِّ، وَالأَذَانِ، وَالْجِهَادِ، وَالأَمْرِ بِالْمَعْرُوفِ وَالنَّهْيِ عَنِ الْمُنْكَرِ، وَغَيْرِ ذَلِكَ مِنْ شَرَائِعِ الإِسْلامِ، أَخَذَ عَلَى هَذَا عَشْرَ سِنِينَ، وَتُوُفِّيَ ـ صَلواتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيْهِ ـ وَدِينُهُ بَاقٍ.[68]

بەڵام ئەوانەی عوزریان هەبوو ئەوە الله تعالى لە بارەیانەوە دەفەرموێت ﴿ فَأُوْلَئِكَ عَسَى اللَّهُ أَن يَعْفُوَ عَنْهُمْ وَكَانَ اللَّهُ عَفُوًّا غَفُورًا ﴾ ئەوکەسانەی عوزری قبوڵکراویان هەبوو کە کۆچیان نەکرد ، ئەوە دەکرێت الله تعالى لێیان خۆش بێت لەسەر ئەوەی کۆچ یان نەکردوە ،

[٦٧]وە الله تعالى فەرموویەتی : ( الله تعالى بەئیماندارانی بەگیرهاتوو لەناو کافراندا ڕادەگەیەنێت): ئەی بەندەکانم زەوی من فراوانە، موڵکی من بەربڵاوە (کۆچ بکەن، خۆتان ڕزگار بکەن)، تەنها هەر من بپەرستن.»

ئیمامی البغوي (رحمه‌الله) فەرموویەتی : ئەم ئایەتە دابەزی لەبارەی ئەو موسڵمانانەی کە لەمکة بوون و کۆچیان نەکردبوو ، الله تعالى بە ئیماندار بانگی کردن ،

وە بەڵگەش لەسونەت لەسەر هیجرەت ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : کۆچ کردن نابڕێ (کۆتایی پێنایە) هەتا تۆبە کردن نەبڕێ ( کۆتایی پێنایێت ) وە تۆبە کردنیش نابڕێت ( کۆتایی پێنایێت ) تا خۆر لە خۆر ئاوا وە هەڵنەیێت .»

۞ ڕوونکردنەوە ۞

بەڵگەی دووەم لەسەر کۆچکردن ئەوەیە کە الله تعالى فەرموویەتی ﴿ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ أَرْضِي وَاسِعَةٌ فَإِيَّايَ فَاعْبُدُونِ ﴾

جا شيخ رحمه‌الله وته‌ی ئیمامی البغوي هێناوه كه یه‌كێكه له موفه‌سیره گه‌وره‌كان ،

جا وته‌كه‌ی به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه ئه‌وكه‌سه‌ی كۆچ ناكات كافر نابێته‌وه به ئه‌نجام نه‌دانی،

جونكه الله تعالى به ئیماندار ناوی هێنان ، ئه‌وه‌ش به‌مانای ئه‌وه دێت كه گه‌رچی كۆچێش نه‌كه‌ن ئه‌وا هه‌ر موسڵمانن ،

وه به‌ڵگه‌ش له فه‌رمووده‌ی پێغه‌مبه‌ر ﷺ له‌سه‌ر هیجره‌ت ئه‌وه‌یه كه فه‌رموویه‌تی ﴿ لا تَنْقَطِعُ الْهِجْرَةُ حَتَّى تَنْقَطِعَ التَّوْبَةُ، وَلا تَنْقَطِعُ التَّوْبَةُ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا ﴾[227] واته : كۆچ كردن نابڕێ (كۆتایی پێنایه) هه‌تا تۆبه كردن نه‌بڕی ( كۆتایی پێنایێت ) وه تۆبه كردنیش نابڕێت ( كۆتایی پێنایێت ) تا خۆر له خۆر ئاوا وه هه‌ڵنه‌یێت .›

ئه‌م فه‌رمووده‌یه چه‌ند سودێكی تێدایه ، له‌وانه

یه‌كه‌م : به‌رده‌وام بوونی كۆچ كردن و مانه‌وه‌ی ، وه‌ک فه‌رمووی ﴿ لا تَنْقَطِعُ الْهِجْرَةُ ﴾ وه ئه‌مه‌ش وته‌كه‌ی شێخ (رحمه‌الله) به‌ڕاست ده‌خاته‌وه كه فه‌رمووی كۆچكردن ده‌مێنێت له‌سه‌ر ئه‌م ئوممه‌ته هه‌تا قیامه‌ت هه‌ڵده‌ستێ ،

دووه‌م : باسی چه‌ند نیشانه‌یكی ئاخیر زه‌مان و هه‌ڵسانی قیامه‌ت ده‌كات كه ئه‌وانیش

یه‌كه‌م : هه‌ڵهاتنی خۆر له خۆر ئاوا وه ، كه ئه‌مه‌ش یه‌كێكه له نیشانه هه‌ره گه‌وره و ئاشكراكانی ئاخیر زه‌مان ،

[227] [ حديث صحيح رواه ابو داود برقم : ٢٤٧٩ ]

دووەم : نەمانی تۆبە کردن ، هەر کاتێک کە خۆر لە خۆر ئاوا وە هەڵهات ئەوە تۆبە کردن لەسەر ئەهلی زەوی هەڵدەگیرێت و تۆبە کردن قبوڵ نیە ، جا ئەوەی لە پێشوو ئیماندار بوبێت ئەوە الله تعالی نیعمەتی پێ بەخشیوە ، وە ئەوەی لەو کاتە دا کافر بوبێت ئەوە هەر بەکافری دەمێنێتەوە و دەمرێت ، پەنا بە الله تعالی ،

جا بەهاتنە دی ئەم دوو نیشانەیە ئەوە نەمانی کۆچکردن دێت ، وە الله تعالی یش شارەزایە کە چی لە نێوان نەمانی توبە و کۆچکردنەوەیە ، چونکە فەرموودەکە بەڵگە نیە هیچ لە نێوانیان نەبێت بەڵام بێگومان بەڵگەیە کە کۆچکردن تەواو دەبێت و نامێنێت وە نەمانەکەشی نایێت تا تۆبە کردن هەڵنەگیرێت ، وە بۆیەش هەر دووکیان بەستراونەتەوە بە خور هەڵاتن لە خۆر ئاوەوە ، چونکە خۆر هەڵاتن شتێکە کە هەستی پێدەکرێت ، بەڵام کوچکردن و نەمانی توبە هەستی پێناکرێت ،

بۆیە کۆچکردن لەسەر موسڵمانان لەکاتێک دا ناتوانن دینی خۆیان جی بەجێ بکەن بە ئازادی ئەوە واجبە کە لەوڵاتی کوفر و شیرکەوە بڕون بەرەو وڵاتی ئیسلام ، گەر توانایان هەبوو و ڕێگیان دەزانێ ،

وە کۆچ کردن بەردەوامە و هەر دەمێنێت تا قیامەت هەڵدەستێ ،

[٦٨] جا کاتێک کە جێگیر بوو (لە شاری)مەدینە فەرمان کرا بە مانەوەی دروشمەکانی ئیسلام ، وەک زەکات دان و بەڕۆژو بوون و حەجکردن و بانگدان و جیهاد کردن و فەرمان کردن بە چاکە و ڕێگری کردن لە خراپە وە جگە لەوانەش لە دروشمەکانی ئیسلام ، (پێغەمبەر ﷺ) لەسەر ئەمە مایەوە بۆ ماوەی دەساڵ پاشان وەفاتی کرد ، وە دینەکەشی ماوە ،

## ❁ ڕوونکردنەوە ❁

دوای ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ لە کۆچ کردنەکەی تەواو بوو و گەیشتە شاری مەدینە ، لەوێ مایەوە و کۆچی نەکرد بۆ جێگا و شارێکی تر بەڵکو هەر لەوێ مایەوە دەوڵەتی ئیسلامی بونیات نا ،

جا کاتێک لە مەدینە جێگر بوو فەرمان نەکرا بەوەی کە واز لە چەند عیبادەت و دروشمێک بێنن کە لە مكة فەرمانیان پێکرا بوو ، بەڵکو فەرمانیان پێکرا کە هەر بەردەوام بن لەسەر ئەنجام دانی دروشمەکانی ئیسلام ، وەک نوێژ و زەکات دان و بەڕۆژو بوون هەموو عیبادەتەکانی تر ، وە جەگە لەوانەش کە گەورەترین شتە ئەویش بانگەوزای کردنی خەڵکی بوو بۆ تەوحید و ئیمان ،

جا کاتیک کە لە مدینە بوون هەر بەردەوام بوون لە بانگەوازی کردنی خەڵکی بۆ تەوحید و ئیمان چونکە لە مەدینە کەسانێک هەبوون کە بت پترستن بوون ، وە کەسانێکی تر هەبوون کە خاوەن کتاب بوون ، کە ئەوانیش بریتین لە جولەکە (یهودي) جا پێغەمبەر ﷺ هات بانگەوازی ئەوانی کرد بۆ تەوحید و ئیمان چونکە ئەوان شەریکیان بۆ الله تعالى بڕیار دەدا و دەست کاری ئەو کتێبەی کە بۆیان نێدرابوو کە (تەورات بوو) دەستکاریان کردبوو و گوڕیبویان بە هەواو هەوسی خۆیان ،

جا کاتێک کە پێغەمبەر ﷺ هات بۆ مەدینە دەستی کرد بە بانگەوازی کردنیان بەڵام ئەوان باوڕیان پێنەدەهێنا مەگەر دانە دانەیێکان نەبێت ،

چونکە دەیان وت ئەو لە نەوەکانی اسماعیل ە ، وە ئێمە لە نەوەکانی اسحاق ین ، وە جگە لەوەش بڕایان پێنەدەکرد لەبەر کوفر و عینادی خۆیان ،

جا پێغەمبەر ﷺ لە مكة خەریکی بانگەوازی کردنی قەومی خۆی بوو ، بەڵام کە هات بۆ مەدینە دەستی کرد بە بانگەوازی کەسانێک کە قەومی خۆی نین و خاوەنی ئەهلی کتاب ن ،

جا پێغەمبەر ﷺ کاتێک گەیشتە مەدینە دەوڵەتی ئیسلامی بونیات نا و خەڵکی لە دەور کۆبیەوە ئیمانی پێهێنا ، لەو ماوەیە دا چەندین جیهاد کرا دژی کافران و موشریکان ،

جا لەم نێوانە دا کەسی مونافیق دروست بوو کاتێک کە پێغەمبەر ﷺ گەیشتە مەدینە ئەوکات نیفاق دروست و کەسی مونافق پەیدا بوو ،

جا پێغەمبەر ﷺ دەساڵ لەسەر ئەم حاڵە مایەوە لە شاری مەدینە ، دوای ئەوە لە ساڵی دەی (١٠) کۆچی (هجري ) لە ڕوژی دوانزە لە مانگی ربیع الأول ( چەند وتەیێک هەیە لەسەر ئەوەی کە ئایە لە دوانزەی ربیع الأول بوە یان نا ، بەڵام گومان نیە کە لە مانگی ربیع الأول بوە بەڵام بۆ دیاری کردنی ڕۆژەکە قسەی لەسەرە ) پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد ﷺ ،

پێغەمبەر ﷺ کاتێک لە حەجی ماڵئاویی گەڕایەوە نەخۆش بوو و ئازارێکی توندی هەبوو و ئیزنی لە خێزانەکانی وەرگرت کە لەماڵی دایکمان عائیشە بێت ( الله تعالی لێی ڕازی بێت ) ، وردە وردە ئازارەکەی توند دەبوو ، بەو شێوە وەفاتی کرد لە ماڵی دایکمان عائیشە ، پاشان هاوڵان شوشتیان و لە جێگاکەی خۆی نێشتیان کە ماڵی دایکە عائیشە بوو ،

وە دینەکەی هەر ماوە و کۆتایی پێنەهاتوە بە مردنی خۆی ، چونکە لەسەردەمی خۆی کاتێک کە وەفاتی کرد ﷺ هەندێک لە عەڕەبە تازە موسڵمانەکان خەریک بو هەڵگەڕێنەوە لە دین ،

بەڵام دینی پێغەمبەر هەر ماوە و کۆتایی پێ نەهاتوە بە وەفاتی خۆی بەڵکوو هەر دەمێنێت هەتا قیامەت هەڵدەستی ،

لێرە چەند شتێک فێر دەبین ئەوانیش

یەکەم : پێغەمبەر ﷺ لە دوای کۆچ کردنی بۆ مەدینە کۆچی نەکردوە بۆ شوێنی تر بەڵکو لە مەدینە ماوەتەوە و دەوڵەتی ئیسلامی بونیان ناوە و هەر لە مەدینە وەفاتی کردوە و هەر لەوێ نێژراوە ،

دووەم : پێغەمبەر ﷺ هەر گیز وازی لە بانگەوازی کردن بۆ تەوحید نەهێناوە ، بەڵکو بەردەوام بوە لە بانگەوازی کردنی خەڵکی بۆ تەوحید ، جا لەمکة بانگەوزای قەومەکەی خۆی کرد و لە مەدینە بانگەوازی ئەهلی کتابی کرد ،

سێیەم : بانگەوازی پێغەمبەر ﷺ تەنہا بۆ قەومەکەی خۆی نەبوو بەڵکو بۆ هەموو خەڵکی سەر زەوی بوو بە گشتی ، وە هەر بۆیەش بانگی جولەکەی کرد بۆ تەوحید و ئیمان لە کاتێک دا لەقەومی خۆی نەبوون ،

چوارەم : پێغەمبەر ﷺ جیهادی کردوە دژی کافران و موشریکان ،

پێنجەم : مونافیق تەنہا لە مەدینە هەبوو و لەوێ سەری هەڵدا دوای کۆچ کردن بۆ مەدینە ،

شەشەم : پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کردوە و مردوە ، وە ئەمەش وڵامە بۆ سۆفی و دەروێشەکان کە دەڵێن پێغەمبەر ﷺ ئاگای لێمان و کار و حاڵمان دەزانێت ، ئەمە وڵامە بۆیان کە پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کردوە و مردوە ، وە ئاگایێ لە حاڵ و ژیانی ئێمە نیە ،

وە جگە لەمانەش سودی تری زۆری تێدایە ،

متن

وَهَذَا دِينُهُ، لا خَـيْرَ إلا دَلَّ الأُمَّةَ عَلَيْـهِ، وَلا شَرَّ إلا حَذَّرَهَا مِنْهُ، وَالْخَيْرُ الَّذِي دَلَّهَا عَلَيْهِ التَّوْحِيـدُ، وَجَمِيعُ مَا يُحِـبُّهُ اللهُ وَيَرْضَـاهُ، وَالشَّـرُ الَّذِي حَذَّرَهَا مِنْهُ الشِّرْكُ، وَجَمِيعُ مَا يَكْرَهُ اللهُ وَيَأْبَاهُ.[69]بَعَثَـهُ اللهُ إِلَى النَّاسِ كَافَّةً، وَافْتَرَضَ طَاعَتَهُ علَى جَمِيعِ الثَّقَلَيْنِ الْجِنِّ وَالإِنْسِ؛ وَالدَّلِيلُ قَوْلُهُ تَعَالَى: ( قُلْ يَـا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُـولُ اللّهِ إِلَيْـكُمْ جَمِـيعًا )[الأعراف: 158].[70]

[٦٩]ئەمە دینەکەیەتی کە هێچ خێرێک نیە ئیلا ئومەتەکەی لێ ئاگادار کردۆتەوە ، وە هیچ شەر و خراپەیێک نیە ئیلا ئومەتەکەی لێ ئاگادار کردۆتەوە ، وە ئەو خێرەی ئومەتەکەی لێ ئاگاردار کردۆتەوە بریتیە لە تەوحید ،وە هەموو ئەوەی الله تعالى پێی خۆشە و پێی ڕازییە ، وە ئەو شەڕەی ئومەتەکەی لێ ئاگادار کردۆتەوە بریتیە لە شیرک ، وە هەموو ئەوەی الله تعالى پێی ناخۆشە و نایەوێت ،

## ❁ ڕوونکردنەوە ❁

ئەمە دینەکەیەتی کە ئیسلامە ، کە دینی قبوڵ کراوە لەلایان الله تعالى ەوە ، الله تعالى فەرموویەتی ﴿ إِنَّ الدّينَ عِندَ اللَّهِ الإِسلامُ ﴾[228]واتە : بەڕاستی دین و ئاینی پەسەند لای الله تعالى تەنها ئاینی ئیسلامە،،

وە الله تعالى جگە لە ئیسلام قبوڵ ناکات لە هەر کەسێک بێت ، وە ئەوەی شوێن غەیری ئیسلام بکەوێت لە ڕێگا و ڕێبازەکان ئەوە لێی قبوڵ ناکرێت و لە قیامەت خەسارەت مەندو و زیان لێ کەوتو دەبێت ، وەک الله تعالى فەرموویەتی ﴿ وَمَن يَبتَغِ غَيرَ الإِسلامِ دينًا فَلَن يُقبَلَ مِنهُ وَهُوَ فِي الآخِرَةِ مِنَ الخاسِرينَ ﴾ [229]

[228] [ آل عمران: ١٩ ]

[229] [ آل عمران: ٨٥ ]

واتە : هەر کەسێک دوای دینێک بکەوێت جگە دینی ئیسلام ئەوە لێ ی وەر ناگیرێ وە ئەو لە ڕۆژی دوایی دا لە زەرەرمەندانە.›

ئەمە دینی پێغەمبەر محمدە ﷺ کە هەرچی خێرە هەیە بە ئومەتەکەی وتوە تاوەک و ئەنجامی بدەن ،

وە هەرچی شەڕ هەیە ئومەتەکەی لێ ئاگادار کردۆتەوە تەوەکو دور بکەونەوە لێی ،

وە گەورەترین خێر بریتیە لە تەوحید ، وە هەر بۆیەش شیخ رحمە اللّٰە بەتەنها باسی کردوە چونکە گەورەترین و خێر و چاکەیە کە پێغەمبەر ﷺ بە ئومەتەکەف ڕاگەیاندوە ، وە ئیسلام ی هیچ کەس تەواو نابێت هەتا نەبێت بە خاوەنی تەوحید ،

وە گەورترین شەڕ بریتیە لە شیرک ، وە هەر بۆیەش شیخ رحمەاللّٰە بەتەنها باسی کردوە چونکە خراپترین و شەڕترین شتە کە هەرکەسێک ئەنجامی بدات ( مەبەست لە شیرکی گەورەیە ) ئەوە ئیسلامەتیەکەی هەڵدەوشێتەوە و لێی قبوڵ ناکرێت ،

ئیمامی ابن تیمیة (رحمەاللّٰە) فەرموویەتی ﴿ ولا شيء أحب إلى الله من التوحيد ، ولا شيء أبغض إليه من الشرك ﴾ [230] واتە : هیچ شتێک نیە خۆشەویستربێت لەلای اللّٰە تعالى بە هێندەی تەوحید ، وە هیچ شتێک نیە (اللّٰە تعالى) زیاتر ڕقی لێی بێت بەهێندەی ئەوەی ڕقی لە شیرکە ،

وە جگە لە تەوحید خێری تر هەیە وە پێناسەی خێر بریتیە لەوەی کە اللّٰە تعالى پێی خۆشە و پێی ڕازیە ،

[230] [ استقامة : ٣٦٤ ]

وە جگە لە شیرکیش شەڕی تر زۆرە ، وە پێناسەی شەر بریتیە لە وەی کە الله تعالی پێی ناخۆشە و ڕازی نیە پێی و نایەوێت ،

وە ئەمە وڵامێکە بۆ ئەهلی بیدعە و گومڕایی کە شت لە دین دا دەهێنن کە الله تعالی و پێغەمبەرەکەی ﷺ فەرمانیان پێنەکردوە ، بەڵام ئەهلی بیدعە و گومڕایی بە خێر و چاکە باسی دەکەن لە کاتێک دا هەرچی خێر کە هەیە لە ئیسلام باسکراوە تەنها بیدعەکەی ئەوان باس نەکراوە ، ئەمەش بەڵگەیە کە ئەوەی ئەوان دەیکەن خێر نیە ، چونکە هەرچی خێر هەیە ئەوە پێغەمبەر ﷺ بە ئومەتەکەی ڕاگەیاندوە ،

[٧٠]الله تعالی ناردی بۆ هەموو خەڵکی ، وە گوێڕایەڵی بوونی (پێغەمبەر ﷺی) فەرز کرد لەسەر هەموو جنۆکەکان و مرۆڤەکان ، بەڵگەش وتەی الله تعالی یە کە فەرموویەتی : (ئەی محمد( ﷺ ) بڵێ: ئەی خەڵکینە بەڕاستی من پێغەمبەرو فرستادەی الله م بۆ ئێوە بەگشتی.)

### ❁ ڕوونکردنەوە ❁

الله تعالی پێغەمبەرەکەی بۆ هەموو خەڵکی ناردوە بە گشتی ، وە کردویەتیە ڕەحمەت بۆ هەموو جیهانیان ، وەک فەرموویەتی ﴿ وَما أَرسَلناكَ إِلّا رَحمَةً لِلعالَمينَ ﴾[231]واتە : وە (ئەی محمد ( ﷺ )) تۆمان تەنها بۆ ئەوە ناردووە کە ڕەحمەت بیت بۆ جیهانیان.)

الله تعالی فەرمان بە پێغەمبەرەکەی دەکات کە بە هەموو خەڵکی بڵێت من نێرداروی الله تعالی م بۆ ئێوە بە گشتی ، جا لەم ئایەتە بە سێ شت دیارە کە پێغەمبەر ﷺ بۆ هەموو خەڵکی سەر زەوییە بە گشتی ،

[231] [الأنبياء: ١٠٧]

یەكەم : ئەو بەشەی ﴿ قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ ﴾ ئەمە ڕووكردنە هەموو خەڵكی سەر زەوی وە قسەكردنە لەگەڵ هەموو خەڵكی سەر زەوی جا گەر كەسەكە كافر بێت یان موسڵمان ، ڕەش پێست بێت یان سپی پێست ئەوە ئەم بانگەوازی كردنە دەی گرێتەوە مادام پێی دەوترێت مرۆڤ (انسان) ،

دووەم : ئەو بەشەی ﴿ إِلَيْكُمْ ﴾ وە بە هەمان شێوە ئەمەش هەر بۆ كۆ بەكار دێت كە هەموو خەڵكە ،

سێیەم : ئەو بەشەی ﴿ جَمِيعًا ﴾ وە ئەمەش هەر دڵنیابوون (تەئكید) لەسەر ئەوە دەكاتەوە كە بۆ خەڵكییە بە گشتی ،

وە الله تعالى فەرموویەتی ﴿ وَما أَرسَلناكَ إِلّا رَحمَةً لِلعالَمينَ ﴾[232] واتە : وە (ئەی محمد ( ﷺ )) تۆمان تەنها بۆ ئەوە ناردووە كە ڕەحمەت بیت بۆ جیهانیان.،

ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە پێغەمبەر جگە لەوەی بۆ مرۆڤ كراوە بە پێغەمبەر و بۆیان نێردراوە بەڵكو بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە بۆ غەیری مرۆڤیش نێردراوە كە جنۆكەیە ، وە ئەمەش مەبەستی شێخە كە دەفەرموێت الله تعالى گوێڕایەڵ بوونی پێغەمبەر فەرزكردوە لەسەر كومەڵەی مرۆڤ و جن ،

وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی بۆ جنیش نێرداوە كە ئیمانی پێ بێنن ، وتەی الله تعالى یە كە فەرموویەتی ﴿ قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِنَ الْجِنِّ فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا – يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِۦوَلَنْ نُشْرِكَ بِرَبِّنَا أَحَدًا ﴾[233] واتە : ئەی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم) بڵێ: نیگام بۆ كرا كە بێگومان چەند كەسێك لە جنۆكە گوێیان گرت (لە قورئان خوێندنەوەم) ئینجا وتیان:

[232] [ الأنبياء: ١٠٧ ]

[233] [ الجن: ١-٢ ]

بەڕاستی ئێمە قورئانێکی سەر سوڕهێنەرمان بیست. – ڕێنموونیی دەکات بۆ ڕێ ی ڕاست ئێمەش باوەڕمان پێ کرد وە هەرگیز کەس ناکەین بە هاوبەشی پەروەردگارمان. ›

جا بۆ جنەکانیش هەیە کە ئیمان بە پێغەمبەر ﷺ بهێنن ، وەک چۆن ئیمانیان هێنا وە ئەمەش بەڵگەیە کە پێغەمبەر ﷺ بۆ غەیری مرۆڤیش نێرداوە ،

وە جگە لەوەش جنەکان ئیمانیان بە پێغەمبەرانی پێش محمد ﷺ هێناوە کە پێغەمبەر موسی یە ( علیه السلام ) وەک اللّٰه تعالی فەرموویەتی ﴿ قَالُوا يَا قَوْمَنَا إِنَّا سَمِعْنَا كِتَابًا أُنزِلَ مِن بَعْدِ مُوسَى مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِي إِلَى الْحَقِّ وَإِلَى طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ – يَا قَوْمَنَا أَجِيبُوا دَاعِيَ اللَّهِ وَآمِنُوا بِهِ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُجِرْكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴾ [234] واتە : ( جنەکان) وتیان ئەی هۆزو قەومەکەمان بەڕاستی ئێمە گوێ بیستی کتێبێك بووین کە لەپاش مووسا نێردراوەتە خوارەوە پەڕاوەکانی پێش خۆی بەڕاست دادەنێ (خەڵك) ڕێنموونی دەکات بۆ هەق بۆ ڕێبازی ڕاست. – ئەی قەومەکەمان وەڵامی بانگخوازی اللّٰه تعالی بدەنەوە و باوەڕی پێ بێنن ( اللّٰه تعالی ) لە تاوانەکانتان خۆش دەبێ و دەیسڕێتەوە وە لە سزای سەخت دەتان پارێزێ.›

لە جنەکان کەسیان تیابوو کە ئەوانیش بانگەوازی قەومەکەی خۆیان دەکرد بۆ موسڵمان بوون و باوڕ هێنان بە قورئان ، جا تێیان دا هەبوو کە موسڵمان

بوو وە تێیان دا هەبوو کافر بوو ، وەک اللّٰه تعالی فەرموویەتی ﴿ وَأَنَّا مِنَّا الْمُسلِمونَ وَمِنَّا القاسِطونَ فَمَن أَسلَمَ فَأُولئِكَ تَحَرَّوا رَشَدًا – وَأَمَّا القاسِطونَ فَكانوا لِجَهَنَّمَ حَطَبًا ﴾[235] واتە : بەڕاستی لەناو ئێمەدا کەسانی موســـولْمان و

[234] [ الأحقاف: ٣٠ ]

[235] [الجن: ١٤ – ١٥ ]

متن

وَكَمَّلَ اللهُ بِهِ الدِّينَ؛ وَالدَّلِيلُ قَوْلُهُ تَعَالَى: ( الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلامَ دِينًا )[المائدة: 3].[71] وَالدَّلِيلُ عَلَى مَوْتِهِ ـ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ـ قَوْلُهُ تَعَالَى: ( إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ - ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عِندَ رَبِّكُمْ تَخْتَصِمُونَ )[الزمر: 30، 31].[72].......................................................................................

خواناس هەیە، کەسانی بێ دین و خوانەناس و سەر کەشیش، جا ئەوەی موسوڵمان دەبێت دیارە کە ڕێبازی سەر فرازی دۆزیوەتەوە - بەڵام خوانەناس و سەر کەشەکان بەسەریانەوە ناچێت بەڵکو دەبنە سوتەمەنی دۆزەخ.›

وە وتیان ﴿ وَأَنَّا مِنَّا الصَّالِحونَ وَمِنّا دونَ ذلِكَ كُنّا طَرائِقَ قِدَدًا ﴾[236]واتە : وە بێگومان ئێمە هێندێکمان چاکین وە هێندێکمان لەوە نزمترین ئێمە جاران خاوەنی ڕێبازی زۆر بووین. ›

هەموو ئەوانە ڕونی دەکاتەوە کە دینی پێغەمبەر ﷺ جگە لەوەی کە بۆ هەموو خەڵکیە بە گشتی ، ئەوە بۆ جیهانی تریشە جگە لە مرۆڤ وەک جنۆکە ،

[٧١]وە دینەکەی پێ تەواو کرد ، بەڵگەش وتەی اللّٰه تعالی یە کەفەرموویەتی : ئەمڕۆ ئاین و بەرنامەکەتانم بەکۆتایی گەیاندو نازو نیعمەتی خۆمم بۆ تەواو کردن و ڕازیم بەوەی کە ئیسلام ببێتە بەرنامەو دین و ئاینتان.›

۞ **ڕوونکردنەوە** ۞

دینی ئیسلام دینی هەموو پێغەمبەرانە ، بەڵام اللّٰه تعالی تەواو کەر و کامڵ کردنی بەهۆی پێغەمبەر ﷺ کرد و ئەوی کردە هۆکار هەتا دینی ئیسلام تەواو بکات ، وەک اللّٰه تعالی فەرموویەتی ﴿ الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ

[236] [ الجن: ١١ ]

نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا ﴾[237] واتە : ئەمڕۆ ئاین و بەرنامەكەتانم بەكۆتایی گەیاندو نازو نیعمەتی خۆمم بۆ تەواو كردن و ڕازیم بەوەی كە ئیسلام ببێتە بەرنامەو دین و ئاینتان.›

پێغەمبەر ﷺ لە حەجی ماڵئاویی لە ڕۆژی جومعە (هەینی) لە عەرفة بوو ئەم ئایەتەی بەسەر دا دا بەزی ، الله تعالى فەرموویەتی ﴿ الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ ﴾ ئەمڕۆ دینەكەتانم بۆ تەواو كرد ، مەبەست لەوەیە كە دینی ئیسلام تەواو بوو لە هەموو بوارەكانیەوە ، ﴿ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي ﴾ ئیسلام گەورەترین نیعمەتە كە الله تعالى بەسەر بەندەكانی داوە و منەتی بەسەر دا كردوون ، جا ئەم نیعمەتەی الله تعالى تەواو بوو كەیانی ئیسلام تەواو بوو لە هەموو ڕویێكەوە ، ﴿ وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا ﴾ وە الله تعالى ڕازییە بەوەی ئیسلام دینمان بێت كە نیعمەتێكی تەواو و بێ كەم و كوڕییە ،

لەم ئایەتە دا چەند شتێك فێر دەبین ئەوانیش

یەكەم : دینی الله تعالى تەواو و بێ كەم و كوڕییە لە هەموو بورەكانیەوە جا گەر عقیدە بێت یان فقە یان حەددەكان ، یان لە ئەحكامی نوێژ و عیبادەتەكان یان لە حەڵاڵ و حەڕام ، لەهەموو بوارەكان تەواو و بێ كەم كوڕییە ،

وە ئەمە وڵامە بۆ ئەهلی بیدعە ( داهێنەر لە دین ) لە بواری عقیدە و لە بواری عیبادەت ، كە وا نیشان دەدەن و وا دەری دەخەن كە دین تەواو بێ كەم و كوڕی نیە بەڵكو ئەوەی ئەوان دای دەهێنن ئەوە ئەویش دینە ، جا ئەم ئایەتە وڵامە بۆ ئەوان ،

[237] [ المائدة: ٣ ]

دووەم : دینی ئیسلام یەکێکە لە گەورترین نیعمەتەکان کە الله تعالی دەیدات بە هەر بەندەیێک کە خۆی دەیەوێت ، جا پێویستە لەسەر کەسی موسڵمان کە سوپاسی الله تعالی بکات لەسەر ئەو نیعمەتەی تا الله تعالی لێی نەسەنێتەوە و هیدایەتی زیاتری بدات بۆ ئیسلام ،

سێیەم : ئیسلام ئەو دینەیە کە الله تعالی پێی ڕازییە و بەغیری ئەو ڕازی نیە ، وە لەهیچ کەسێک قبوڵ ناکات کە دین و ڕێبازێکی هەبێت لە غەیری ئیسلام ، بەڵکو دەبێت شوێن ئیسلام بکەوێت و ملکەچ بێت گەرنا لە قیامەت لە خەسارەت مەندان دەبێت ، جا هەرچی ڕێگا و ڕێبازێک هەیە لە غەیری ئیسلام ئەوە خەسارەت و زیانە بۆ خاوەنەکەی ، چونکە ئەوەی بە ئیسلامەوە نەگەڕێتەوە قیامەت ئەوە بەکافر حسابە و دەچێتە دۆزەخەوە هەرگیز تێیدا دەر ناهێندرێت ،

[٧٢]وە بەلگەش لەسەر مردنی ( پێغەمبەر ﷺ ) وتەی الله تعالی یە کە فەرموویەتی : ئەی ( محمد ﷺ ) بەڕاستی تۆ دەمری و ئەوانیش دەمرن. — لە پاشان بێگومان ئێوە لە ڕۆژی دوایی دا لای پەروەردگارتان داوا چی دەبن دژی یەکتری.›

❁ **ڕوونکردنەوە** ❁

پێغەمبەر ﷺ لە دوای ئەوەی کە لە مكة لە حەجی ماڵئاوایی گەڕایەوە بۆ شاری مەدینە لەوێ نەخۆشیێکی توند دای گرت و تەندروست نەبوو ، و ئیزنی لە خێزانەکانی وەرگرت کە لەلای عائیشە بمێنێتەوە ، وە هەر لەوێ مایەوە و لەوێ وەفاتی کرد و لەوێ نێژرا ،

مـتــن

وَالنَّاسُ إِذَا مَاتُـواْ يُبْعَثُونَ؛ وَالدَّلِيلُ قَوْلُهُ تَعَالَى: ( مِنْهَا خَلَقْنَاكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِـنْهَا نُخْـرِجُكُمْ تَارَةً أُخْـرَى )[طه: 55]. وقَـوْلُهُ تَـعَالَى: ( وَاللَّهُ أَنـبَتَكُم مِّنَ الأَرْضِ نَـبَاتًا - ثُـمَّ يُعِيـدُكُمْ فِـيهَا وَيُخْـرِجُكُمْ إِخْرَاجًا )[نوح: 17، 18].[73] وَبَعْدَ الْبَعْثِ مُحَاسَبُونَ وَمَـجْزِيُّونَ بِأَعْمَالِهِمْ، وَالدَّلِيلُ قَوْلُهُ تَعَالَى: ( وَلِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ لِيَجْزِيَ الَّذِينَ أَسَاؤُوا بِمَا

شیخ رحمه الله بەڵگەی هێناوە لەسەر مردنی پێغەمبەر ﷺ کە ئەویش وەک هەر یەکێکی تر لە مروڤەکان ماوەیێکی کەم دەژێت و پاشان دەمرێت ، پاشان زیندوو دەکرێتەوە ،

الله تعالی فەرموویەتی ﴿ إِنَّكَ مَيِّتٌ ﴾ ئەمە مەبەست لە پێغەمبەرە ﷺ کە الله تعالی پێی دەفەرموێت تۆ دەمریت ، ﴿ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ﴾ وە هاوڵەکانی و هەموو خەڵکی تریش هەر دەمرن ، ﴿ ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ﴾ جا کە مردن و زیندوو بونەوە لە ڕۆژی قیامەت ﴿ عِندَ رَبِّكُمْ تَخْتَصِمُونَ ﴾ پاشان کە زیندوو بونەوە حەشر و حساب هات لەوێ خەڵکی یەخەی ئەوی تر دەگرێت و داوای حەق و مافەکانی خۆی لێدەکات ،

[٧٣]وە خەڵکی کاتێک مردن زیندوو دەکرێنەوە ، بەڵگەش وتەی الله تعالی یە کەفەرموویەتی : هەر الله تعالی خۆی ئێوەی لە خاکی زەوی بەدیهێناوەو پێی گەیاندوون. – پاشان دەتانمرێنێت و دەتانخاتەوە ناوی هەر کاتیش بیەوێت دەرتان دەهێنێتەوە› وە فەرموویەتی : لەم زەویە دروستمان کردون دووبارە دەتانگێڕینەوە ناو زەوی (بە مردوویی) جارێکی تر لەو زەوی یە دەرتان دێنینەوە بە زیندوویی بۆ لێپرسینەوە. ›

۞ ڕوونکردنەوە ۞

لەپایەکانی ئیمان هێنان بە ڕۆژی دوایی  باسی زیندوو بوونەوەمان کرد بەڵام شێخ ( رحمه الله ) لێرە بە دیاری کراوی و بەتایبەت هێناویەتی و باسی کردوە ، وە ئەمەش لەگەورەیی باسەکەدایە ،

وە دەکرێت هۆکارەکەی ئەوەبێت کە موشکریانی پێشوو باوڕیان بە زۆر شت هەبوو وەک  الله تعالى و مەلائیکە و هەندێک لە پێغەمبەران ، بەڵام بێباوڕ بوون بە ڕۆژی دوایی و قەدەر ،

وە دەشکرێت لەبەر گرنیگی و گەوریی باسەکەبێت بۆیە شیخ باسی کردوە ، وە الله تعالى زاناترە بە مەبەستەکەی ،

کاتێک کە خەڵکی دەمرن و سەر زەوی کەسی زیندووی لەسەر نامێنێت ، ئەوکات الله تعالى بارانێک دەبارێنێت کە ئاوێکی دەست گرە (لنج ه) پاشان ئەو بارانە هەر دڵۆپێک و کەسی دیاری کراوی خۆی هەیە کە دادەبەزێتە سەرکەسەکە و دەکەوێتە سەر کلێنچک ی ( پاچە ئێسکێکە لە پشتەوەی مرۆڤ) کەسەکە پاشان کەسەکە سەر لەنوێ دووبارە دروست دەبێتەوە ،

الله تعالى فەرموویەتی ﴿ مِنْهَا خَلَقْنَاكُمْ ﴾ الله تعالى  ئێمەی لەم زەوەیە دروست کردوە کە لەسەری دەژین ، وە ئەمەش شتێکی زاندراوە لەلایان موسڵمانانەوە کە مەلائیکە لە نور دروست کراون و جنۆکە لە بڵێسەی ئاگر دروست کراوە و ئادامیزادیش لە قوڕ (خۆڵ) دروست کراوە ، جا الله تعالى دەفەرموێت ئـــــێمە ئێوەمان لەم (زەوییە) دروست کردوە ، پاشان دەفەرموێت ﴿ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ ﴾ وە دەتان گێرینەوە ناوی ، وە ئەمەش مەبەست پێی مردنە کە کاتێک مرۆڤ دەمرێت دەخرێتە ژێر زەوی ، وەگەر چی کەسەکە نەشی خەنە ناو قەبر یان بیسوتێنن یان لە ئاو دا بخنکێت یان پارچە پارچە بێت ئەوە هەر دەبێتەوە خۆڵ

متن

عَـمِلُوا وَيَجْـزِيَ الَّذِينَ أَحْسَـنُوا بِالْحُـسْنَى )[النـجم: 31].[74]وَمَـنْ كَذَّبَ بِالْبَعْـثِ كَفَرَ، وَالـدَّلِيلُ قَوْلُـهُ تَعَالَى: ( زَعَمَ الَّـذِينَ كَفَـرُوا أَن لَّن يُبْعَثُوا قُلْ بَلَى وَرَبِّي لَتُـبْعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَـا عَمِلْـتُمْ وَذَلِكَ عَلَـى اللَّهِ يَسِيرٌ ) [التغابن: 7].[75]وَأَرْسَـلَ اللهُ جَمِيـعَ الرُّسُلِ مُبَـشِّرِينَ وَمُنْذِرِينَ؛ وَالـدَّلِيلُ قَوْلُهُ تَعَالَى: ( رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ

، جگە لەوانەی کە لاشەیان پارێزراوە و زەوی نایان خوات و نابنەوە خۆڵ ، پاشان اللّٰہ تعالی فەرموویەتی ﴿ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَى ﴾ جا لەدوای ئەوەی کە مردین دووبارە اللّٰہ تعالی بۆ جارێکی تر دەرمان دە هێنێتەوە لە ناو ئەم زەوەیە بوینەتە خۆڵ ، وە ئەمەش بریتیە لە زیندوو بونەوەی مرۆڤ ، جا هەموو مرۆڤێک بەم سێ حاڵەتە تێ پەڕ دەبێت ،

یەکەم : دروست بوون لەخۆڵ

دووەم : مردن و گەڕانەوە بۆ ناو خۆڵ

سێیەم : زیندوو بوونەوە دەرهاتن لە خۆڵ بۆ جارێکی تر کە لە دوای ئەوە حەشر و حساب دەست پێدەکات و مردن نامێنێت ،

[٧٤]وە لە دوای زیندوو بونەوە لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکرێت و پاداشت دەدرێنەوە بەهۆی کردەوەکانیان بەڵگەش اللّٰہ تعالی فەرموویەتی : هەرچی لەئاسمانەکان و زەویدا هەیە هەر اللّٰہ خاوەنیەتی، (تاقیتان دەکاتەوە) بۆ ئەوەی تۆڵەبسێنێت لەوانەی کەخراپەیان کردووەبەگوێرەی کردەوەکانیان، پاداشتی ئەوانەش کەچاکەیان کردووەبەچاکترین شێوە بداتەوە.»

❁ **ڕوونکردنەوە** ❁

الله تعالى کاتێک کە مرۆڤەکان و جنەکان زیندوو دەکاتەوە ، پاداشتیان دەداتەوە لەسەر کردەوە چاکەکانیان وە سزایان دەدات لەسەر کردەوە خراپەکانیان ،

جا بەشی لێ پرسینەوە و پاداشت داناوە ، دوو ڕوو داون لە ڕووداوەکانی ڕۆژی قیامەت کە ڕوو دەدەن ، گەرنا جگە لەم دوو ڕوداوە شتی تریش هەیە کە لەو ڕۆژە ڕوو دەدات ، وەک حشر و صیرات و شفاعەت و دۆزەخ و کوثر و بەهەشت ،

الله تعالى دەفەرمووێت ﴿ لِيَجْزِيَ الَّذِينَ أَسَاؤُوا بِمَا عَمِلُوا ﴾ الله تعالى پاداشت دانەوەی تایبەت نەکردوە بە تەنها لە مرۆڤەکان بەڵکوو لەسەر هەموو ئەوانەی کردوە کە خراپە و چاکە دەکەن ، جا هەر کەسێک خارپەیێک بکات ئەوە لە ڕۆژی دوای سزای خراپەکەی وەردەگرێتەوە گەر الله تعالى لێی خۆش نەبێت ، بەڵام گەر الله تعالى لێی خۆش بێت ئەوە سزا نادرێت ، ﴿ وَيَجْزِيَ الَّذِينَ أَحْسَنُوا بِالْحُسْنَى ﴾ وە بەهەمان شێوەش الله تعالى پاداشتی ئەوکەسانەی کە خێر و چاکەیان کردوە ئەوە بە چاکە و خێر پاداشیتان دەداتەوە کە بەهەشتە ،

وە ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر لێ پرسینەوە چونکە پاداشت داناوە بەبێ لێپرسینەوە ڕوو نادات سەرەتا لێپرسنەوە دەکرێت لە گەڵیان جا ئەووەی خراپەی کردبێت سزا دەدرێت یان الله تعالى لێی خۆش دەبیت ، وە ئەووەی چاکەی کردبێت ئەوە پاداشتی دەدرێتەوە ، بەڵام لەم ئایەتە زیاتر باس لە پاداشت دانەوە دەکات ،

بەڵام بەڵگەی ڕون لەسەر لێپرسنەوە وتەی الله تعالی یە کەفەرمویەتی ﴿ إِنَّ إِلَيْنَا إِيَابَهُمْ – ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُم ﴾[238]واتە : بێگومان هەر بۆ لای ئێمەیە گەڕانەوەیان. – لە پاشان بەڕاستی لەسەر ئێمەیە لێ پرسینەوەیان.›

وە ئەمە بەڵگەی ڕونە لەسەر هەبوونی لێپرسینەوە لە ڕۆژی قیامەت.

**[٧٥]**وە هەر کەسێک زیندوو بوونەوە بە درۆ بزانێت ئەوە کوفری کردوە ، بەڵگەش وەتەی الله تعالی کەفەرموویەتی : .ئەوانەی بێ باوەڕ بوون بە بۆچوونی خۆیان وتیان: هەرگیز زیندوو ناکرێنەوە، پێیان بڵێ: وا نیە، سوێند بە پەروەردگارم، بەڕاستی هەر زیندوو دەکرێنەوە، پاشان ئاگادار دەکرێن لە هەموو ئەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامتان دەدا، ئەوەش بۆ خوا زۆر ئاسان و سادەیە.

❁ **ڕوونکردنەوە** ❁

وە هەر کەسیک زیندوو بوونەوە بە درۆ بزانێت ئەوە کەسێکی کافرە ،

سیفەتی بە درۆ زانینی زیندوو بوونەوە سیفەتی کافرانە ، وە لەم سەردەمەش زۆر زۆرن ، وەک مولحیدەکان و علمانی و شوعیەکان و غەیری ئەوانیش ،

الله تعالی فەرموویەتی ﴿ زَعَمَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَن لَّن يُبْعَثُوا ﴾ کافرەکان بانگەشەی ئەوەیان دەکرد و وا نیشانیان دەدا کە زیندوو نابنەوە لە دوای مردن ، الله تعالی بە پێغەمبەرەکەی دەفەرموێت کە پێیان بڵێت ﴿ قُلْ بَلَى وَرَبِّي لَتُبْعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلْتُمْ ﴾ موشریکان هەموویان دەیان زانی کە پێغەمبەر ﷺ درۆ ناکات و درۆزن نیە ، بەڵام لەسەر ئەوەشەوە الله تعالی بە پێغەمبەرەکەی دەفەرموێت کە بڵێت سوێند بە پەروەردگارم زیندوو دەبنەوە لە دوای مردن ، وە ئەمەش بۆ

[238] [ الغاشية: ٢٥-٢٦ ]

ئەوەی کە تەواو دڵینابن و گومانیان نەمێنێت لەوەی زیندوو دەبنەوە ، ﴿ وَذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ ﴾ وە دڵنیاش بن کە وانەزانن زیندوو کردنەوەی ئێوە قورسە لەسەر الله تعالى، نەخێر نا سوێند بە پەروەردگارم زۆر زۆر ئاسانە لەسەر الله تعالى کە زیندووتان بکاتەوە،

[٧٦]وە الله تعالى هەموو پێغەمبەرانی ناردوە کە موژدە دەر و ترسێنەر بونە ، بەڵگەش وتەی الله تعالى یە کە فەرموویەتی : پێغەمبەرانمان (ڕەوانە کردووە) کە مژدەدەرن و ترسێنەرن ، تا خەڵکی هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نەمێنێت دوای ئەوەی الله تعالى پێغەمبەرانی بۆ ڕەوانە کردوون،

۞ ڕوونکردنەوە ۞

الله تعالى هەموو پێغەمبەرێکی بە دوو شێوە ناردوە بۆ قەومەکەی ،

یەکەم : موژدەی پێداون بەوەی کە گەر بەقسەی بکەن و شوێنی بکەون ئەوە الله تعالىٰ لێیان خۆش دەبێت و ژیانیان خۆش دەکات و نیعمەتی خۆی بەسەریان دا دەبارێنێت ، وە لە قیامەتیش دەیان خاتە بەهەشتەوە ،

دووەم : ترساندویانیەتی بەوەی کە گەر هەر بەردەوام بن لەسەر بت پەرستی و شیرک و گوناھ و تاوان ئەوە الله تعالى سزایان دەدات لە دونیا و قیامەت ،

جا ئەم موژدە دانە لە نێوان کافر و ئیمانداره ، وە بە هەمان شێوەش پێغەمبەران موژدەی بەهەشت دەدەن بەوانەی کە ئیمان دێنن ، وە دەشیان ترسێنن بەوەی کە گەر سەرپێچی بکەن الله تعالى سزایان دەدات ، وە ئەمەش بۆ ڕێک خستنی حاڵی و تەوازونی ئیمانداره لەنێوان ئومێد و ترس ،

الله تعالی فەرموویەتی ﴿ وَلا تُفسِدوا فِي الأَرضِ بَعدَ إِصلاحِها وَادعوهُ خَوفًا وَطَمَعًا إِنَّ رَحمَتَ اللَّهِ قَريبٌ مِنَ المُحسِنينَ ﴾ [239] واتە : خراپەکاری مەکەن لەزەویدا پاش ئەوەی کە الله تعالی چاکی کردووە ، وە هاوار و نزا بەرن بۆ الله تعالی بەترس و ئومێدەوە بەڕاستی میهرەبانی الله تعالی لە چاکە کارانەوە نزیکە.›

وە فەرموویەتی ﴿ إِنَّمَا يُؤْمِنُ بِآيَاتِنَا الَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا بِهَا خَرُّوا سُجَّدًا وَسَبَّحُوا بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ۩ - تَتَجافى جُنوبُهُم عَنِ المَضاجِعِ يَدعونَ رَبَّهُم خَوفًا وَطَمَعًا وَمِمّا رَزَقناهُم يُنفِقونَ ﴾ [240] واتە : تەنها کەسانێ باوەڕ بە ئایەتەکانی ئێمە دێنن هەر کاتێ بەو(ئایەتانە) ئامۆژگاری بکرێن ئەکەون بە ڕوودا بە سوژدە بردنەوە و بە پاکی ستایشی پەروەردگاریان دەکەن و خۆیان بە گەورە دانانێن. – تەنشتیان دوور ئەکەوێتەوە لە جێگای خەوتنیان (لەخەو هەڵدەسن شەو نوێژ دەکەن) هاوارو نزا لە پەروەردگاریان دەکەن بەترس و هیواوە و لەو ڕۆزی و سامانەی پێمان داون دەبەخشن.›

موسڵمان پێویستە هەمیشە لەم حاڵەتە دابێت چونکە ئەوە حاڵی ئیمانداری ڕاستەقینەیە کە عیبادەت دەکات و ئومێدی بە الله تعالی هەیە کە عیبادەتەکەی لێ قبوڵ بکات و پاداشتی لەسەر بداتەوە ، وە ترسیشی هەیە کە لێی قبوڵ نەکرێت و ڕەت بکرێتەوە ،

جا ئەم ترسانە و ئومێد پێ بوونە سودی ئەوەی هەیە کە کەسی ئیماندار واز لە عیبادەت ناهێنی لەترسی سزای الله تعالی وە بەردەوام دەبێت بە ئومێدی ئەوەی الله تعالی بیخاتە بەهەشتەوە ،

---

[239] [ الأعراف: ٥٦ ]

[240] [ السجدة: ١٥-١٦ ]

جا پێغەمبەرانیش بەم شێوە بوونە كە موژەدیان داوە بە ئیماندارن ، الله تعالى فەرموویەتی ﴿ وَبَشِّرِ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ كُلَّمَا رُزِقُوا مِنْهَا مِن ثَمَرَةٍ رِّزْقًا قَالُوا هَذَا الَّذِي رُزِقْنَا مِن قَبْلُ وَأُتُوا بِهِ مُتَشَابِهًا وَلَهُمْ فِيهَا أَزْوَاجٌ مُّطَهَّرَةٌ وَهُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴾[241]واتە : ئەی محمد( ﷺ ) مژدە بدە بەوانەی كە باوەڕیان هێناوەو كردەوە باشەكانیان كردووە كە بێگومان بۆئەوان هەیە بەهەشتانێک كەجۆگە ئاوی زۆر بەژێریاندا دەڕوات هەركاتێ لەوێ خواردەمەنیەكیان بدرێتێ لە میوەهات دەڵێن: ئەمە ئەوەیە كەلەمەوپێش پێمان درا ئێستا وێنەیان هێناوە وەلەو بەهەشتانەدا بۆئەوان هەیە ژنانی پاكیزە وەئەوان لەو (بەهەشتانە) دا هەتا هەتایین.›

وە فەرموویەتی ﴿ وَلَنَبْلُوَنَّكُم بِشَيْءٍ مِّنَ الْخَوْفِ وَالْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ الْأَمْوَالِ وَالْأَنفُسِ وَالثَّمَرَاتِ وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ ﴾[242]واتە : سوێند بە الله تعالى تاقیتان دەكەینەوە بە هەندێک لەترس و برسێتی و كەم بوونی ماڵ و دارایی و خەڵكی(كەس وكارتان) و بەرووبووم جامژدە بدە بە خۆڕاگران.›

وە فەرموویەتی ﴿ وَبَشِّرِ الَّذِينَ آمَنُوا أَنَّ لَهُمْ قَدَمَ صِدْقٍ عِندَ رَبِّهِمْ ﴾[243]واتە : وە موژدە بدە بەوانەی باوەڕیان هێناوە كە بێگومان بۆیان هەیە پلەو پایەی بەرز لای پەروەردگاریان.›

وە هەروەها ترسێنەر بوونە بۆ كافران ترساندویانیەتی بە سزای الله تعالى ،

الله تعالى فەرموویەتی ﴿ وَأَنذِرِ النَّاسَ يَوْمَ يَأْتِيهِمُ الْعَذَابُ فَيَقُولُ الَّذِينَ ظَلَمُوا رَبَّنَا أَخِّرْنَا إِلَى أَجَلٍ قَرِيبٍ نُّجِبْ دَعْوَتَكَ وَنَتَّبِعِ الرُّسُلَ أَوَلَمْ تَكُونُوا أَقْسَمْتُم مِّن

---

[241] [ البقرة: ٢٥ ]

[242] [ البقرة : ١٥٥ ]

[243] [ يونس: ٢ ]

قَبْلُ مَا لَكُم مِّن زَوَالٍ ﴾[244] واتە : وە ئەی (محمد( ﷺ )) خەڵکی ئاگادار بکە و بترسێنە لەو ڕۆژەی کە سزایان بۆ دێت ئینجا ئەوانەی کە ستەمیان کردووە دەڵێن ئەی پەروەردگارمان بۆ ماوەیەکی کەم دوامان بخە تا وەڵامی بانگەوازەکەت بدەینەوە و شوێنی پێغەمبەران بکەوین ئەی ئێوە نەبوون پێشتر سوێندتان خوارد کە هەرگیز لەناو ناچن.»

وە فەرموویەتی ﴿ وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الْحَسْرَةِ إِذْ قُضِيَ الْأَمْرُ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ وَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾ [245] واتە : ئەی (محمد( ﷺ )) ئەو (ستەمکارانە) لە ڕۆژی داخ و خەفەت بترسێنە کاتێ کارو باری (خەڵکی) کۆتایی پێ دەهێنرێ لە کاتێکدا ئەوانە غافڵن و باوەڕیش ناهێنن (بە ڕۆژی دوای) ی.»

وە فەرموویەتی ﴿ إِنَّا أَنذَرْنَاكُمْ عَذَابًا قَرِيبًا يَوْمَ يَنظُرُ الْمَرْءُ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ وَيَقُولُ الْكَافِرُ يَا لَيْتَنِي كُنتُ تُرَابًا ﴾[246] واتە : بێگومان ئێمە ئێوەمان ئاگادار کرد لە سزایەکی نزیک لە ڕۆژێکی وادا کە مرۆڤ دەبینێ (پاداشی) ئەو کردەوانەی کەپێشەکی بەدەستی خۆی ناردوونی وە بێ بڕوا (لەو ڕۆژەدا) دەڵێ: کاشکای گڵ بوومایە نەک مرۆڤ.»

جا اللّٰه تعالی هەر پێغەمبەرێکی ناردبێت ئەوە ئیلا ترسێنەر بوە و موژدە دەر بوە ، اللّٰه تعالی فەرموویەتی ﴿ وَمَا نُرْسِلُ الْمُرْسَلِينَ إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ فَمَنْ آمَنَ وَأَصْلَحَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴾ [247] واتە : ئێمە پێغەمبەران بۆ هیچ شتێک نانێرین جگە بۆ مژدەدان نەبێت (بۆ ئیمانداران) و ترساندن نەبێت (بۆ

[244] [ إبراهيم: ٤٤ ]
[245] [ مريم: ٣٩ ]
[246] [ النبأ: ٤٠ ]
[247] [ الأنعام: ٤٨ ]

بێ باوەڕان)، جا ئەوەی ئیمان و باوەڕ بهێنێت و چاکسازی بکات، ئەوە نەترس و بیمیان لەسەرە، نە غەمبار دەبن.›

.اللّٰه تعالی فەرموویەتی ﴿ رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ ﴾ پێغەمبەران موژدە دەر و ترسێنەر و ئاگادار کەرەوەی خەڵکی بوونە بۆ مەبەستێک کە ئەویش ئەوەیە ﴿ لِئَلاَّ يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ ﴾ تاوەکو خەڵکی لە ڕۆژی قیامەت بیانوو بڕاو بێت و نەڵێت ئێمە نەمزانی و بێ ئاگا بوین و نەمزانی کە قیامەت و سزاو بەهەشت هەیە و ئێمە هیچ کەسێک شتی وای پێنەوتبوین ،

جا اللّٰه تعالی پێغەمبەران دەنێرێ تاوەکو و لەقیامەت ئەو بیانوانە نەهێننەوە ، جا اللّٰه تعالی بیانوو بڕاویان دەکات لە دونیا بەناردنی پێغەمبەران ،

وە بەڵگە (حجة) بریتیە لە ئەوەی پێغەمبەر ﷺ پێی هاتوە ، وە ئەویش قورئان و فەموودەکانیەتی ،

جا هەر کەسێک کە قورئان و فەرموودەی پێگەیشت ئەوە حوجە کراوە گەر چی لێی تێنەگات ،

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ﴿ ألا إنّي أوتيتُ الكتابَ ومثلَهُ معهُ ﴾ [248] واتە : بەدڵنیایەوە من قورئانم پێ دراوە ، وە هاوەشێوەی قورئانم پێداوە لەگەڵ قورئان.›

مەبەست لەوەیە قورئانم پێداوە لەگەڵ فەرموودە کە هاوشێوەی قورئان پێم دراوە لەگەڵ قورئان پێکەوە پێم دراوە ، جا قورئان و فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ هەردوکیان حوجەن بەسەر خەڵکەوە کە هەر جێگایێک قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ ی لێ بێت ئەوە ئەو خەڵکە بیانوو بڕاو کراون بۆ

[248] [ صحيح أبي داود برقم : ٤٦٠٤ ]

ڕۆژی قیامەت گەر چی خۆیان نەزانن بن بە قورئان ئەوە هەر بیانوو بڕ کراون ، بەتایبەتی لە باسی ئیمان و کوفر و ئیسلام و شیرک خەڵکی بیانویان قبوڵ ناکرێت لە ڕۆژی دوای گەر بە شیرکەوە گەڕابێتنەوە بۆ لای الله تعالى ، چونکە الله تعالى حوجەی بۆ ناردون بەڵام کە ئەوان خۆیان لێی ناکۆڵنەوە و خۆیان فێر ناکەن ، ئەوە لە ڕۆژی دوایی هیچ بیانویان نیە بەوەی بڵێن ئێمە نەمان دەزانی ئەمە شیرکە و ئەمە کوفرە ،

جا بۆیە هەرکەسێک کە لەم سەردەمە شیرکی گەورە بۆ الله تعالى بڕیار دەدات ئەوە موشریکە و پێی دەوترێت موشریک گەر چی نوێژیش بکات و ڕۆژوش بگرێت و جیهاد بکات لە پێناو الله تعالى ، گەرچی نەزانن بێت و نەزانێت ئەوە شیرکە ،

چونکە شیرک و ئیسلام ، وە ئیمان و کوفر باسێکی ئاسایی نین کە موسڵمان خۆی لێ بێ ئاگات بکات ، بەڵکو زانین و ناسینیان لە پێش نوێژ کردن و ڕوژو گرتنەوەیە چونکە پێغەمبەر ﷺ لە مكة دەساڵ بانگەشەی خەڵکی کرد بۆ ئیسلام و ئیمان وە پێیانی وت واز لە کوفر و شیرک بێنن ، لەسەرەتایی بانگەوزایەکەی خەڵکی بانگ کرد بۆ تەوحید و ئیمان ، نەک بۆ نوێژ کردن ،

وە هەروها کەسێک کە فێری نوێژ بووە چۆن بیانووی هەیە کە فێری تەوحید و ئیمان نەبوە لەکاتێک دا نوێژ فێربوون لە دوای ئیمان و تەوحیدە ،

جا بۆیە ئەو کەسەی کە شیرک دەکات ئەوە بە موشریک حساب دەکرێت گەرچی نەزانن بێت ، وە لە دونیا هەڵسوکەوتی موشریکی لەگەڵ دەکرێت نەک موسڵمان ،

جابۆیە دەبێت سەرەتا کەسی موسڵمان فێری ئیمان و ئیسلام بێت و کاری پێبکات انجا دوای ئەوە نوێژ بکات و ڕۆژو بگرێت ، بەڵام گەر کەسێک گوێ بە

ئیمان و تەوحید نەدات وە یان هەر بەلایا نەچێت ئەوە هیچ بیانویی نیە بەنەزانینی نیە لە ڕۆژی قیامەت ،

جا خەڵکی ئەم سەردەمە هەمووی حوجەیان پێگەشتوە و بیانو بڕ کراون جا کەسێک لەم سەردەمە شیرکی گەورەی ئەنجام دا وەیان کوفری گەورەی ئەنجامدا ئەوە کافر دەبێت تەنها مەگەر بەزۆر پێی بکەن ، دەنا گەر بە ڕەزامەنی خۆی بێت ئەوە کافرە گەرچی نەزانێت و جەهلی هەبێت ، چونکە ئەو جەهلە خۆی هۆکاریەتی و خۆی لەسەر خۆی لاینەداوە و گوێ پێنەداوە ، بۆیە بە کافر دادەنرێت و بەهەڵگەڕاوە حساب دەکرێت لەدین ،

جا الله تعالى پێغەمبەرانی ناردوە تاوەکو موژدە دەرن و ترسێنەر بن بۆ خەڵکی تا بیانوو بڕیان بکەن لە قیامەت لەلای الله تعالى ،

[٧٧]یەکەمیان (لە و پێغەمبەرانەی کە مووژدە دەر و ترسێنەر بوونە) بریتیە پێغەمبەر نوح عليه السلام ، وە کۆتایان بریتیە لە پێغەمبەر ﷺ ، وە ئەو کۆتای پێهێنەری پێغەمبەرانە ، بەڵگەش الله تعالى فەرموویەتی : بەڕاستی ئێمە (وحی)و نیگامان بۆ تۆ ناردووە هەر وەکو چۆن (وحی) و نیگامان بۆ نوح و پێغەمبەرانی دوای ئەو ناردووە.،

۞ ڕوونکردنەوە ۞

کاتێک پێغەمبەر ئادەم (عليه السلام) دابەزییە سەر زەوی وە منداڵی و نەوەی بوو خەڵکەکەی هەر لەسەر تەوحید و ئیمان و بەتاک پەرستی الله تعالى بوون بەڵام دوای چەند سەدەیێک توشی شیرک بون ، جا الله تعالى پێغەمبەرانی بۆ ناردن تا بێنەوە سەر ڕێگای ڕاست و بەتاک پەرستنی الله تعالى و بێباوڕ بوون بە پەرستراوەکانی تر ، وەک الله تعالى فەرموویەتی ﴿ كانَ النّاسُ أُمَّةً واحِدَةً فَبَعَثَ

اللَّهُ النَّبِيّينَ مُبَشّرينَ وَمُنذِرينَ وَأَنزَلَ مَعَهُمُ الكِتابَ بِالحَقِّ لِيَحكُمَ بَينَ النّاسِ فيمَا اختَلَفوا فيهِ وَمَا اختَلَفَ فيهِ إِلَّا الَّذينَ أوتوهُ مِن بَعدِ ما جاءَتهُمُ البَيِّناتُ بَغيًا بَينَهُم فَهَدَى اللَّهُ الَّذينَ آمَنوا لِمَا اختَلَفوا فيهِ مِنَ الحَقِّ بِإِذنِهِ وَاللَّهُ يَهدي مَن يَشاءُ إِلى صِراطٍ مُستَقيمٍ ﴾[249] واتە : خەڵكی یەک ئوممەت بوون و خاوەنی تەنها بیروباوەڕی یەكتاك ناسین بون، (بەڵام بەرەبەرە لایاندا) الله تعالى ش پێغەمبەرانی ڕەوانەكرد، تا مژدەدەرو ترسێنەربن هاوڕێ لەگەڵ كتێبی ئاسمانیدا، بۆ ڕوون كردنەوەی حەق و ڕاستی، تا لەنێوان خەڵكیدا فەرمانڕەوایی و دادوەری ئەنجام بدات لەسەر ئەو شتانەی كە بۆتە كێشەیان و ڕاو بۆچوونیان لەسەری جیاوازە،.›

جا یەكەم پێغەمبەر (رسول) كە نێردرا بۆ خەڵكی پێغەمبەر نوح بوو (علیه السلام) كە بە قەومەكەی فەرموو تەنها الله تعالى بپەرستن چونكە هیچ پەرستراوێكی تر نیە لە غەیری الله تعالى ،

الله تعالى فەرموویەتی ﴿ لَقَد أَرسَلنا نوحًا إِلى قَومِهِ فَقالَ يا قَومِ اعبُدُوا اللَّهَ ما لَكُم مِن إِلهٍ غَيرُهُ إِنّي أَخافُ عَلَيكُم عَذابَ يَومٍ عَظيمٍ ﴾[250]واتە : سوێند بە الله بێگومان ئێمە نووحمان ڕەوانە كرد بۆ لای گەلەكەی وتی : ئەی گەلەكەم تەنها الله بپەرستن ئێوە هیچ پەرستراوێكتان نی یە بێجگە لەو(الله) بەڕاستی من دەترسم (دووچاری) ئێوە بێ سزای ڕۆژێكی گەورە كە ڕۆژی دوایی یە.›

جا پێغەمبەر نوح ( علیه السلام )یەكەم پێغەمبەرە كە نێردراوە بۆ خەڵكی ، بەڵگەش پێغەمبەر ﷺ لە باسی ڕۆژی قیامەت دەكات كە كاتێک خەڵكی تەواو ماندوو دەبن دێن بۆلای پێغەمبەران داوایان لێدەكەن شەفاعەت بكەن جا

[249] [ البقرة: ٢١٣ ]

[250] [ الأعراف: ٥٩ ]

یەکەم جار چون بوو لای باوکە ئادەم پاشان ئەو وتی من ئەوکەسە نیم ، پاشان پێی فەرموون ﴿ ولَكِنِ ائْتُوا نُوحًا، فإنَّه أوَّلُ رَسولٍ بَعَثَهُ اللَّهُ إلى أهْلِ الأرْضِ ﴾ [251] واتە : بەڵکو بڕۆن بۆ لای نوح ، چونکە ئەو یەکەم پێغەمبەرە کە الله تعالى ناردویەتی بۆ خەڵکی سەر زەوی.›

ئەمەش بەڵگەیە کە یەکەم پێغەمبەر (رسول) لەسەر زەوی بریتیە لە نوح ،جا دوای ئەوە پێغەمبەران دوا بە دوای یەک الله تعالى پێغەمبەرانی نارد ، هەتا گەیشتە کۆتا پێغەمبەر کە ئەویش پێغەمبەر محمد ە ﷺ کە کۆتا پێغەمبەر و هیچ پێغەمبەرێکی تر لە دوای ئەو نایەت ،

الله تعالى فەرموویەتی ﴿ ما كانَ مُحَمَّدٌ أَبا أَحَدٍ مِن رِجالِكُم وَلكِن رَسولَ اللَّهِ وَخاتَمَ النَّبِيّينَ وَكانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيءٍ عَليمًا ﴾ [252] واتە : محمد وەنەبی باوکی هیچ کەس لە پیاوانتان بێت بەڵکو پێغەمبەری الله تعالى یەو دواهەمینی پێغەمبەرانە، هەمیشەو بەردەوامیش الله تعالى بە هەموو شتێک زانایە.›

پاشان پێغەمبەران هەموویان لەم نێوانە دا هاتوون کە لە نێوان پێغەمبەر نوح و پێغەمبەر محمدە ﷺ ( مەبەست لە رسول ە نەک النبي چونکە النبي لە پێغەمبەر نوح ەوە هەبوە بەڵام رسول لە پێش پێغەمبەر نوح ەوە نەبوە بەڵکوو پێغەمبەر نوح خۆی یەکەم رسول ە ) وە هیچ روسل ێک و النبي یێک نایەت لە دوای پێغەمبەر محمد ﷺ ،

وە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێداوین کە خەڵکی تر لە دوای خۆی دێت و بانگەشەی ئەوە دەکات کە پێغەمبەرە ، بەڵام پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ئەوانە درۆزنن چونکە من ئاخیر پێغەمبەرم و کەس لە دوای من بە پێغەمبەر نایەت ،

[251] [ رواه البخاري برقم : ٧٤١٠ ، و رواه مسلم برقم : ١٩٣ ]

[252] [ الأحزاب: ٤٠ ]

وەک پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ﴿ وإنَّهُ سيَكونُ في أمَّتي ثلاثونَ كذَّابونَ كلُّهم يزعمُ : أنَّهُ نبيٌّ ، وأنا خاتمُ النَّبيِّينَ لاَ نبيَّ بَعدي ﴾[253] واتە : بەدڵنیایەوە لە ئومەتەکەی من ئەوە ڕوو دەدات کە سی(٣٠) درۆزن دێن هەموویان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە پێغەمبەرن ، وە من کۆتا پێغەمبەرم و پێغەمبەر نیە لە دوای من ›.

جا بۆیە هیچ پێغەمبەرێک نایەت لە دوای پێغەمبەر محمد ﷺ ، وە ئەو باسەکەی پێغەمبەر عیسا علیه السلام لە ئاخیر زەمان دێتە سەر زەوی ، ئەوە پێچەوانەی ئەم ئایەت و فەرموودانە نیە ، چونکە پێغەمبەر عیسا (علیه السلام) خۆی لە پێش پێغەمبەر ﷺ نێردراوە بە پێغەمبەر بەڵام الله تعالی بەرزی کردۆتەوە بۆ ئاسمان بە زیندووی و لە ئاخیر زەمان دای دەبەزێنتەوە و دەجال دەکوژێت دواتر حەج ئەنجامدەدات و دەمرێت ،

الله تعالی فەرموویەتی ﴿ إِنَّا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ كَمَا أَوْحَيْنَا إِلَى نُوحٍ وَالنَّبِيِّينَ مِن بَعْدِهِ ﴾[254] واتە : بەڕاستی ئێمە (وحی)و نیگامان بۆ تۆ ناردووە هەر وەکو چۆن (وحی) و نیگامان بۆ نوح و پێغەمبەرانی دوای ئەو ناردووە،›

شیخ ئەم بەڵگەیی هێناوە لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر نوح یەکەم پێغەمبەرە ، الله تعالی فەرموویەتی ﴿ إِنَّا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ كَمَا أَوْحَيْنَا إِلَى نُوحٍ وَالنَّبِيِّينَ مِن بَعْدِهِ ﴾ واتە : بەڕاستی ئێمە (وحی)و نیگامان بۆ تۆ ناردووە هەر وەکو چۆن (وحی) و نیگامان بۆ نوح و پێغەمبەرانی دوای ئەو ناردووە،›

ئەم بەڵگەیە چەند روێکی هەیە

[253] [ حديث صحيح ، رواه الترمذي برقم : ٢٢١٩ ]

[254] [ النساء: ١٦٥ ]

یەکەم : دەکرێت لەو ڕووەوە بێت کە سەرەتا پێغەمبەر نوح و کراوە بە النبي ، پاشان بە رسول ، چونکە پێغەمبەر ﷺ بەو شێوە بوە ،

بەڵام ئەم ڕوەیان قبوڵ نیە چونکە باس لە نبي ش دەکات ، وە نبي مەرج نیە رسول بێت وە پێغەمبەر ﷺ رسول بوو ، بۆیە ئەم ڕوە یان قبوڵ نیە ،

دووەم : دەکرێت لە شێوەی چۆنیەتی وەحی بۆ ناردنەکە بێت ، کە چۆن جوبرائیل هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ هەر بەو شێوەش چوبێت بولای پێغەمبەر نوح و پێغەمبەرانی تر ،

سێیەم : دەکرێت لە بانگەوازیەکە دابێت ، کە پێغەمبەر نوح بە قەومەکەی فەرموو تەنها الله بپرستن چونکە هیچ پەرستراوێک نیە لە غەیری ئەو ، وە بەهەمان شێوەش پێغەمبەر ﷺ بانگی خەڵکی کرد بۆ ئەوەی بڵێن لا اله الا الله ، کە هەر ئەو مەبەستەیە کە پێغەمبەر نوح بە قەومەکەی خۆی فەرموو ،

وە ئەم ڕوەشیان تەنها رسول دەگرێتەوە چونکە نبي فەرمانی پێنەکراوە کە بانگەوازی بکات بەڵکو تەنها بۆخۆیەتی ،

ئەم بەڵگەی کە شێخ هێناویەتی ئەوەی لێ دەردەکەوێت کە سەرەتا وەحی بۆ پێغەمبەر نوح کراوە پاشان بۆ پێغەمبەرانی تر ، چونکە فەرمووی ﴿ إِلَى نُوحٍ وَالنَّبِيِّينَ مِن بَعْدِهِ ﴾ سەرەتا باسی پێغەمبەر نوح ی کرد انجا پێغەمبەرەکانی تر وە ئەمەش بەڵگەیە کە پێغەمبەر نوح یەکەم پێغەمبەر (رسول) بوە وە ئەوانی تریش لە دوای ئەوە هاتوون ، وەک الله تعالى فەرموویەتی ﴿ وَالنَّبِيِّينَ مِن بَعْدِهِ ﴾واتە : وە پێغەمبەرانی دوای ئەو ، والله اعلم .

مـتـن

عَنْ عِبَـادَةِ الطَّاغُـوتِ؛ وَالدَّلِيلُ قَوْلُهُ تَعَالَى: ( وَلَقَـدْ بَعَثْـنَا فِي كُلِّ أُمَّـةٍ رَّسُـولًا أَنِ اعْبُـدُواْ اللّهَ وَاجْتَنِبُـوا الطَّاغُوتَ ) [النـحل: 36]. وَافْتَـرَضَ اللهُ علَى جَمِيعِ الْعِبَادِ الْكُفْرَ بِالطَّاغُوتِ وَالإِيمَانَ بِاللهِ.[78]
قَالَ ابْنُ الْقَـيِّمِ ـ رَحِـمَهُ اللهُ تَعَالَى: مَعْنَى الطَّاغُوتِ مَا تَجَاوَزَ بِهِ الْـعَبْدُ حَدَّهُ مِنْ مَـعْبُودٍ أَوْ مَتْبُوعٍ أَوْ مُطَاعٍ.[79]..........................................

[٧٨]وە هەموو ئومەتێک اللّٰه تعالى پێغەمبەرێکی بۆ ناردون لە پێغەمبەر نوح ـەوە تاوەکو پێغەمبەر محمد ﷺ ، کە فەرمانی پێکردون بە پەرستنی اللّٰه تعالى بەتاک و تەنها ، وە قەدەغەی لێکردون لە پەرستنی طاغوت ، بەڵگەش اللّٰه تعالى فەرموویەتی : سوێند بە اللّٰه لە ناو هەموو ئوممەتێکدا پێغەمبەرێکمان ناردووە بەوەی کە تەنها اللّٰه تعالى بپەرستن و دوورکەونەوە لە (پەرستنی) طاغوت.› وە اللّٰه تعالى لەسەر هەموو بەندەکانی فەرز کردوە کە بێباوەڕ بن بە طاغوت و ئیمان بهێنن بە اللّٰه تعالى.›

## ۞ ڕوونکردنەوە ۞

اللّٰه تعالى بۆ هەر گەل و ئومەتێک پێغەمبەرێکی (رسول) بۆ ناردوون تا دوو شتی سەرەکیان پێ بڵێت

یەکەم : عیبادەت و پەرستن بۆ اللّٰه تعالى بکەن بەتاک و تەنها ،

دووەم : دور بکەونەوە و بێباوەڕ بن بەوەی لە غەیری اللّٰه تعالى دە پەرسترێت ،

وە ئەمەش بریتیە لە ئەسڵی دین کە تەوحیدە ، کە بە تاک پەرستینی اللّٰه تعالى یە لە عیبادەتەکان ،

جا هەر قەومێک و هۆزێک لە سەردەمی پێغەمبەر نوح ـەوە هەبووبێت ئەوە اللّٰه تعالى پێغەمبەری بۆ ناردوون هەتا سەردەمی پێغەمبەر محمد ﷺ ، بەوەی

کە تەنها الله تعالى بپەرستن و بێباوەڕ بن بە هەموو پەرستراوێکی تر لە غەیری الله تعالى ،

وە ئەمەش بریتیە لە بانگەشەی هەموو پێغەمبەران ، جا هەمووی یەک بەمەستە بەڵام چۆنیەتی دەر بڕینەکەی بە جیاواز هاتوە لە قورئان و فەرموودە ،

بەو شێوە هاتوە کە پێغەمبەر نوح[255]و هود[256] و صالح[257] و شعیب[258](علیهم السلام) فەرموویانە ﴿ يا قَومِ اعبُدُوا اللَّهَ ما لَكُم مِن إِلهٍ غَيرُهُ ﴾ واتە : ئەی گەلەکەم تەنها الله بپەرستن ئێوە هیچ پەرستراوێکتان نی یە بێجگە لەو ( یانی الله تعالى ).›

وە بەوە شێوەش هاتوە کە پێغەمبەر ابراهیم (علیه السلام) فەرمووی ، الله تعالى فەرموویەتی ﴿ وَإِذ قالَ إِبراهيمُ لِأَبيهِ وَقَومِهِ إِنَّني بَراءٌ مِمّا تَعبُدونَ – إِلَّا الَّذي فَطَرَني فَإِنَّهُ سَيَهدينِ – وَجَعَلَها كَلِمَةً باقِيَةً في عَقِبِهِ لَعَلَّهُم يَرجِعونَ ﴾[259] واتە : وە کاتێ ئیبراهیم بە باوکی و گەلەکەی وت بێگومان من بەریم لەوەی ئێوە دەیپەرستن. – جگە لەو زاتەی کە دروستی کردووم چونکە هەر ئەویش ڕێنموونیم دەکات. – ئەو (یەکتاک پەرستی یە) ی لەناو نەوەکانیدا بەجێ هێشت تا بگەڕێنەوە سەری.›

وە بەو شێوەیش هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ، الله تعالى فەرموویەتی ﴿ قُل يا أَهلَ الكِتابِ تَعالَوا إِلى كَلِمَةٍ سَواءٍ بَينَنا وَبَينَكُم أَلّا نَعبُدَ إِلَّا اللَّهَ وَلا نُشرِكَ

[255] الأعراف: ٥٩
[256] الأعراف: ٦٥
[257] الأعراف: ٧٣
[258] الأعراف: ٨٥
[259] الزخرف: ٢٦ – ٢٨

بِهِ شَيئًا وَلا يَتَّخِذَ بَعضُنا بَعضًا أَربابًا مِن دونِ اللَّهِ فَإِن تَوَلَّوا فَقولُوا اشهَدوا بِأَنّا مُسلِمونَ ﴾ [260] واته : (ئەی محمد ( ﷺ ) بڵێ: ئەی ئەوانەی کتێبتان بۆ ڕەوانەکراوە وەرن بەدەم بانگەواز و بەرنامەیەکەوە کە هاوبەش و هاوسەنگە لە نێوان ئێمەش و ئێوەشدا (ئەویش ئەمەیە): جگە لە (الله) کەسی تر نەپەرستین، هیچ جۆرە هاوەڵێکی بۆ بڕیار نەدەین، هیچ لایەکمان لاکەی ترمان (بەپیرۆز و فەرمانڕەوا دانەنێین) لەجیاتی ئەو زاتە و نەیپەرستین (خۆ ئەگەر لەم بانگەوازدا) سەرپێچیان کردو گوێیان پێنەدا، ئەوە پێیان بڵێ: کە ئێوە بەشایەت بن کە ئێمە موسڵمانین و ملکەچی فەرمانی پەروەردگارین.›

وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ﴿ يا أَيُّها الناسُ قولوا لا إِلهَ إِلَّا اللهُ تُفلحوا، ﴾ [261] واتە : ئەی خەڵکینە بڵێن هیچ پەرستراوێک نیە شایەنی پەرستن بێت بەحق تەنها الله تعالى نەبێت ،تا سەر فراز ببن.›

ئەمانە هەموویان یەک مەبەستن و مانان کە ئەویش پەرستنی الله تعالى بەتاک و تەنها و بێ شەریک و هاوبەش دانان بۆی ،

الله تعالى فەرموویەتی ﴿ وَاعبُدُوا اللَّهَ وَلا تُشرِكوا بِهِ شَيئًا ﴾ [262] واتە : (ئەی خەڵکینە) تەنها الله تعالى بپەرستن و هیچ جۆرە شەریک و هاوەڵێکی بۆ بڕیار مەدەن.

وە هەمووشیان بۆ ئەوە نێردراون ، وەک الله تعالى فەرموویەتی ﴿ وَما أَرسَلنا مِن قَبلِكَ مِن رَسولٍ إِلّا نوحي إِلَيهِ أَنَّهُ لا إِلهَ إِلّا أَنا فَاعبُدونِ ﴾ [263] واتە : ئێمە پێش

[260] آل عمران: ٦٤
[261] [ حديث صحيح ، المحلى جـ ٩ – صـ ١١٢ ]
[262] [ النساء: ٣٦ ]
[263] [ الأنبياء: ٢٥ ]

تۆ هیچ پێغەمبەرێکمان ڕەوانە نەکردووە، کە وەحیمان بۆ نەناردبێت بەوەی کە: بێگومان هیچ خوایەک نیە جگە لە من و دەبێت هەر من بپەرستن.›

وە ئەم بەشەی ﴿ ما لَكُم مِن إِلهٍ غَيرُهُ ﴾ وە ئەم بەشەی ﴿ إِنَّني بَراءٌ مِمّا تَعبُدونَ ﴾ وە ئەم بەشەی ﴿ أَلّا نَعبُدَ ﴾ ئەوە دەچێتە ناو ئەم وتەیەوە کە مەبەست پێی ئەوەیە هیچ پەرستراوێک نیە بە حەق شایەنی پەرستن بێت ،

وە ئەم بەشەی ﴿ اعبُدُوا اللَّهَ ﴾ وە ئەم بەشەی ﴿ إِلَّا الَّذي فَطَرَني ﴾ وە ئەم بەشەی ﴿ إِلَّا اللَّهَ ﴾ ئەوە دەچێتە ناو ئەو وتەیەوە کە مەبەست پێی ئەوەیە تەنها الله تعالى نەبێت کە شایەتی پەرستنە ،

جا ئەگەر ئەم دوو بەشە بەیەکەوە بێت ئەوە دەبەوەی کە هیچ پەرستراوێک نیە بە حەق شایەنی پەرستن بێت تەنها الله تعالى نەبێت کە شایەتی پەرستنە ، وە ئەمەش مانای ئەو وتەیە یە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ﴿ يا أيُّها الناسُ قولوا لا إلهَ إلّا اللهُ تُفلحوا، ﴾ واتە : ئەی خەڵکینە بڵێن هیچ پەرستراوێک نیە شایەنی پەرستن بێت بەحق تەنها الله تعالى نەبێت ،تا سەر فراز ببن.›

وە هەموو پێغەمبەران کە بە قەومەکەیان فەرمووە وەک الله تعالى فەرموویەتی ﴿ وَما أَرسَلنا مِن قَبلِكَ مِن رَسولٍ إِلّا نوحي إِلَيهِ أَنَّهُ لا إِلهَ إِلّا أَنا فَاعبُدونِ ﴾ [264] واتە : ئێمە پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێکمان ڕەوانە نەکردووە، کە وەحیمان بۆ نەناردبێت بەوەی کە: بێگومان هیچ خوایەک نیە جگە لە من و دەبێت هەر من بپەرستن.›

جا ئەوەی لە غەیری الله تعالى دەپەرسترێت ئەوە پەرستراوێکی باطڵە کە پێویستە بەباطڵ و پوچی بزانیت ،

[264] [ الأنبياء: ٢٥ ]

اللّٰه تعالى فەرموویەتی ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِنْ دُونِهِ هُوَ الْبَاطِلُ وَأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ ﴾[265]واتە : ئەو بیستن و بینینەش بە هۆی ئەوەیە چونکە بەڕاستی اللّٰهتعالى خۆی حەق و ڕاستە، ئەوانەش کە ئەوان هاناو هاواری بۆ دەبەن لە جیاتی ئەو هەر ئەوە خۆی باتاڵ و ناحەقیە. بێگومان ئەو اللّٰه یە بڵندو بەرزو مەزن و گەورەیە.›

وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ﴿ أَصْدَقَ كَلِمَةٍ قَالَهَا الشَّاعِرُ كَلِمَةُ لَبِيدٍ : أَلَا كُلُّ شَيْءٍ مَا خَلَا اللَّهَ بَاطِلٌ ﴾[266] واتە : ڕاسترین وتە کەشاعێر وتویەتی وتەکەی لبیدە کە دەڵێ بەڕاستی هەموو شتێک جگە لەاللّٰه باطڵە ( مەبەست لەوەیە ئەوەی لە غەیری اللّٰه دەبەپرسترێت باطڵ و پوچە )

جا بۆیە پێویستە کە بێباوەڕ بیت بە هەموو ئەوەی لە غەیری اللّٰه تعالى دەپەرسترێت ، وە عیبادەتی بۆ نەکەیت و بە پوچ و باطڵی بزانیت ، وە بڕوای تەواو بە اللّٰه تعالى بێنیت بەوەی کە شایەتی پەرستنە بەتاک و تەنها وە بیپەرستیت ،

وە بزانە پێغەمبەران و مەلائیکە و پیاوچاکان ناچنە ناو بەشی طاغوت ، چونکە ئەوان پێی ڕازین بۆیەش بە الە یش وەسف ناکرێن گەر الە ی باطڵ یشت بێت یان حەق چونکە ئەوانەی ئەوان دەپەرستن ئەوە شەیتان دەپەرستن ،

ئیمامی بەغەوی (رحمە اللّٰه) فەرموویەتی ﴿ فدعوا رسول الله صلى الله عليه وسلم فقال له ابن الزبعري: أنت قلت: إنكم وما تعبدون من دون الله حضب جهنم ؟ قال: نعم، قال: أليست اليهود تعبد عزيراً والنصارى تعبد المسيح، وبنو مليح يعبدون الملائكة؟ فقال النبي صلى الله عليه وسلم : بل هم يعبدون

265 [ الحج: ٢٩ ]
266 [ حديث صحيح ]

الشياطين ﴾[267] واته : بانگی پێغەمبەریان کرد ﷺ ، عبدالله پێی وت ئایه تۆ دەڵێیت ، ئێوە و ئەوانەی لەغەیری الله دەیپەرستن ئەوە سوتەمەنی دۆزخەن ؟؟، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بەڵێ ، عبدالله وتی ،ئەی ئەوە نیە جولەکەکان عوزەیەر (علیه السلام) دەپەرستن ، وە گاورەکانیش عیسا (علیه السلام) دەپەرستن ، وە بن ملیح ملائیکه (علیهم السلام) دەپەرستن ؟؟ (مەبەستی عبدالله ئەوە بوو کە تۆ ئەی محمد ﷺ گەر ڕاستگۆبیت ئەوە دەبێت ،ئە و دوو پێغەمبەر و ملائیکەش (علیهم السلام) بچنە دۆزەخەوە ، چونکە ئەوانیش پەرستراون لەغەیری الله تعالی) پێغەمبەرﷺ فەرمووی ، نا بەڵکو ئەوان شەیتانەکان دەپەرستن.›

دیقەت بدە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی نەخێر بەڵکو ئەوان شەیتان دەپەرستن ، جا بۆیە ئەوان نا پەرسترێن بەڵکو ئەوکەسانەی کە نیشان دەدن ئەوان دەپەرستن ئەوە شەیتان دەپەرستن نەک ئەوان وەک پێغەمبەر ﷺ فەرمووی نا بەڵکو ئەوان شەیتان دەپرسن ،

جا بۆیە مەسلەی طاغوت پەرستراوە باطڵەکان ناخێرێنە سەر پێغەمبەران و مەلائیکە و پیاوچاکان ،

وە الله تعالی فەرمانی بە بەندەکانی کردوە کە عیبادەتی الله تعالی بکەن و خۆیان دور بگرن لە طاغوت وەک فەرموویەتی ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُواْ اللّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ ﴾[268] واته : سوێند بە الله لە ناو هەموو ئوممەتێکدا پێغەمبەرێکمان ناردووە بەوەی کە تەنها الله تعالی بپەرستن و دوورکەونەوە لە

[267] [ معالم التنزيل لإمام البغوي ، في تفسير اية ١٠١ في سورة الأنبياء ]

[268] [ النحل: ٣٦]

(پەرستنی) طاغوت.› وە الله تعالى لەسەر هەموو بەندەکانی فەرز کردوە کە بێباوەڕ بن بە طاغوت و ئیمان بهێنن بە الله تعالى.›

الله تعالى فەرمانی بە هەموو پێغەمبەران (علیه السلام) کردوە کە بە قەومەکیان بڵێن

یەکەم: عیبادەتی الله تعالى بکەن بە تاک و تەنها

دووەم: خۆتان دور بگرن لە عیبادەتکردن بۆ تاغوت و بڕواتان پێی نەبێت،

الله تعالى لەم ئایەتە دوو فەرمانی کردوە

یەکەم: فەرمانی کردوە بە پەرستنی خۆی بەتاک و تەنها.

دووەم: دوور کەوتنەوە لە طاغوت و عیبادەت بۆ کردنی و بێباوڕ بون پێی.

جا هەر کەسێک یەکێک لەم فەرمانە بشکێنێ ئەوە کافرە چونکە شوێن بانگەوازی پێغەمبەران نەکەوتوە و وڵامی بانگەوازیەکیانی نەداوەتەوە کە ئەو دوو فەرمانەیە.

وە هیچ فەرقێک نیە لەوەی کەسێک شوێن طاغوت بکەوێت لەگەڵ کەسێک کە عیبادەت بۆ الله تعالى ناکات،

چونکە گەر عیبادەت بۆ الله تعالى نەکات ئەوە فەرمانی یەکەمی شکاندوە،

وە گەر خۆی دوور نەگرێت لە طاغوت و بێباوڕ نەبێت پێی ئەوە فەرمانی دوەمی شکاندوە،

[٧٩]ئیمامی ابن القیم (رحمه الله) فەرموویەتی: مانای طاغوت ئەوەیە کە بەندە بەهۆیەوە لە سنوری بەندایەتیەوە دەردەچێت بۆ ئەوەی دەپەرسترێت یان خەڵکی شوێنی دەکەوێت یان گوێڕایەڵی دەکرێت.›

## ❁ ڕوونكردنەوە ❁

ئیمامی ابن القیم رحمه اللّٰه یەكێكە لە گەورە زانایانی ئیسلام ناوی خۆی شمس الدین ابی عبداللّٰه محمد بن ابی بكر ، ( رحمه‌اللّٰه ) ،

وشەی طاغوت لە زیادەڕۆییەوە هاتوە ، وە سنور بەزاندن و لەحەد دەرچونە ، وەک شیخ سلمان ی کوڕی عبداللّٰه (رحمه اللّٰه) فەرموویەتی ﴿ الطاغوت مشتق من الطغیان وهو مجاوزة الحد ﴾ [269]واتە : طاغوت لە توغیانەو هاتوە ، وە سنور بەزاندن و دەرچونە لە سنور .›

وەک اللّٰه تعالى دەفەرموێت ﴿ إِنَّا لَمَّا طَغَى الْمَاءُ حَمَلْنَاكُمْ فِي الْجَارِيَةِ ﴾[270] واتە : بەڕاستی ئێمە كاتێك ئاو لە سنوور دەرچوو (لە كاتی تۆفانەكەی نوح دا) ئێوەمان لە كەشتیدا هەڵگرت (باوو باپیرانی ئێوە) .›

وە طاغوت لە شەرعدا بریتیە لەوەی كە ئیمامی ابن القیم (رحمه اللّٰه) دەفەرموێت ﴿ مَعْنَى الطَّاغُوتِ مَا تَجَاوَزَ بِهِ الْعَبْدُ حَدَّهُ مِنْ مَعْبُودٍ أَوْ مَتْبُوعٍ أَوْ مُطَاعٍ ﴾[271] واتە : مانای طاغوت ئەوەیە كە بەندە بەهۆیەوە لە سنوری بەندایەتیەوە دەردەچێت بۆ ئەوەی دەپەرسترێت یان خەڵكی شوێنی دەكەوێت یان گوێڕایەڵی دەكرێت .›

طاغوت سێ جۆری هەیە وە ئەو شتانەی كە كەسێک دەكات بە طاغوت ئەوە سێ جۆر شت و كارە ، كە تاغوت لەم سێ شێوە خۆی دەگرێتەوە ، وەک شیخ سلیمان بن سحمان ( رحمه اللّٰه ) فەرموویەتی ﴿ أن الطاغوت ثلاثة أنواع : طاغوت حكم ، وطاغوت عبادة ، وطاغوت طاعة ومتابعة ﴾[272]واتە : طاغوت

[269] [ تیسیر العزیز الحمید : صـ ٣٤ ]
[270] [ الحاقة: ١١ ]
[271] [ اعلام المعوقین : جـ ١ – صـ ٥٠ ]
[272] [ الدرر السنیة جـ ١٠ – صـ٥٠٣ ]

سێ جۆرە ؛ طاغوتی حاكم (دادوەر) ، طاغوتی عیبادات (پەرستن) ، طاغوتی گوێڕایەڵی کردن (بەقسەکردن) و شوێنکەوتن ،›

یەکەم : طاغوتی عیبادەت ئەوەیە کە خەڵکی عیبادەتی بۆ دەکەن و دەیپەرستن لە غەیری الله تعالی وە خۆی بەو پەرستنە ڕازیە ، وە بەڵگەش لەسەر هەبوونی طاغوتی عیبادەت وتەی الله تعالی وەک فەرموویەتی ﴿ وَالَّذِينَ اجْتَنَبُوا الطَّاغُوتَ أَنْ يَعْبُدُوهَا وَأَنَابُوا إِلَى اللَّهِ لَهُمُ الْبُشْرَىٰ ۚ فَبَشِّرْ عِبَادِ ﴾[273] واتە : وە کەسانێ کە لە پەرستنی بت (و هەموو پەرستراوێکی تر) خۆیان پاراستووە وە گەڕاونەتەوە بۆ لای خوا مژدەی گەورە تەنیا بۆ ئەوانە کەواتە مژدە بدە بە بەندەکانم.›

جا ئەوکەسانەی کە خۆیان لە تاغوت بەدوور گرت ، خۆیان بە دوور گرت کە بیپەرستن و عیبادەتی بۆ بکەن ، وە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەندێک لە خەڵکی هەیە عیبادەت بۆ تاغوتان دەکات ، وە هەندێک لە خەڵکی هەیە خۆی لە عیبادات کردن بۆ تاغوتان بە دوور دەگرێت ، وەک پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی ﴿ يجمع الله الناس، فيقول: من كان يعبد شيئاً فليتبعه، فيتبع من كان يعبد الشمس، ويتبع من كان يعبد القمر، ويتبع من كان يعبد الطواغيت، ﴾[274] واتە : الله تعالی خەڵکی لە ڕۆژی قیامەت کۆ دەکاتەوە و دەفەرموێت هەر کەسێک شتێکی پەرستوە ئەوا با دوای بکەوێت ، جا ئەوەی خۆر ی پەرستەوە دوای خۆر دەکەوێت ، وە ئەوەی کە مانگ ی پەرستوە دوای مانگ دەکەوێت ، وە ئەوەی طاغوت ی پەرستوە دوای طاغوت دەکەوێت.›

[273] [ الزمر: ١٧ ]

[274] [ رواه البخاري برقم: ٧٤٣٧ ، و رواه مسلم برقم: ١٨٢ ]

دووەم : طاغوتی حاكمیەت بریتیە لەو كەسەی كە حوكم و دادوەری لە نێوان خەڵكی دەكات بەبێ شەرعی الله تعالى وە حەڵاڵ و حەڕام بۆ خەڵكی دادەنێت ، وە بەڵگەش لەسەر طاغوتی حاكمیەت وتەی الله تعالى یە وەک فەرموویەتی ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ ﴾[275] واتە :ئایا نەتڕوانیووەتە ئەو (دووڕووانەی) لاف ئەوە لێ دەدەن گوایە بەڕاستی باوەڕیان هێناوە بەوەی كە بۆ تۆ ڕەوانەكراوە و بەوەش كە پێش تۆ ڕەوانەكراوە (بۆ پێغەمبەران)! كەچی دەیانەوێت ڕووبكەنە زۆردارو جادووگەرو خوانەناسان تا دادوەریان لە نێواندا بكەن و چارەسەری كێشەكانیان بكەن،،

جا دیقەت بدە ئەو كەسەی كە ویستی حوكم بۆ غەیری الله تعالى بگێڕێتەوە ئەوە الله تعالى ئەوحاكمەی بەطاغوت ناو برد كە مونافقەكە ویستی حوكمی بۆ لا بگێڕێتەوە ،

سێیەم : طاغوتی گوێڕایەڵی بریتیە لەوەی كەسێک كە ڕێگا و ڕێبازێكی تر بێنێت لە غەیری ڕێگا و ڕێبازی ئیسلام ، وە خەڵكی شوێنی بكەوێت و بەقسەی بكات ، وە بەڵگەش لەسەر طاغوتی گوێڕایەڵی وتەی الله تعالى یە وەک فەرموویەتی ﴿ اللَّهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُوا يُخْرِجُهُم مِّنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ ۖ وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَوْلِيَاؤُهُمُ الطَّاغُوتُ يُخْرِجُونَهُم مِّنَ النُّورِ إِلَى الظُّلُمَاتِ ۗ أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴾[276]واتە : الله پشت و پەنا و خاوەنی ئەو كەسانەیە باوەڕیان هێناوە، لە تاریكاییەكانی (گومان و ستەم) دەریان دەهێنێت و دەیانبات بەرەو نوورو ڕووناكی، ئەوانەش كە ڕێبازی كوفریان گرتۆتەبەر، یارمەتی دەرەكانیان تەنها .

[275] [ النساء: ٦٠ ]

[276] [ البقرة: ٢٥٧]

تاغوتەکانە، لە نوورو ڕووناکی دەریان دەهێنن و بەرەو تاریکاییەکان دەیانبەن، ئا ئەوانە نیشتەجێی ناو ئاگری دۆزەخن و بۆ هەمیشە تیایدا دەمێننەوە›

جا ڕێگا و ڕێبازی طاغوتان پێچەوانەی یە و جیایە لەگەڵ شەریعەت و بەرنامەی اللە تعالی ، جا خەڵکی بەهۆی ئەوەوە گومڕا دەبن کە شوێن ڕێگا و ڕێبازی تاغوتان دەکەون و بەقسەیان دەکەن ،

هەموو طاغوتێک لەم سێ شتە دەر ناچێت جا یان ئەوەیە کە دە پەرسترێت وەیان ئەوەیە حوکم لە نێوان خەڵکی دەکات وەیان خەڵکی شوێن ڕێگاو ڕێبازەکەی دەکەوێت ،

[٨٠]وە طاغوتەکان زۆرن سەرەکانیان پێنج دانەن ، یەکەم : شەیتان لەعنەتی اللە تعالی لێبێت،

۞ ڕوونکردنەوە ۞

بێگومان پێنج دانە نین و زۆرن بەڵام سەر گەورەترین و دیارتین و زۆرترینیان پێنج دانە ،

شەیتان گەورەترین طاغوتە ، لەسەر زەوی کە بانگەشەی خەڵکی دەکات بۆ شیرک و کوفر و پەرستنی خۆی لە جیاتی اللە تعالی ، وە دەیەوێت خەڵکی لە ڕێگای ڕاست گومڕا بکات ، وەک اللە تعالی دەفەرموێت ﴿ قالَ رَبِّ بِما أغوَيتَني لَأُزَيِّنَنَّ لَهُم فِي الأَرضِ وَلَأُغوِيَنَّهُم أَجمَعينَ ﴾ [277] واتە : (شەیتان) وتی ئەی پەروەردگارم لەبەر ئەوەی گومڕات کردم بێگومان خۆشی دنیایان لە زەوی دا بۆ دەڕازێنمەوە وە بەڕاستی هەموویان گومڕا دەکەم›

[277] الحجر: ٣٩

وە هەر طاغوتێک لەسەر زەوی هەبێت ئەوە سەرچاوەکەی شەیتانە کە طاغوتی گەورەیە و سەرگەورەی هەموو طاغوتێکە ،

الله تعالى فەرموویەتی ﴿ أَلَم أَعهَد إِلَيكُم يا بَني آدَمَ أَن لا تَعبُدُوا الشَّيطانَ إِنَّهُ لَكُم عَدُوٌّ مُبينٌ ﴾ [278] واتە : ئەی نەوەکانی ئادەم ئایا وەسێتم بۆ نەکردن کە شەیتان نەپەرستن چونکە بەڕاستی شەیتان دوژمنی ئاشکرای ئێوەیە.›

جا شەیتان یەکێکە لە طاغوتەکان کە دەپەرسترێت لە غەیری الله تعالى لایان بەندە گومڕاکانەوە ،

[81]دووەم : هەر کەسێک بپەرسترێت و بەو پەرستنە ڕازی بێت،

۞ ڕوونكردنەوە ۞

هەر کەسێک بپەرسترێت و بەو پەرستنە ڕازی بێت، جا ئەگەر ئەو کەسە مردو بێت یان زیندوو بەڵام تەنها ڕازی بێت ئەوە دەبێت بەطاغوت ،

جا لەم سەردەمە دا ئەم جۆرە طاغوتانە زۆرن کە وەک ئەو شێخانەی دەروێشەکانیان سوجدەیان بۆ دەبەن و قوربانییان بۆ دەکەن و داوای شیفا دان و ڕزق دان و منداڵ پێدانیان لێدەکەن ، کە ئەمانە هەمووی عیبادەتن و دەبێت بەتاک و تەنها بۆ الله تعالى بکرێت ، بەڵام خەڵکانێک ئەم عیبادەتانە بۆ ئەم شێخانە دەکەن و شێخەکانیش پێی ڕازین و بێدەنگن ، جا بۆیە بەهۆی ئەوەوە ئەو شێخانە دەبنە طاغوت وە ئەوانەی ئەو عیبادەتانەیان بۆ دەکەن دەبنە بەندەی طاغوت و بەوە بانگدەکرێن و ناوی بەندەی طاغوتیان لێ دەنێن

،

[278] يس: ٦٠

وە هەروها ئەوانەی بەندایەتی بۆ بتەکان و مانگا و خۆر و مانگ دەکەن ئەوانیش پێیان دەوترێن موشریک ، بەڵام بە مانگا و خۆر و مانگ ناوترێت طاغوت ، بەڵکو تەنها حوکم لەسەر ئەو کەسانە دەدرێت کە عیبادەتیان بۆ دەکەن ،

وە بۆیەش بە خۆر و مانگ و مانگا و مشک و ئەستێرە ناوترێت طاغوت چونکە ئەوان بەوە ڕازی نین کە بپەرسترێن ، وە ئەوان پاکی و بێگردی بۆ الله تعالى دەکەن کە شەریک و هاوبەشی هەبێت ، وەک الله تعالى دەفەرموێت ﴿ يُسَبِّحُ لِلَّهِ ما فِي السَّماواتِ وَما فِي الأَرضِ المَلِكِ القُدّوسِ العَزيزِ الحَكيمِ ﴾[279]واتە : هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە تەسبیحات و ستایشی الله تعالى دەکەن.. ئەو خوایەی کە پاشایە و شاهی شاهانە، پاك و بێگەردو پوختە، باڵادەست و دانەیە.›

جا خۆر و مانگ و ئەستێرە و مشک و مار و مانگا پێیان ناوترێت تاغوت چونکە خۆیان پێی ڕازی نین چونکە گە ڕازی بواین بەوەی بکرێن بەشەریکی الله تعالى ئەوە پاکی و بێگەردیان بۆ الله تعالى نەدەکرد کە لەکاتێک دا پاکی و بێگەردی کردنی الله تعالى بە مانای ئەوە دێت کە تاک و تەنهایە شەریک و هاوبەشی نیە و دورە لە هەموو نوقستانی و کەم و کوڕییێک ، وە هەروها ناوی طاغوت یشان لێ نانرێت و پێیان ناوترێت طاغوت بەڵکو بەناوی خۆیان بانگیان دەکرێت و ناوی خۆیان لێ دەنرێت ، وەک پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ﴿ يجمع الله الناس، فيقول: من كان يعبد شيئاً فليتبعه، فيتبع من كان يعبد الشمس، ويتبع من كان يعبد القمر، ويتبع من كان يعبد الطواغيت، ﴾[280] واتە : الله تعالى خەڵکی لە ڕۆژی قیامەت کۆ دەکاتەوە و دەفەرموێت هەر کەسێک شتێکی پەرستوە

---

[279] الجمعة: ١

[280] رواه البخاري برقم: ٧٤٣٧ ، و وراه مسلم برقم: ١٨٢

ئەوا با دوای بکەوێت ، جا ئەوەی خۆر ی پەرستەوە دوای خۆر دەکەوێت ، وە ئەوەی کە مانگ ی پەرستوە دوای مانگ دەکەوێت ، وە ئەوەی طاغوت ی پەرستوە دوای طاغوت دەکەوێت.›

جا دیقەت بدە پێغەمبەر ﷺ کەباسی پەرستنی مانگ و خۆر دەکات بەناوی خۆیانەوە ناویان دێنێ ، لەکاتێک دا پێغەمبەر ﷺ لە دواتر دەفەرموێت ئەوەی طاغوەتانی پەرستوە شوێنی دەکەوێت ، جا بۆیە گەر خۆر و مانگ لە طاغوتەکان حساب بکرانایە و بە طاغوت دان بنرانایە ئەوە پێغەمبەر ﷺ بە جیا ناوی ئەوانی نە دەهێنا و بەناوی خۆیانەوە بانگی نەدەکردن ، کە خۆر و مانگە ،

جا بۆیە پێیان ناوترێت طاغوت و بەطاغوت دانانرێن و ناوی طاغوتیان لێ نانرێت ،

جالێرە پرسیارێک دروست دەبێت کە ئەویش ئەوەیە کە ئایە گەر خۆر و مانگ و مشک و مانگا ناوی طاغوتیان لێ نەنرێت و بەتاغوت حساب نەکرێن ، ئەی چ حوکمێکیان هەیە و چیان بەرامبەر دەکرێت ؟؟،

لە وڵامدا ئەوەیە کە ئێمە بێباوڕ دەبین پێیان و خۆمان لە خۆر و مانگ و مانگا و مشک و ئەستێرە بەری دەکەین و بڕوایان پێ ناهێنن کە ئەوان شایەنی پەرستن بن و بپەرسترێن لە غەیری الله تعالی ، وە بەڵگەش لەسەر ئەوە وتەکەی پێغەمبەر ابراهیم ە ( علیه السلام ) کاتێک قەومەکەی خۆر و مانگ و ئەستێرەیان دەپەرست ئەویش خۆی لێیان بەری کرد ، وەک الله تعالی بۆمان باس دەکات و دەفەرموێت ﴿ وَإِذ قالَ إِبراهيمُ لِأَبيهِ آزَرَ أَتَتَّخِذُ أَصنامًا آلِهَةً إِنّي أَراكَ وَقَومَكَ في ضَلالٍ مُبينٍ – وَكَذلِكَ نُري إِبراهيمَ مَلَكوتَ السَّماواتِ وَالأَرضِ وَلِيَكونَ مِنَ الموقِنينَ – فَلَمّا جَنَّ عَلَيهِ اللَّيلُ رَأى كَوكَبًا قالَ هذا رَبّي فَلَمّا أَفَلَ

قالَ لا أُحِبُّ الآفِلينَ – فَلَمّا رَأَى القَمَرَ بازِغًا قالَ هذا رَبّي فَلَمّا أَفَلَ قالَ لَئِن لَم يَهدِني رَبّي لَأَكونَنَّ مِنَ القَومِ الضّالّينَ – فَلَمّا رَأَى الشَّمسَ بازِغَةً قالَ هذا رَبّي هذا أَكبَرُ فَلَمّا أَفَلَت قالَ يا قَومِ إِنّي بَريءٌ مِمّا تُشرِكونَ – إِنّي وَجَّهتُ وَجهِيَ لِلَّذي فَطَرَ السَّماواتِ وَالأَرضَ حَنيفًا وَما أَنا مِنَ المُشرِكينَ ﴾[281] واتە : وە کاتێک ئیبراهیم بە ئازەری باوکی وت: ئایا ڕاستە چەند بتێک بکەیتە خوا؟! بەڕاستی من دەبینم تۆش و قەومەکەشت لەناو گومڕاییەکی ئاشکرادان. – بەو شێوەیەش دەسەڵاتی تۆکمەمان لە ئاسمانەکان و زەویدا نیشانی ئیبراهیم دەدەین بۆ ئەوەی بەڵگە بەدەست بێت و لە ڕیزی دڵنیاکاندا بێت. – ئینجا کاتێک شەو باڵی کێشا بەسەر ئیبراهیمدا ئەستێرەیەکی (گەشی گەورەی)بینی، بۆیە وتی: ئاگاداربن، وادابنێین ئەمە پەروەردگارمە، کاتێک ئەستێرەکەی لێ ئاوا بوو وتی: من شتی لەبەرچاو ون بووم خۆش ناوێت و ناپەرستم. – ئینجا کاتێک مانگی بینی هەڵهات، وتی: ئاگاداربن، وادابنێین ئەمەیان پەروەردگارمە، کاتێک ئەویش ئاوا بوو وتی: سوێند بێت بە الله ئەگەر پەروەردگارم هیدایەتی نەدامایە، ئەوە بێگومان لە ڕیزی دەستەی گومڕاکاندا دەبووم. – ئینجا کاتێک خۆری بینی هەڵهات، وتی: ئاگاداربن، وادابنێین ئەمەیان پەروەردگارمە، ئەمە گەورەتریشە کاتێک ئەویش ئاوابوو وتی: ئەی خەڵکینە، ئەی خزمینە، بەڕاستی من بەریم لەو شتانەی ئێوە کردووتانە بەهاوەڵ و شەریک (بۆ پەروەردگار). – بەڕاستی من ڕووی خۆم و دڵم لە پەرستندا کردۆتە ئەو زاتەی ئاسمانەکان و زەوی فەراهەم هێناوە، لەکاتێکدا ڕووم لەهیچ شتێکی ترناکەم، بەدڵئارامی تەواویشەوە (دەڵیم کە): هەرگیز من لە ڕیزی موشریک و هاوەڵگەراندانیم.›

[281] [الأنعام: ٧٤ – ٧٩]

جا دیقەت بدە پێغەمبەر ابراهیم علیه السلام خۆی بەریکرد لە خۆر و مانگ و ئەستێرە ، وە ئێمەش دەبێت ئاوا بین و کارەکەی ئەوو دوو بارە بکەینەوە ،

وە لە جێگاکی تر پێغەمبەر ابراهیم بە قومەکەی خۆی کە خۆر و مانگ و ئەستێرەیان دەپرست لەگەڵ بتەکان ، پێیان دەفەرموێت ﴿ إِنَّا بُرَآءُ مِنْكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ ﴾ [282] واتە : ئێمە بەرین لە ئێوە و لەو شتانەش کە لەجیاتی الله تعالی دەیپەرستن، ئێمە باوەڕمان بەو دین و ئاینەی ئێوە نیە.›

جا بۆیە ئێمەش پێیان بێ باوڕ دەبین و بەری دەبین لێیان و عیبادەتیان بۆ ناکەین ،

بەڵام کەسێک کە ڕازیە بپەرسترێت ئەوە پێی دەوترێت طاغوت ،

[82]سێیەم : هەر کەسێک بانگی خەڵکی بکات بۆ ئەوەی بیپەرستن ،

❁ ڕوونکردنەوە ❁

هەر کەسێک داوای ئەوە بکات کە خەڵکی بیپەرستن یان خۆی بە خوا نیشان بدات و بانگەشەی خوایەتی بۆ خۆی بکات ، یان چەند سیفەتێکی تایبەتی الله تعالی بۆ خۆی بانگەشە بکات و بۆخۆی دابنێت ، وەک بڵێت من باران دەبارێنم یان من شیفاتان دەدەم ، یان بڵێت داوای باران بارینم لێبکەن یان بڵێت داوای شفادانم لێبکەین ، یان غەیری ئەو دوو سیفەتە هەر سیفەتێکی تایبەتی الله تعالی بێت و ئەو کەسەش بانگەشی بکات بۆ خۆی ئەوە ئەوکەسە بریتیە لە طاغوت ،

بەڵگەش بەسەرهاتی پێغەمبەر موسا علیه السلام و فیرعەوەنە کە الله تعالی باسی دەکات و دەفەرموێت ﴿ هَل أَتاكَ حَديثُ موسى – إِذ ناداهُ رَبُّهُ بِالوادِ

[282] [ الممتحنة: ٤ ]

المُقَدَّسِ طُوًى – اذهَب إِلى فِرعَونَ إِنَّهُ طَغى – فَقُل هَل لَكَ إِلى أَن تَزَكّى – وَأَهدِيَكَ إِلى رَبِّكَ فَتَخشى – فَأَراهُ الآيَةَ الكُبرى – فَكَذَّبَ وَعَصى – ثُمَّ أَدبَرَ يَسعى – فَحَشَرَ فَنادى - فَقالَ أَنا رَبُّكُمُ الأَعلى ﴾ [283] واته : ئايا داستانی مووسات پێ گەیشتووە. – كاتێک كەپەروەردگاری بانگی كرد لەشیووی پیرۆزی طووا وە. – پێ ی وت بڕۆ بۆ سەر فیرعەون(چونكە) بەڕاستی یاخی بووە. – وە پێ ی بڵێ: ئایا دەتەوێ پاک ببیتەوە لە گوناە. – وە ڕێت نیشاندەم بۆ(ناسینی) پەروەردگارت تا لێی بترسیت. – ئینجا نیشانە هەرە گەورەكەی نیشان دا. – كەچی بە درۆی زانی و سەرپێچی كرد. – لە پاشان پشتی هەڵكرد و ڕۆی بەپەلە. – ئینجا(جادوو گەرانی) كۆكردەوەو بانگی كردن و. – وتی: من پەروەردگاری هەرە گەورەتانم.›

جا الله تعالى پێغەمبەر موسای نارد بۆ لای فیرعەون ، وە پێشی فەرموو كە فیرعەون سنوری بەزاندوە و كوفری كردوە و دەرچوە لە سنوری بەندایەتی بۆ سنوری خوایەتی ،

وە الله تعالى هەوڵمان پێدەدات لەسەر سنور بەزاندنەكەی فیرعەون كە سنور بەزاندنەكەی چیبوە چی كردوە ، الله تعالى باسی دەكات و دەفەرموێت ﴿ فَقالَ أَنا رَبُّكُمُ الأَعلى ﴾ واتە : (فیرعەون) وتی: من پەروەردگاری هەرە گەورەتانم.›

جا فیرعەون وتی من پەروەدرگاری ئێوەم ، وە الله تعالى قسەی فیرعەون و كارەكەی بە سنور بەزاندن و طوغیان ناو برد و حسابی كرد ،

جا هەر كەسێک بڵێت من خوام ، یان سیفەتێكی تایبەتی الله تعالى بۆخۆی دابنێت ، یان بانگەشەی بۆ بكات ئەوە بە طاغوت حساب دەكرێت چونكە سنوری بەندایەتی بەزاندوە و ڕۆشتوە بۆ سنوری خوایەتی ، وە لە پێناسەی

---

[283] [ النازعات: ١٥ – ٢٤ ]

طاغوت باسمان کرد کە طاغوت لە طوغیانەوە هاتوە کە بەمانای سنور بە زاندن دێت ، جا ئەو سنور بە زاندنە ئەوەیە کە بەندە لەسنوری خۆی دەردەکات بۆ سنوری خوایەتی ، جا هەر کەسێک سنوری بەندایەتی ببەزێنێت وەک فیرعەون کە وتی من خوام ، ئەوە پێی دەوترێت طاغوت ،

وە مەرج نیە هەمان قسەی فیرعەون بڵێت (کە وتی من خوام) انجا پێی بوترێت طاغوت ، بەڵکو هەر کەسێک هەر کات وتی من ڕزقتان دەدەم ، یان من شیفاتان دەدەم یان من منداڵتان پێ دەبەخشم ، یان بڵێت من حوکم و بڕیارا و حەڵاڵ و حەڕامتان بۆ دیاری دەکەم و دادەنێم ، یان هەر سیفەتێکی تایبەتی الله تعالی بۆ خۆی دانا ، یان بانگەشەی کرد بۆ خۆی ئەوە ئەو کەسە بوە بەطاغوت چونکە بانگەشەی ئەوەی کردوە کە ئەویش هاوشێوەی الله تعالی منداڵ دەدات بە خەڵک یان شیفای خەڵک دەدات یان ڕزقی خەڵک دەدات ،

وە لەم سەردەمەش ئەم طاغوتە لە ناو بەناو شێخە سۆفیەکان بڵاوە کە خۆیان بە ڕازق و شفادەری خەڵک دادەنێن و بەخەڵکی دەڵێن کە داوای شفا و ڕزقیان لێبکەن ،

وە جیاوازی نێوان طاغوتی دووەم سێیەم ئەوەیە کە دووەم بانگەشە ناکات بۆ پەرستنی خۆی بەڵکو تەنها ڕازیە و لای ئاساییە کە بپەرسترێت ، بەڵام طاغوتی سێیەم بانگەشەی ئەوە دەکات کە خوایە یان هاوشێوەی خوایە ، پەنابە الله ،

[83]چوارەم : هەر کەسێک بانگەشەی زانینی زانستی شارەوە (الغیب) بکات،

۞ **ڕوونکردنەوە** ۞

هەر کەسێک بانگەشەی ئەوە بکات کە زانستی غەیب دەزانێت لە غەیری الله تعالى ئەوە ئەوکەسە تاغوتە ، الله تعالى ئەوەی ڕاگەیاندوە و کۆتایی پێهێناوە کە کەس غەیب نازانێت تەنها خۆی نەبێت ، وەک فەرموویەتی ﴿ قُل لا يَعلَمُ مَن فِي السَّماواتِ وَالأَرضِ الغَيبَ إِلَّا اللَّهُ وَما يَشعُرونَ أَيّانَ يُبعَثونَ ﴾ [284]واتە : بڵێ کەسانێ کە لە ئاسمانەکان و زەوی دان غەیب نازانن بێجگە لە الله تعالى (تەنها ئەو دەیزانێ) و ئەوان هەست ناکەن چ کاتێ زیندوو دەکرێنەوە.»

لەم ئایەتە بەسێ شێوە ئەوە یەکلا دەبێتەوە کە کەس غەیب نازانێت تەنها الله تعالى نەبێت ،

شێوەی یەکەم الله تعالى فەرموویەتی ﴿ قُل لا يَعلَمُ مَن فِي السَّماواتِ وَالأَرضِ الغَيبَ ﴾ ئەمە بەشە ئەوە ڕون دەکاتەوە کە کەس غەیب نازانێ ،

شێوەی دووەم الله تعالى فەرموویەتی ﴿ إِلَّا اللَّهُ ﴾ ئەم بەشەش دڵنیایی ئەوە دەدات کە تەنها الله تعالى غەیب دەزانێت و خەڵک نای زانێت ،

شێوەی سێیەم الله تعالى فەرموویەتی ﴿ وَما يَشعُرونَ أَيّانَ يُبعَثونَ ﴾ وە خەڵکی هەست بەوە ناکەن کە کەی زیندوو دەکرێنەوە ، جا زیندوو کردنەوە لەو شتانەیە کە شاراوەیە و زانستی غەیبە ، وە خەڵکی هەستی پێناکات ، بۆیە مانای ئەوەیە کە غەیب نازانن ، چونکە گەر بیان زانی با ئەوە هەستیان دەکرد کەی دەمرن و زیندوو دەبنەوە ،

جا هەر کەسێک بانگەشەی ئەوە بکات کە غەیب دەزانێت ئەوە دوو سنوری بەزاندوە ،

[284] [ النمل: ٦٥ ]

سنوری یەکەم : ئەوەیە کە لە سنوری ئیمان دەرچوە بۆ کوفر ، چونکە وتەی الله تعالی بە درۆ زانیوە کە الله تعالی دەفەرموێت کەس غەیب نازانێت ، وە ئەویش دەڵێن من غەیب دەزانم ، وە ئەمەش بەدرۆ نیشاندانی وتەی الله تعالی یە بۆیە پێی کافر دەبێت و لەسنوری ئیمانەوە بۆ کوفر دەڕوات ،

سنوری دووەم : ئەوەیە کە لە سنوری بەندایەتیەوە دردەچێت بۆ سنوری خوایەتی ، چونکە ئەوە یەکلا بۆتەوە کە بەندەکان غەیب نازانن تەنها الله تعالی دەیزانێت ، جا ئەوەی دەڵێت من غەیب دەزانم ئەوە خۆی بە خوا نیشان داوە و وا خۆی خساب دەکات کە خوایە ، وە ئەمەش دەرچونە لە سنوری بەندایەتی بۆ سنورر خوایەتی ،

جا هەر کەسێک کە سنوری بەندایەتی ببەزێنێت بۆ سنوری خوایەتی ئەوە یەکێکە لە طاغوتەکان ، وە لێرە پێویستە چەند شتێک ڕوون بکەینەوە

کە ئایە هەر کەسێک شتێکی وت وە شتەکەی لە غەیب بوو ئایە ئەو کەسە دەبێت بەطاغوت ؟؟،

وڵام ، قسەکردن لە غەیب بە دوو شێوە هەیە

یەکەم : ئەوەیە لەلایان الله تعالی ـەوەیە ، کە الله تعالی چەند شتێکی پێوتوە لە غەیب وەک پێغەمبەر کە الله تعالی چەند شتێکی دیاری کراوی پێ وتوە کە غەیبن ،

الله تعالی فەرموویەتی ﴿ عالِمُ الغَيبِ فَلا يُظهِرُ عَلى غَيبِهِ أَحَدًا – إِلّا مَنِ ارتَضى مِن رَسولٍ فَإِنَّهُ يَسلُكُ مِن بَينِ يَدَيهِ وَمِن خَلفِهِ رَصَدًا - لِيَعلَمَ أَن قَد أَبلَغوا رِسالاتِ رَبِّهِم وَأَحاطَ بِما لَدَيهِم وَأَحصى كُلَّ شَيءٍ عَدَدًا ﴾[285]واتە : هەر الله تعالی

[285] [الجن: ٢٦ – ٢٨ ]

یە زانا بە نهێنیەکان وە کەس ئاگادار ناکات بەسەر نهێنی خۆیدا. – مەگەر پێغەمبەرێکی کە لێی ڕازی بێ جا بێگومان الله دەنێرێ لە بەردەمی و پشتی یەوە پاسەوان لە فریشتە. – تا بزانێ کە سرووشی الله تعالی یان گەیاندووە وە الله تعالی ئاگادارە بەوەی کە لایانە وە هەموو شتێکی هەڵژماردووە بە هەڵژماردن.›

جا ئەم زانستی غەیبە لەلایان الله تعالی ەوە دراوە بە پێغەمبەران کە ئەوەش هەر بۆ الله تعالی دەگرێتەوە ، وە پێغەمبەران گەر الله تعالی زانستی غەیبان پێنەڵێت ئەوە ئەوانیش نازانن وەک لە فەرموودەکەی عمری کوڕی خەطاب جوبرائیل پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد وە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی من و تۆش نایزانین ، جا ئەمە بەڵگەیە کە ئەو زانستەی بە پێغەمبەران بە خشراوە لەلایان الله تعالی ەوە ئەوە زانستێکی سنور دار و دیاری کراوە ،

جا ئەم شێوەیان دروستە کە پێغەمبەران هەندێک لە زانستی غەیب دەزانن کە ئەویش الله تعالی خۆی پیانی وتوە و زانستەکە سنور دارە ،

وە نمونەی ئەمەش الله تعالی چەندین شتی غەیبی بە پێغەمبەری ئێمە فەرمووە وەک لە نیشانەکەی ئاخیر زەمان چەندین شتی تر ، جا ئەمەکێشەی تێدانیە و خاوەنەکەی نابێت بە تاغوت ،

وە هەر کەسێک کە باسی ئەو فەرموودانەی پێغەمبەر ﷺ دەکات و دەڵێت لە ئاخیر زەمان دەجال دێت ، جا ئەم کەسە نابێت بە طاغوت چونکە ڕاستە دەجال دێت ، وە ئەم زانستە لەلایان الله تعالی ەوە بە پێغەمبەر دراوە ، وە ئەم کەسەش لە پێغەمبەر ﷺ ەوە دەی گێڕێتەوە ، وە ئەمەش هەر دەگەڕێتەوە بۆ زاستی الله تعالی ،

دووەم : ئەوەیە کە کەسێک لە خۆیەوە بانگەشەی غەیب دەکات ، وەک دەڵێت ساڵێکی تر وشکەساڵی ڕوودەدات یان دەڵێت تۆ لە فڵان ساڵ مندالًت دەبێت ، یان دەڵێت سبەی فڵانە کەس دەمرێت ،

وە ئەم بانگەشە کردنە چەند جۆرێکی هەیە

یەکەم : گەر کەسەکە بەدڵنیایەوە قسەکەی کرد نەک بە گومانەوە ، بۆ نمونە کەسێک دەڵێت لەوەیە سبەی فڵانە کەس بمرێت ئەمڕۆ لەلای بوم حاڵی زۆر شڕ بوو ، جا ئەمە خاوەنەکەی نابێت بە طاغوت چونکە بە گومان وای وتوە نەک بە دڵنیایەوە

دووەم : گەر باسەکە لەسەر شتێک بێت کە ئاشکرایە و سەر ئەنجامەکەی دیارە ، بۆ نمونە دوو کەس لە ژورێکن وە لە ژورەکە وایەرێکی کارەبای لێیە ، کەسی یەکەم بەوەی دووەم دەڵێت وریابە دەست لەو وایەرە نەدەیت کارەبا دەتگرێ ، جاکەسی یەکەم بەمە نابێت بەطاغوت ، چونکە شتەکە ئاشکرایە کە کارەبا خەڵک دەگرێت ، بۆیە ناتوانی بڵێی تۆ بوی بە طاغوت چونکە وتت کارەبا دەتگرێ و بانگەشەی زانستی غەیبت کردوە ،

سێیەم : گەر شتەکە نیشانەی هەبێت ، بۆ نمونە لە وەرزێکی زستان دا دونیا هەورێکی چڕ و توندی هەیە گەر کەسێک بڵێت سبەی بارانە إِنْ شَاءَ اللّٰه ، ئەوە کەسەکە نابێت بە طاغوت ، چونکە لەوەزی زستاندا باران دەبارێت ، وە هەوریش نیشانەی باران بارینە ، وە کەسەکە قسەکەی پەیوەست کرد بەویستی اللّٰه تعالی ەوەکە وتی گەر اللّٰه تعالی ویستی لێبێت ،

چوارەم : گەر شتەکە دوو بارە بونەوەی تێدابیت ، بۆ نمونە کەسێک هەموو ڕۆژێک لە دوکاندایە و دەچێت بۆ دوکانێک ، گەر کەسێک پرسیار بکات بڵێ

فڵانە کەس چۆن بدۆزمەوە ؟؟ گەر کەسێک پێی بڵێ برۆ فڵانە دوکان ئەو هەموو ڕۆژێک دەچێتە ئەوێ ، جا ئەم کەسەی کە وتی هەموو ڕۆژێک دەچێتە ئەوێ ئەوە نابێت بە طاغوت ، چونکە قسەکەی ڕاستە کە کەسەکە هەموو ڕۆژێک دەچێت بۆ ئەوێ ،

جا گەر بەم چوار شێوەیە بوو ئەوە خاوەنەکەی نابێت بە طاغوت ،

بەڵام گەر کەسێک بەکەسێکی تری وت تۆ فڵانە ساڵ منداڵێکی کوڕت دەبێت ، وە قسەکەی بە دڵنیایەوە کرد و پەیوەستی نەکرد بە ویستی اللّه تعالی ـەوە وەک بڵێت إنْ شَاءَ اللّه ، ئەوە دەبێت بە طاغوت ، وە یان کەسێکی تر وتی فڵانە ساڵ وشکە ساڵی ڕوو دەدات وە قسەکەی بە دڵنیایەوە کرد و پەیوەستی نەکرد بە ویستی اللّه تعالی ـەوە وەک بڵێت إنْ شَاءَ اللّه ئەوە دەبیت بە طاغوت، وە یان کەسێک وتی تۆ فڵانە ساڵ ژنێکی جوانت توش دەبێت و زەواجی لەگەڵ دەکەی بەڵام ژنەکە ژنێکی توڕەیە ، وە قسەکەی بە دڵنیایەوە کرد و پەیوەستی نەکرد بە ویستی اللّه تعالی ـەوە وەک بڵێت إنْ شَاءَ اللّه ، ئەوە دەبێت بە طاغوت ،

اللّه تعالی فەرموویەتی ﴿ إِنَّ اللَّهَ عِندَهُ عِلمُ السّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الغَيثَ وَيَعلَمُ ما فِي الأَرحامِ وَما تَدري نَفسٌ ماذا تَكسِبُ غَدًا وَما تَدري نَفسٌ بِأَيِّ أَرضٍ تَموتُ إِنَّ اللَّهَ عَليمٌ خَبيرٌ ﴾[286] واتە : بەڕاستی تەنها لای خوایە زانیاری (کاتی هاتنی) ڕۆژی دوایی وە هەر خوا باران دەبارێنێ تەنها خوا دەزانێ بەوەی لە منداڵدانی( دایکان) دایە وە هیچ کەس نازانێ سبەینێ (لە داهاتوودا) چی دەکات وە هیچ کەس نازانێ لە چ شوێن و زەوی یەك دا دەمرێ بەڕاستی خوا زاناو ئاگادارە.›

جا هەر کەسێک قسەی لەم پێنج شتە کرد کە

[286] [لقمان: ٣٤]

یەکەم : دیاری کردنی هاتنی ڕۆژی قیامەت

دووەم : دیاری کردنی باران بارین

سێیەم : مندالْ بوون

چوارەم : قسەکردن لە داهاتوو

پێنجەم : مردنی خەڵکی

وە بە دڵنیاوە کردی و پێداگر بوو لەسەری ئەوە دەبێت بەطاغوت ،

جا ئەم طاغوتە نمونەی فاڵچی و قاوە گرەوەکانە کە باسی بەخت و زەواج دەکەن ،

**[84]** پێنجەم : هەر کەسێک حوکم بە پێچەوانەی دینی الله تعالی بکات،

**❁ ڕوونکردنەوە ❁**

هەر کەسێک یان هەر حاکمێک کە بە پێچەوانەی دینی الله تعالی حوکم بکات ئەوە یەکێکە لە طاغوتەکان و بە تاغوت حساب دەبێت ،

الله تعالی دەفەرموێت ﴿ أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ۚ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴾[287] واتە : ئایا ئەوانە حوکم و فەرمانڕەوایی جاهیلیەت و نەفامیان دەوێت و ئەویان لاپەسەندە؟! (ئاخر بۆ بیرناکەنەوە) کێ هەیە بەقەدەر الله حوکمی جوان و چاک و بەجێ بێت، (بەتایبەت) لای ئەو کەسانەی کە بەوردیی سەرنج دەدەن و ویژدان و هەستی زیندوویان هەیە.›

[287] [ المائدة: ٥٠ ]

مــتــن

وَالدَّلِيلُ قَوْلُهُ تَعَالَى: (لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىَ لاَ انفِصَامَ لَهَا وَاللّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ) [البقرة: 256].وَهَذَا هُوَ مَعْنَى لا اله إلا اللهُ، وَفي الْحَدِيثِ: ( رَأْسُ الأَمْرِ الإِسْلامِ، وَعَمُودُهُ الصَّلاةُ، وَذِرْوَةُ سَنَامِهِ الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللهِ).[85]وَصَلَّى اللهُ علَى مُحَمَّدٍ وَعلى آله وَصَحْبِهِ وَسَلَّمَ

ئەم ئایەتە بەڵگەیە کە هەرچی حوکمێک هەیە لە غەیری حوکمی ﷲ تعالی ، ئەوە حوکمی جاهیلیە و خاوەنەکەی طاغوتە ،

شیخ عبدالرحمان السعدي (رحمه الله) فەرموویەتی ﴿ كل من حكم بغير شرع الله ، فهو طاغوت ﴾[288]واتە : هەر کەسێک حوکم بە غەیری دینی ﷲ تعالی بکات ، ئەوە طاغوتە.›

جا لەم سەردەمەش دا ئەم طاغوتانە زۆرن کە حوکم بە پێچەوانەی دینی ﷲ تعالی دەکەن و حەڵاڵەکان حەڕام دەکەن و حەڕامەکان حەڵاڵ دەکەن ، جا هەر کەسێک حوکم بە پێچەوانەی دینی ﷲ تعالی بکات لەکاتێک دا کە دەزانێ پێچەوانەی دینی ﷲ تعالی یە ئەوە طاغوتە ، نمونەی پەرلەمانتارەکان و حاکمەکان کە بە پێچەوانەی دینی ﷲ تعالی حوکم دەکەن ،

[٨٥]وە بەڵگەش وتەی ﷲ تعالی یە کەفەرموویەتی : بە هیچ جۆرێک زۆر لێ کردن لە دیندا نی یە (بۆ هاتنە ناو ئیسلام) چونکە بەڕاستی لە یەک جیابۆتەوە ڕێنموونی و شارەزایی لە گومڕایی و سەر لێ شێواویی (ئەم ئایەتە تایبەتە بە ئەوانەی ئایینی ئاسمانیان هەیە) ، جا هەر کەسێک بێباوەڕ بێت بە طاغوت وە بڕوا بهێنێ بە ﷲ تعالی ئەوە بێگومان بە توندی دەستی گرتووە بە

[288] [ تيسر الكريم الرحمن : جا صـ٣٦٣ ]

دەستەگیرەیەكی قایمی بەهێزی وا (كە ئیسلام، یان ئیمانەكەیەتی) كە پچڕان و بەربوونی بۆ نی یە وە الله بیسەری زانایە.›

وە ئەمە بریتیە لە مانای لااله الا الله ، وە لە فەرموودەش هاتوە سەری دین ئیسلامە ، وە عامودەكەی (كۆڵەگە) نوێژە ، وە چڵە پۆپەی جیهاد كردنە لە پێناو الله تعالى ،

﴿ ڕوونكردنەوە ﴾

شیخ رحمه الله ئەم ئایەتەی هێناوە بە بەڵگەی لەسەر كوفر كردن بە طاغوت،

ئەم ئایەتە لە مەدینە دابەزیوە هۆكاری دابەزینەكەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی كە لە مەدینە جولەكە و بت پەرست هەبوون جا بت پەرستەكان منداڵەكانیان دەناردە لای جولەكەكان تا فێری خوێندنەوە و نوسین ببن و فێری دین بن ، جا كاتێك كە پێغەمبەر ئەوان ویستان منداڵەكانیان لای خۆیان بن و موسڵمان بن بەڵام ئەوان حەزیان پێنەدەكرد انجا الله تعالى ئایەتی دابەزاند فەرمووی ﴿ لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ ﴾ زۆر كردن نیە لە دین دا ، جا مەبەست لەوەیە كە بە زۆر دینیان بەسەر دا نادرێت ، جا ئەمە تەنها بۆ ئەهلی كتابە كە جولەكەو گاورن ، بۆ غەیری ئەوان نیە بەڵكو دەبێت یان موسڵمان بن یان دەكوژرێن ، وە ئەم ئایەتەش نسخ كراوە بە ئایەتی قیتال ، جا بۆیە بۆ ئەهلی كتاب یش دەبێت یان جزیە بدەن یان دەكوژرێن بەڵام بۆ ئەهلی كتاب جزیە نیە بەڵكو یان موسڵمان بوون یان دەكوژێن ،

وە هەندێك لە خەڵكی دور لە دین و ماستاو چی و دین فرۆش هەمیشە ئەم ئایەتەیان لەسەر زمانە و دەیڵێنەوە بۆ رازی كردنی دڵی خەڵكی بەڵام لەڕاستی دا گەر لەم ئایەتە بكۆڵیتەوە و سەیری بكەیت ئەوە زۆر چاك كە مەبەستی

ئایەتەکە و مەبەستی ئەوان زۆر لێک دورن ، جا ئەم کەسانە هەندێکی بۆ ئەوە خۆیان داوەتە پاڵ ئەم ئایەتە تا وڵامیان پێ بێت بۆ دووژمنانی ئیسلام کە دەڵێن دینی ئیسلام ئازادی تێدا نیە ،

جا مولحید و دڵ نەخۆشەکان بەمە ڕەخنە لە ئیسلام دەگرن لە کاتێک دا لە جگە لە ئیسلام شتی تر لەم شێوە هەیە کە نمونەی یەزیدیە شەیتان پەرستەکان کە کەس قبوڵ ناکەن بێتە سەر دینەکەیان و هەر کەسیش دینەکەی خۆی بگۆڕێت ئەوە دەیکوژن بەڵام مولحیدەکان کاریان بەوان نیە بەڵکوو تەنها مەبەستیان دژایەتی کردنی ئیسلام و موسڵمانانە ،

وە لەڕاستی دا لە ئیسلام ئازادی هەیە بۆ مرۆڤ کە ئایە ئیسلامی قبوڵە یان نا چونکە نەبوونی ئازادی لە کەتێک دایە کە تۆ هیچ ڕێگاییێکت نەبێت تەنها ئەوە نەبێت کە بۆت داندراوە بەڵام لە ئیسلام تۆ یان موسڵمان دەبیت یانیش دەکوژرێی وە تۆش ئازادی لەم نێوانە دا ، دەتوانی لەم نێوانەدا یەکیان هەڵبژێری کە ئەمەش پێچەوانەی ناچر کردنە کە دژی ئازادییە ،

وە پاشان ئەم ئەرزە ئەرزی الله تعالى یە وە ئەم دروست کراوانەی لە خزمەتت دان وە تۆ خۆت بەندە و دروستکراوی الله تعالى ی ، کەواتا الله تعالى چۆنی بیەوێت ئاوا دەکات لە بەرامبەرت ، جا کە دینی بۆ ناردوی وە تۆ قبوڵت نییە و ڕەتی دەکەیتەوە ئەوە الله تعالى هەرچی بیەوێت دەتوانێت بەسەرت دا ئەنجامی بدات بەسەرت دا بدات ،

جا ئەم ئایەتە لەسەر ئەهلی کتابە کە ناکوژرێن بەڵکو جزیە دەدەن گەر موسڵمان نەبن ،

پاشان الله تعالى فەرموویەتی ﴿ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ ﴾ بەدڵنیایەوە الرشد لە اليغي جيابویەوە ،

الرشد : بریتیە لە هیدایەت و بەرچاو ڕۆشنی ، الله تعالى فەرموویەتی ﴿ قَالَ لَهُ مُوسَىٰ هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَىٰ أَنْ تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا ﴾ [289] واتە : مووسا بەو (بەندە صاڵحە) ی وت ئایا (هاوڕێ یەتیت بکەم و) شوێنت بکەوم بۆ ئەوەی فێرم بکەیت لەو زانیاریە ڕاستەی فێری بوویت.›

وەفەرموویەتی ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴾ [290] واتە : هەردەمێ بەندەکانی من پرسیاریان لێ کردیت دەربارەی من ئەوا بێگومان من لێیانەوە نزیکم گیرا دەکەم نزای نزاکاران هەرکاتێک هاوار و نزام لێبکەن دەی با ئەوانیش بەدەنگ منەوە بێن وە بڕوام پێ بهێنن بەڵکو ڕێ ی ڕاست بدۆزنەوە.›

وە فەرموویەتی ﴿ قُل أوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ استَمَعَ نَفَرٌ مِنَ الجِنِّ فَقالوا إِنّا سَمِعنا قُرآنًا عَجَبًا – يَهدي إِلَى الرُّشدِ فَآمَنّا بِهِ وَلَن نُشرِكَ بِرَبِّنا أَحَدًا ﴾ [291] واتە : ئەی محمد( ﷺ ) بڵێ: نیگام بۆ کرا کە بێگومان چەند کەسێك لە جنۆکە گوێیان گرت (لە قورئان خوێندنەوەم) ئینجا وتیان: بەڕاستی ئێمە قورئانێکی سەرسوڕهێنەرمان بیست. – ڕێنموونی دەکات بۆ ڕێ ی ڕاست ئێمەش باوەڕمان پێ کرد وە هەرگیز کەس ناکەین بە هاوبەشی پەروەردگارمان.›

الرشد بە مانای هیدایەت و بەر چاو ڕۆشنی و ڕێگای ڕاست دێت ،

[289] [ الكهف: ٦٦ ]
[290] [ البقرة: ١٨٦ ]
[291] [الجن: ١ – ٢ ]

الغي : بریتیە لە گومڕایی سەر لێشواوی و كوفر ، الله تعالی فەرموویەتی ﴿ سَأَصْرِفُ عَنْ آيَاتِيَ الَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَإِن يَرَوْا كُلَّ آيَةٍ لَّا يُؤْمِنُوا بِهَا وَإِن يَرَوْا سَبِيلَ الرُّشْدِ لَا يَتَّخِذُوهُ سَبِيلًا وَإِن يَرَوْا سَبِيلَ الْغَيِّ يَتَّخِذُوهُ سَبِيلًا ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَكَانُوا عَنْهَا غَافِلِينَ ﴾ [292] واتە : بەم زووانە لا ئەدەم و بەرگری ئەكەم لە نیشانە و بەڵگەكانم ئەوانەی كە خۆیان بە گەورە دائەنێن لەسەر زەوی دا بە ناهەق و ناڕەوا ئەوانە ئەگەر هەموو ئایەت و موعجیزەیەك ببینن باوەڕی پێ ناهێنن وە ئەگەر ئایینی ڕاست و دروست ببینن نایكەن بە ڕێباز و ئایینی خۆیان وە ئەگەر ڕێگەی گومڕایی و ئایینی چەوت ببینن دەیكەن بە ئایین و ڕێباز بۆ خۆیان هەموو ئەمانە لەبەر ئەوەیە كە بەڵگە و نیشانەكانی ئێمەیان بە درۆ دەزانی و هەمیشە بێ ئاگابوون لێیان.»

جا لە دوای ئەوەی الله تعالی فەرمووی هیدایەت و بەر چاوڕۆشنی ڕون بویەوە جیابویەوە لە گومڕایی و سەر لێواوی ، انجا فەرموویەتی ﴿ فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ﴾ جا هەر كەسێك بێباوەڕ بێت بەطاغوت وە ئیمانی تەواو بهێنی بە الله تعالی ئەوە بەدڵنیایەوە دەستی گرتوە بە پەتی توند و بەهێزەوە ،

الله تعالی لەسەرەتا فەرمووی ﴿ فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ ﴾ پاشان فەرمووی ﴿ وَيُؤْمِن بِاللَّهِ ﴾ جا ئەمە بەڵگەیە كە بەندە سەرەتا دەبێت بێباوەڕ بێت بە طاغوت انجا ئیمان بهێنی بە الله تعالی ، چونكە طاغوت و گومڕایی بیسیە بۆیە دەبێت سەرەتا خۆت لە پیسی گومڕایی پاك بكەیتەوە انجا پاك وەربگری كە ئیمان هێنانە بە الله تعالی و هیدایەتە ،

[292] [ الأعراف: ١٤٦ ]

جا چۆنیەتی بێباوەڕ بوو (کوفر کردن) بە طاغوت بریتیە لەوەی کە شیخ رحمە اللە ﴿ فەرموویەتی ﴿ أما صفة الكفر بالطاغوت ، أن تعتقد بطلان عبادة غير الله ، وتتركها ، وتبغضها ، وتكفر أهلها ، وتعاديهم ﴾ [293] واتە : وە سیفەتی بێباوڕ بون بە طاغوت بەوەیە کە بیرو باوەڕت وابێت کە عیبادەت کردن بۆ غەیری اللە تعالی پوچ و باطڵە ، وە وازی لێبێت ( مەبەست واز هێنانە لە عیبادەتکردن بۆ تاغوت ) ، وە ڕقت لێیان ببێتەوە بە دڵ وە بیان بوغزێنیت ، وە تەکفیری ئەهلەکەی بکەی ، وە دژایەتیان بکەیت .›

**یەکەم** : واجبە لەسەر کەسی موسڵمان کە بێباوەڕ بێت بەهەموو ئەوەی لە غەیری اللە تعالی داپەرسترێت ، جا گەر داربێت یان بەرد بێت یان شێخ بێت یان شەیتان بێت یان هەر پەرستراوێکی تر بێت ئەوە دەبێت کەسی موسڵمان بەپەرستراوی نەزانێت و بێباوڕ بێت پێی ، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی لەغەیری اللە تعالی دەپەرسترێت باطڵ و پوچە و پەرستراوێکی ناحەق و ناڕاستە وتەی اللە تعالی یە کەفەرموویەتی ﴿ ذلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ هُوَ الحَقُّ وَأَنَّ ما يَدعونَ مِن دونِهِ هُوَ الباطِلُ وَأَنَّ اللَّهَ هُوَ العَلِيُّ الكَبيرُ ﴾ [294] واتە : ئەمە لەبەر ئەوەیە بەڕاستی هەر خوا هەق و ڕاستە وە بێگومان ئەوەی جگە لە اللە تعالی هاواری لێ دەکەن (دەیپەرستن) هەر ئەوە بەتاڵ و ناڕاست و بەڕاستی اللە تعالی هەر خۆی بەرزو بڵندو گەورەیە.›

وە اللە تعالی فەرموویەتی ﴿ فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ ﴾ جا هەر کەسێک بێباور بێت بە طاغوت ، جا ئەمەش خۆی بەڵگەیە کە کەس ئیماندار نابێت هەتاوەکو بێباوەڕ نەبێت بە طاغوت ،

[293] [ الدرر السنية : جا – صـ١٦٣ ]
[294] [ الحج: ٦٢ ]

وە دەبیت بەسێ شت بێباوڕ بێت بەتاغوت ،

یەکەم : بەدڵ و بیرو باوەڕی کە دەبێت بڕوای پێی نەبێت و بەڕاستی نەزانێت بەڵکو بە پوچ و باطڵی بزانێت ،

دووەم : بە زمان و وتە ، کە دەبێت دەری بڕێت و ئەوە بڵێت کە ئەو طاغوتانە پوچ و باطڵن ،

سێیەم : بەکردەوە و ئەندامەکانی لاشە ، کە نەیپەرستێت و عیبادەتی بۆ نەکات و نزیکی نەبێتەوە ،

وە بەم سێ شێوەیە بێ باوەڕ دەبێت بەرامبەر بە سێ شت

یەکەم : بەرامبەر بە طاغوتەکە و ئەوەی لە غەیری الله تعالى دەپەرسترێت ،

دووەم : بەرامبەر بەوەی کە عیبادەت بۆ غەیری الله تعالى ئەنجام بداریێ ،

سێیەم : وە بێباوەڕ بێت بەرامبەر بەو خەڵکەی کە ئەو طاغوتانە دەپەرستن و بڕوای بەو کار و کردەوانەیان نەبێت کە بۆ طاغوتەکانی ئەنجام دەدەن لە غەیری الله تعالى ،

**دووەم** : وە پێویستە کەوا وازی لە طاغوتەکە بێنێت و دور بکەوێتەوە لێی ، خۆی لێ بەدور بگرێت ، الله تعالى فەرموویەتی ﴿ وَلَقَد بَعَثنا في كُلِّ أُمَّةٍ رَسولًا أَنِ اعبُدُوا اللَّهَ وَاجتَنِبُوا الطّاغوتَ ﴾[295] واتە : سوێند بە الله لەناو هەموو گەل و ئوممەتێکدا پێغەمبەرێکمان ناردووە بەمەی تەنها الله تعالى بپەرستن و دووركەونەوە لە (پەرستنی) هەر پەرستراوێکی تر.›

[295] [ النحل: ٣٦ ]

اللّٰه تعالی فەرمانی کردوە بە دور کەوتنەوە لە طاغوت و پەرستراوە باطڵ و پوچەکان ، وەی اللّٰه تعالی موژدە دەدات بەو بەندانەی کە خۆیان درو گرتوە لە طاغوت ، وەک اللّٰه تعالی فەرموویەتی ﴿ وَالَّذينَ اجتَنَبُوا الطّاغوتَ أَن يَعبُدوها وَأَنابوا إِلَى اللَّهِ لَهُمُ البُشرى فَبَشِّر عِبادِ ﴾ [296] واتە :جا ئەوانەی کە خۆیان دوورە پەرێز گرتووە لە هەموو ئەو شتانەی خەڵکی دەیپەرستن، جگە لە اللّٰه تعالی و بەتەوبە و پەشیمانیەوە گەڕاونەتەوە بۆ لای اللّٰه ، مژدەی سەرکەوتن و سەرفرازی و بەختەوەری و کامەرانی بۆ ئەوانەیە، دە مژدە بدە بەو بەندانەم.›

وە خۆ دوور گرتن لە پەرستراوە پوچ و باطڵەکان و سیفەتی پێغەمبەران و پیاوچاکان بوە وەک اللّٰه تعالی فەرموویەتی ﴿ فَلَمَّا اعتَزَلَهُم وَما يَعبُدونَ مِن دونِ اللَّهِ وَهَبنا لَهُ إِسحاقَ وَيَعقوبَ وَكُلًّا جَعَلنا نَبِيًّا ﴾ [297]واتە : وا من دوور دەکەومەوە و کەنارگیری دەکەم، لە ئێوە و لەو شتانەی کە لەجیاتی اللّٰه دەیپەرستن، من تەنها هاناو هاوار بۆ پەروەردگارم دەبەم و هەر ئەو دەپەرستم، ئومێدەوارم کە پەروەردگارم نائومێد و ڕەنجەڕۆم نەکات و دوعاو نزاو پەرستنم لێ وەربگرێت.›

وە فەرموویەتی ﴿ وَإِذِ اعتَزَلتُموهُم وَما يَعبُدونَ إِلَّا اللَّهَ فَأووا إِلَى الكَهفِ يَنشُر لَكُم رَبُّكُم مِن رَحمَتِهِ وَيُهَيِّئ لَكُم مِن أَمرِكُم مِرفَقًا ﴾ [298] واتە : کاتێ ئێوە دوورە پەرێزیتان گرت لەوان و لەو (پەریستراو) انەش بێجگە لە اللّٰه دەیان پەرستن دە پەنا بە ئەشکەوتەکە بەرن پەروەردگارتان بڵاوی دەکاتەوە بۆتان بەزەیی و ڕەحمەتی خۆی و بۆتان فەراهەم دەهێنێ لەم کارەتاندا هۆی گوزەران و ژیانتان.›

[296] [ الزمر: ١٧ ]
[297] [ مريم: ٤٩ ]
[298][ الكهف: ١٦ ]

جابۆیە پێویستە لەسەر کەسی موسڵمان کە خۆی بە درو بگرێت لە هەموو پەرستراوێکی تر لە غەیری الله تعالی ، وە خۆی بەدوور بگرێت لەو کەسانەشی کە ئەو پەرستراوە باطڵە دەپەرستن ،

جا خۆ دور گرتن بەسێ شێوە دەبێت ،

یەکەم : بە دڵ و بیرو باوەڕ دور بکەوێتە لێیان لەگەڵیان نەبێت و مەیلی بۆیان نەبێت ،

دووەم : بە زمان و کردەوە کە باسیان نەکات بەباشە و لەگەڵیان نەبێت لەکار و کردەوەکانیان ،

سێیەم : وە بە کردەوە لاشەش دور بکەوێتەوە لێیان لە دوای ئەوەی کە بانگەوازی کردن بۆ تەوحید و ئیمان پاشان قبوڵیان نەکرد و پشتیان تێکرد ئەوە دەبێت وازیان لێبێنێت و دور بکەوێتە لێیان گەرتوانای هەبوو ،

وە دەبێت لە سێ شت درو بکەوێتەوە ،

یەکەم : لە طاغوتەکان

دووەم : لە طاغوت پەرستی و عیبادەت کردن بۆیان

سێیەم : لەو خەڵکەی کە عیبادەتی طاغوت دەکەن ، کەگەر ئیمانیان وەرنەگرت و ئەوە دەبیت لێیان دور بکەوێتەوە گەر توانای هەبوو ،

**سێیەم** : وە دەبێت ڕقت لێیابیێتەوە بە ڕق لێبونەوێیکی توند زۆر ، وەک پێغەمبەر ابراهیم کە کاتێک بەقەومەکەی خۆی فەرموو ﴿ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ

الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ ﴾[299] واتە : ئیتر دوژمنایەتی و ڕقەبەرایەتی لەنێوانماندا بەرپا بووە.›

جا لەسەر موسڵمانە كە ڕقی لە ئەشیرك و ئەهلی شیرك و طاغوتەكە بێت ،

وە ئەمەش بەسێ شێوە دەبێت

یەكەم : بەدڵ و بیرو باوەڕ كە ئەمەش بەوەی لە دڵە ڕقیانی لێبێت و بیان بوغزێنێت ،

دووەم : وە بەزمانیش دەری بڕێت كە ڕقی لێیانە و ڕقەكەی دەر ببڕێت بە پێی توانایی بێ لەكەم تەر خەمی ،

سێیەم : وە بەلاشە و كردەوەش ڕقی لێیان بێت بەپێی توانای بێ لەكەم تەرخەمی ،

وە ئەمەش دەبێت بەرامبەر بەسێ شت بكات

یەكەم : ڕقی لە طاغوتەكان بێت ،

دووەم : ڕقی لەوە بێت كە عیبادەت بۆ غەیری الله تعالی ئەنجام بدرێت ،

سێیەم : ڕقی لەو كەسانە بێت كە عیبادەت بۆ طاغوتەكان ئەنجام دەدەن ،

**چوارەم** : وە پێویستیشە كە تەكفیریان بكات و بە كافریان بزانێت وە ئەوەش بە سێ شێوە

یەكەم : بەدڵ بیروباوەڕ كە بە كافر و بێ باوڕیان بزانێت ،

دووەم : بە زمان و وتە

[299] [ الممتحنة: ٤ ]

سێیەم : بە ئەندامەکانی لاشە و کردەوە کە وەک کافر حسابیان لەگەڵ بکات و بەکافریان بزانێ ،

وە ئەمەش بەرامبەر بەسێ دوو شت دەکرێت ،

یەکەم : دەبێت طاغوتەکە بە کافر بزانیت حسابی کافری بۆ بکات ،

دووەم : دەبێت ئەو کەسانە بەکافر بزانیت کە عیبادەت بۆ طاغوتەکان دەکەن و دەیان پەرستن ،

الله تعالی فەرمانی بە تەکفیر کردنی موشریکان کردوە وەک فەرموویەتی ﴿ قُل يا أَيُّهَا الكافِرونَ – لا أَعبُدُ ما تَعبُدونَ – وَلا أَنتُم عابِدونَ ما أَعبُدُ – وَلا أَنا عابِدٌ ما عَبَدتُم – وَلا أَنتُم عابِدونَ ما أَعبُدُ – لَكُم دينُكُم وَلِيَ دينِ ﴾[300] واتە : بڵێ: ئەی بێ بڕوایینە. – من ئەو(بتان) ە ناپەرستم کە ئێوە دەی پەرستن. – وە ئێوەش ئەو(زاتەی) ە ناپەرستن کە من دەی پەرستم. – وەمن ئەو خوا پەرستی یە ناکەم کە ئێوە دەیکەن. – وە ئێوەش ئەو الله پەرستی یە ناکەن کە من دەیکەم. - ئایینی خۆتان بۆ خۆتان و ئایینی خۆم بۆ خۆم.،

بۆیە تۆش دەبێت بە موشریک بڵێی موشریک و بە بێباوڕ بڵێی بێاوەڕ وەک چۆن پێغەمبەر ﷺ وای بە قەومە موشریکەکەی خۆی وت ،

**پێنجەم** : دەبێت دژایەتیان بکەی بە سێ شێوە .

یەکەم : بەدڵ بیرو باوەڕ

دووەم : بە زمان و وتە بەوەی کە دژیان بوەستیتەوە ڕەدیان بدەیەتەوە . بەپێی توانات بێ لە کەمتەر خەمی ،

[300] [ الكافرون: ١ – ٦ ]

سێیەم : بە كردەوە و ئەندامەكانی لاشە ئەوەش بەوەی كار لە دژیان بكەیت ، بەپێی توانان بێ لەكەمتەر خەمی ،

وە دەبێت ئەمەش بەرامبەر بەسێ شت بكەی

یەكەم : طاغوتەكان

دووەم : دەبێت دژایەتی ئەوە بكەیت كە عیبادەت بۆ غەیری الله تعالى ئەنجام بدرێ ،

سێیەم : دەبێت دژایەتی موشریكان بكەی دژیان بەوستیتەوە پەێی توانا بێ لەكەمتەر خەمی ،

وە بەڵگەش لەسەر داژیەتی كردن كردەوەی پێغەمبەر ابراهیم ە كە پێشەنگی موحیدەكانە ( علیه السلام ) كاتێک بە قەومەكەی خۆی فەرموو ﴿ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ ﴾ [301] واتە : ئیتر دوژمنایەتی و ڕقەبەرایەتی لەنێوانماندا بەرپا بووە،

جا پێویستە لەسەر موحیدان كە بەو شێوە بن بەرامبەر طاغوتان و ئەهەلەكەی ،

وە هەروها خاڵێكی تریش هەیە كەئەویش خاڵی شەشەمە كە بریتیە لەوەی هەر كات توانا و دەسڵاتت هەبێت و توانات هەبێت ئەوە لەناویان بەریت و نەیان هێڵیت لەسەر زەوی ، وەک پێغەمبەر ئیبراهیم ( علیه السلام ) كاتێک كە بۆی ڕێک كەوت بتەكانی شكاند ،وەک الله تعالى باسی دەكات و دەفەرموێت ﴿ وَتَاللَّهِ لَأَكِيدَنَّ أَصنامَكُم بَعدَ أَن تُوَلّوا مُدبِرينَ ﴾[302] واتە : سوێند بە الله

[301] [ الممتحنة: ٤ ]

[302] [ الأنبياء: ٥٧ ]

پیلان دادەنێم بۆ (لەناو بردنی) بتەکانتان دوای ئەوەی پشتان تێکردن (بەجێتان هێشت) ن.›

وە وەک پێغەمبەر موسى (علیه السلام) کاتێک کە سامری مانگاکەی بۆ بەنو ئسرائیل دروست کرد تا بیپەرستن ، جا پێغەمبەر موسی (علیه السلام)بتەکەی سوتاند و تێکی شکان و لەناوی برد ، وەک الله تعالى باسی دەکات و دەفەرموێت ﴿ قالَ فَاذهَب فَإِنَّ لَكَ فِي الحَياةِ أَن تَقولَ لا مِساسَ وَإِنَّ لَكَ مَوعِدًا لَن تُخلَفَهُ وَانظُر إِلى إِلٰهِكَ الَّذي ظَلتَ عَلَيهِ عاكِفًا لَنُحَرِّقَنَّهُ ثُمَّ لَنَنسِفَنَّهُ فِي اليَمِّ نَسفًا ﴾[303] واتە : مووسا وتی دەبرۆ ئەوسا بێگومان تاماوی لەم ژیانەدا (هەر کەس لێت نزیك بویەوە) دەبێ بڵێیت: نزیکم مەکەوەرەوە، دەستم لێ مەدە وە بێگومان بەڵێنێکیشت هەیە (لە ڕۆژی دواییدا) هەرگیز ڕزگار نابێت لێی وە سەیری پەرستراوەکەشت کە بەردەوام دەتپەرست دڵنیابە چاك دەیسوتێنین پاشان بێگومان (خۆڵەمێشەکەش) پرژو بڵاو دەکەینەوە بەدەریادا بە پرژو بڵاوێکی وا (کە دروشمیشی نەمێنێ) ت.›

وەک پێغەمبەر ﷺ کە لە فتح ی مەکە بتەکانی هەموو شکاند و لەناوی بردن وە جیهادی کرد دژی موشریکان و کافران لەوکاتەی کە توانا و هێزی هەبوو و ویستی الله تعالى لەسەر بوو ،

جا لەسەر کەسی موسڵمان کە بەهەمان شێوەبکات لە کاتێک دا کە توانا و هێز و دەسەڵاتی هەیە یان کاتێک کە بۆی ڕێکەوت ،

جا ئەمە بریتیە لە کوفر کردن بە طاغوت و ئەنجامدانی ئەم بەشەی کە الله تعالى فەرموویەتی ﴿ فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ ﴾ پاشان الله تعالى فەرموویەتی ﴿

303 [ طه: ٩٧ ]

﴿وَيُؤْمِن بِاللّهِ﴾ وە ئيمان بە الله تعالى بهێنى ، جا ئێمە لە پێشوو لە باسى پايەكانى ئيمان باسى ئيمان هێنانمان كرد بە الله تعالى ،

جا ئەوەى ئەو دوو مەرجە جێ بەجێ بكات كە بێباوەڕ بونە بەتاغوت و ئيمان هێنە بە الله تعالى ئەوە دەستى گردوە بە پەتێكى زۆر بە هێزو تونڊ وەک الله تعالى فەرمويەتى ﴿فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىَ﴾ جا العروة الوثقى چەندين تەفسيرى بۆ كراوە لەوانە

عن مجاهد (رحمه الله) ﴿في قوله {بالعُرْوَةِ الوُثْقَى} قال الايمان﴾[304]

لە امامى مجاهد ـەوە كە تەفسيرى {بالعُرْوَةِ الوُثْقَى} كردوە بە ئيمان ، واتا : پەتى بە هێز قايم بريتيە لە ئيمان ، ›

جا گەر كەسێک هەر دوو مەرجەكەى جێ بەجێ كرد كە باسمان كرد ئەوا دەستى گرتوە بە ئێمانەوە بۆتە خاوەن ئيمان ،

عن السدى (رحمه‌الله) قال ﴿العروة الوثقى هو الإسلام﴾[305]

لە امامى السدى يەوە كە تەفسيرى {بالعُرْوَةِ الوُثْقَى} كردوە بە ئيسلام.›

عن سعيد بن جبير (رحمه الله) قوله ﴿{فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىَ} قال : لا إله إلا الله ،﴾[306]

لە سعيدى كورى جبير ـەوە كە تەفسيرى {بالعُرْوَةِ الوُثْقَى} كردوە بە لااله الاالله ، وە امامى الضحاك يش هەمان تەفسيرى سعيد ى كوڕى جبير ى كردوە. ›

---

[304] [ جامع البيان في التفسير القرآن لإمام الطبري ]
[305] [ جامع البيان في التفسير القرآن لإمام الطبري ]
[306] [ جامع البيان في التفسير القرآن لإمام الطبري ]

جا ئەوەی كوفر بە تاغوت بكات و ئیمانی تەواو بە الله تعالى بهێنی ئەوە بەدڵنیایەوە دەستی گرتوە بە بەهێزترین پەتەوە كە ئەویش بریتیە لە ئیسلام و ئیمان و لاالە الا الله ، كە هەر گیز پچڕانی نیە و ناپچڕێت ، وەک الله تعالى فەرموویەتی ﴿ لاَ انفِصَامَ لَهَا وَاللّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ [307] واتە : كە پچڕان و بەربوونی بۆ نی یە وە الله بیسەری زانایە.›

وە ئەمەش بریتیە لە مانای لاالە الا الله ، كە ئەو وتەیەی ﴿ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ ﴾ لەبەرامبەر وتەی ( لاالە ) یە ، وە ئەو وتەیەی ﴿ وَيُؤْمِن بِاللّهِ ﴾ لەبەرامبەر وتەی( الا الله ) یە ،

وە ئەسڵ و ڕەگی ئەم دینەی كە پێغەمبەر ﷺ پێی هاتوە بریتیە لە ئیسلام ، وەک فەرموویەتی ﴿ رَأْسُ الأَمْرِ الإِسْلامِ، وَعَمُودُهُ الصَّلاةُ، وَذِرْوَةُ سَنَامِهِ الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللّهِ ﴾ [308]

جا ئەم وشەی (الأمر) لەم فەرموودەیە بریتیە دین دێت وەک پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ﴿ مَن أَحْدَثَ في أَمْرِنَا هذا ما ليسَ فيهِ، فَهو رَدٌّ ﴾ [309] واتە : هەر كەسێک شتێک داهێنێت لەم دینەمان دا كە تێدا نەبێت ئەوە ڕەتدەكرێتەوە.›

جا مەبەست پێی دینە كە دەفەرموێت سەری ئەم دینەی ئێمە ئیسلامە ، كە بەمانای پایەكان و پێداویستیەكانی دێت ،

پاشان دەفەرموێت ﴿ وَعَمُودُهُ الصَّلاةُ ﴾وە دینەگە و ڕاگری ئەم دینە بریتیە لە ئیسلام ، ئەمەش ئەوە دەگەیێنی كە ئیسلام بەنوێژ ڕاگیراوە كە هەر كەس

[307] [البقرة: 256]

[308] [حديث صحيح رواه الترمذي برقم: ٢٦١٦ ]

[309] [رواه البخاري برقم: ٢٦٩٧ ]

نوێژی نەبێت ئەوە ئیسلامی نیە و ئیسلامەکەی ڕوخاوە و نەماوە ، وە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی نوێژ نەکەر کافرە ،

وە پاشان دەفەرموێت ﴿ وَذِرْوَةُ سَنَامِهِ الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللّٰهِ ﴾ وە چڵەپۆپەکەی بریتیە لە جیهاد کردن لە ڕێگای الله تعالى چونکە چڵە پۆپە درەخەت بڵاو دەکاتەوە ، وە جیهاد کردنیش لە ڕێگای الله تعالی ئیسلام بڵاو دەکاتەوە و بە خەڵکی دەناسێنی و دەیگەیێنێتە ناو ئەو کەسانەی کە پێیان نەگەیشتوە ،

**وَصَلَّى اللهُ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعلى آله وَصَحْبِهِ وَسَلَّمَ**

**کۆتایی هات الحمدلله ، داواکارین لە الله تعالى لە پێناو خۆی لێمان قبوڵبکات آمین ،**

**لە دوعای خێربێ بەشمان مەکەن**

**عبدالله تەوحیدی**

الحمدلله

# ڕوونکردنەوەی

# أصول الثلاثة

نوسین :

رحمەالله

پێشەوا محمد ـی کوڕی عبدالوهاب

ڕوونکردنەوە :

عبدالله تەوحیدی